# ناڵەی دڵ



مامۆستا مەلا عبداللّەی کاتب
فەنایی




ئامادەکردنی
عابد بابان

#ناڵەی دڵ

نووسینی

مامۆستا مەلا عبدُاللهی کاتب - فەنایی

ئامادە کردنی

عابد بابان

ناونیشانی کتێب

❁ ناوی کتێب: ناڵـەی دڵ

❁ نووسینی: مامۆستا مەلا عبداللە ی کاتب - فەنایی

❁ ئامادەکردن و پیت چنینی: عابد بابان

❁ چاپخانەی رۆژهەلات - هەولێر

❁ تیراژ: (٢٠٠٠) دانە

❁ چاپی یەکەم: ٢٠١٤

❁ مافی لەچاپدانەوەی: پارێزراوە بۆ بنەماڵەکەی

❁ لەسەر ئەرکی بنەماڵەی نووسەر بەچاپ گەیەندراوە

❁ لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٢١٧)ی ساڵی (٢٠١٤)ی پێدراوە

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

وتەیەکی پێویست:-

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری بێ‌هاوتا و درووود و رەحمەتی بەردەوام بۆ سەر گیانی پیرۆزی حەزرەتی (محمَّد المصطفی)ی نازدار ﷺ هەروەها بۆ سەر گیانی ئال و یارانی بە گشتیی تا رۆژی دوایی.

هەرچەندە لە ئێستادا کە ئەم بەرهەمە ئامادە دەکەین بۆ چاپ، ساڵانێك بەسەر نووسینیدا تێپەڕ دەبێ و ماوەیەکی یەکجار زۆرە کە ئەم بەرهەمە بێناز کەوتووە و نەکەوتۆتە بەر دیدی خوێنەرانی خۆشەویست، بەداخەوە دەبێ روونتر بڵێین ٢٨ ساڵ لەمەوبەر نووسەر دەستی کردووە بە نووسینی و لە ماوەی چەند مانگێکدا کۆتایی پێ‌هێناوە، کە من خۆم لەو کاتەدا ئاگاداری ئەوە بووم کە مەرحوومی باوکم: (مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای کاتب - فەنایی) سەرەڕای بەجێگەیاندنی ئەرکی وەزیفیی خۆی کە بریتی بوو لە (پێشنوێژیی مزگەوت)و هەروەها سەرقاڵبوونی بە لایەنی کۆمەڵایەتیی و پێشوازی کردنی بەردەوامی لە میوان و دۆستان و خۆشەویستانی و هەوڵ و کۆششی رۆژانەی بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکانی و وانە وتنەوە پێیان، رۆژانە چەند ساتێکی تەرخان کردبوو بۆ نووسینی کتێب و ئەو بابەتانەی کە لە فکر و ئەندێشەی خۆیدا گەڵاڵەی کردبوون و بەگوێرەی پێویست یەکە یەکە دەیخستنە سەر کاغەز و ئامادەی دەکردن و دەینووسینەوە، ئەمە جگە لەوەی کە نووسەر یەکێك لە بۆچوونەکانی خۆی لە ژیانیدا ئەوە بوو، کە هەموو کاتێك پشت بە هەوڵ و کۆششی خۆی ببەستێ بۆ بەدەستهێنانی بژێویی ژیانی خۆی وماڵومناڵی، هەر بۆیەش لە ماوەی ژیانی خۆیدا بەردەوام کەسابەتی کردووە و بەوپەڕی سەربەرزییەوە ژیانی بردۆتە سەر، ئەمەش وای کردووە کە قورسایی زیاتر بکەوێتە سەر شانی و ئەرکەکانی تری زیاتر قورس بکات، هەر بۆیە ئەمەش یەکێك بووە لەو هۆکارانەی کە کەمتر

بیپەرژێتە سەر نووسین و بڵاوکردنەوەی کتێب و بەرهەمەکانی و بەو شێوەیە لە چاپ کردن و بڵاوکردنەوە دوا بکەون، کە بێگومان ئەوەی جێگەی داخە ئەوەیە کە زۆرێك لە دۆست و خۆشەویستانی (نووسەر) ساڵانێك چاوەڕوانیی ئەوەیان دەکرد کە ئەم بەرهەمە بە تایبەتیی و تێکڕای بەرهەمەکانی تری بکەونە بەرچاویان و لێیان سوودمەند بن، بەڵام بێگومان لە ماوەی ئەم چەند ساڵەدا زۆرێك لەو کەسانەش وەك نووسەر لە ژیاندا نەماون و کۆچی دواییان کردووە و بەم بەرهەمە ئاشنا نەبوون بەڵام هەرچۆنێك بێ وەك دەڵێن: (زەرەر لە نیوەی بگەڕێتەوە) هەر پێویستە هەوڵی ئەم کارە گرنگ و پیرۆزە بدەین و خوێنەرانی خۆشەویست بەم بەرهەمە و تێکڕای بەرهەمەکانی تری نووسەر ئاشنا بکەین.

دیارە بڵاوکردنەوەی زوربەی زۆری بەرهەمەکانی (نووسەر) کەوتنە دوای وەفاتی خۆی و دردنگ وەخت بەچاپ گەیەندران، ئەمەش وای کردووە کە سەرەڕای پێشەکیی (نووسەر) خۆی بۆ بەرهەمەکانی، پێویست بە چەند دێڕێکی تر بکات بۆئەوەی خوێنەر لە خوێندنەوەی بابەتەکاندا زیاتر بەرچاوڕوونیی هەبێت، ئەگینا ئەگەر لەبەر ئەم هۆکارە نەبوایە ڕەنگ بوو من ڕێگە بە خۆم نەدەم کە تەنانەت دێڕێکیش لەسەر نووسین و بەرهەمەکانی (مەرحوومی باوکم) بنووسم، چونکە من مەلەوانی ئەو دەریایە نیم و ناتوانم سەربەخۆ هیچ جۆرە دوڕ و گەوهەرێك بخەمە بەردەستی خوێنەر.

ئەوەی ڕاستیی بێ وەنەبێ (مەرحوومی باوکم) هەوڵی نەدابێ بۆ چاپ کردنی ئەم بەرهەمە، بە پێچەوانەوە! زۆر مەبەستی بوو کە ئەم بەرهەمەی (ناڵەی دڵ) هەرچی زووە بکەوێتە بەردەستی خوێنەران، بۆ ئەم مەبەستەش لە دوای ئەوەی کە کۆتایی بە نووسینی ئەم بەرهەمەی خۆی هێنا، ناردی بۆ (کۆڕی زانیاریی کورد لە بەغداد) بۆئەوەی کە مۆڵەتی چاپی پێبدەن، بەڵام دوای ماوەیەکی زۆر مانەوەی لەو شوێنە لە ئەنجامدا وەڵامی ئەو دەزگایە ئەوە بوو کە: ئەم کتێبە نابێ بەو شێوەیە چاپ و

بلاو بکرێتەوە، بۆیە مۆری (يُمْنَعُ مِنَ الطَّبْع) قەدەغەکردنی چاپیان لە دیوی ناوەوەی بەرگەکەی دا و نەیانهێشت بەچاپ بگەیەندرێت، هەرچەندە لەگەڵ ناردنەوەی کتێبەکەدا رەخنەگرانی ئەو دەزگایە چەند لاپەڕەیەکیان وەك (تێبینی)و راستکردنەوە بۆ بابەتەکانی نێو کتێبەکە بۆ نووسەر ناردبوو کە گوایە دەبێ راستیان بکاتەوە، بەلام (مەرحوومی باوکم) ئامادە نەبوو ئەو گۆڕانکارییانە لە کتێبەکەیدا بکاتو بەو جۆرەی کە ئەوان مەبەستیان بوو بینێرێتەوە.. ئەوەی لە یادم بێت لەو چەند لاپەڕە نووسینەی ئەو دەزگایەدا ئەوە رووبەڕووی نووسەر کرابۆوە کە (مفهوم)ی ئەم دوو خاڵە بوو:-

١. تۆ لەم کتێبەدا سووکایەتی و بێ ڕێزیت بەرامبەر بە دوو کەسایەتیی گەورە و ناوداری جیهانیی کردووە کە بریتین لە (مارکس و لینین)، بۆیە دەبێ گۆڕانکاریی لەم بابەتەدا بکەیت.
٢. بابەتی هاتنی حۆریی لە بەهەشت شتێکی خورافییە و هیچ ئەسڵێکی نیە بۆیە دەبێ ئەمەش چاك بکەیت.

بەلام ئەوەی کە زۆر روون و ئاشکرا بوو ئەم دوو خاڵە وەك بەهانەیەك وابوون بەدەستیانەوە بۆئەوەی رێگە لە چاپی ئەم کتێبە بگرن، ئەگینا ئەوەی کە بە ئاشکرا هەستی پێ ئەکرا ئەوە بوو کە (نووسەر) لەم کتێبەدا زۆر جەختی لەسەر لایەنی وڵاتو نەتەوە و نیشتمان پەروەری و کوردایەتیی راستەقینە کردۆتەوە و مافی رەوای گەلی کوردی بۆ دۆست و دوژمن روون کردۆتەوە و ویستوویەتی نەوەکانی ئەم نەتەوەیە لەم بوارەدا بەرچاویان روون بێ، لە هەمان کاتیشدا رۆڵەکانی گەلەکەی لە (دوژمنان)ی گەلی کورد و کوردستان ئاگادار کردۆتەوە و پیلانی گڵاو و کارە ناڕەواکانیانی خستۆتە پێش چاوی خوێنەری کوردزوبان.. بۆیە ئەمە بوو بە هۆی ئەوەی کە ئەو ناوەندەی بەغدا رێگە نەدات بە بلاوکردنەوەی ئەم بەرهەمە، چونکە لەگەڵ هەست و باوەڕ و رێڕەوی کاری ئەواندا نەدەگونجا و بە (نووسین)ێکی دژ و دوژمنکارانەیان دەزانی

بەرامبەر بە دەسەڵاتی ئەوکاتی عێراق و نەتەوەی عەرەب، چونکە دوژمنانی کورد و دەسەڵاتی نەتەوە رەگەزپەرستەکانی داگیرکەری هەرچوار پارچەی کوردستان فکر و بیروباوەڕیان وابوو کە کورد بە هیچ شێوەیەك نابێ لەو وڵاتانە جیا بێتەوە و داوای مافی چارەی خۆی بکات، تەنانەت هەر جۆرە نووسین و بەرهەمێکیش کە داکۆکیی لە مافی رەوای گەلی کورد بکات و کورد وەك نەتەوەیەکی سەربەخۆ نیشان بدات و وڵاتی بۆ بە رەوا بزانێت (بە بۆچوونی ئەوان) ئەم کارە دەبێتە هۆی دوژمنایەتی کردنی نەتەوەکانی (عەرەب، فارس، تورك)و بناغە و بنچینەی فەرمانڕەوایەتیی ئەوان لەق دەکات و سنووری دەسەڵاتیان کەم دەکاتەوە.

ئەوەی راستیی بێ ئەمەی کە باسمان کرد خاڵی شاراوە و هۆکاری راستەقینەی (يُمْنَعُ مِنَ الطَّبْع) قەدەغەکردنی ئەم بەرهەمە بوو لە چاپ و بڵاوکردنەوە، ئەگەرنا نووسەر لێرەدا مەبەستی ئەوە نیە بێ رێزیی بەرامبەر بە هیچ کەسایەتییەك بکات بەڵام هاتووە بە ویژدانەوە فیکرە و رێبازی (مارکس)و (لینین)ی روون کردۆتەوە و خستوویەتە بەرچاوی خوێنەری کوردزوبان، بۆئەوەی نەکەونە شوێن هەڵە و بیر و بۆچوونی ناڕەوای ئەوان، کە بێگومان بێدارکردنەوەی خەڵك و جەماوەری هاو زمان سەرەکیترین ئەرکی نووسەر و شاعیرانە لە هەر شوێن و کات و سەردەمێکدا، بۆیە نووسەریش لێرەدا لێکدانەوەی بۆ بیروبۆچوون و کردەوەی ئەو دوو کەسایەتییە کردووە و داویەتە بەر مەودای عەقڵ و ژیریی و پاشانیش لەگەڵ ئاینی ئاسمانیی و شەرعی خوادا بەراوردی پێکردوون کە ئایا کام یەك لەمانە لەگەڵ عەقڵی سەلیمدا دەگونجێ و یەك دەگرێتەوە! ئەو راستییەش دەخاتە روو کە ئاینە ئاسمانییەکان و شەرعی ئیسلام بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ زانستی راستەقینەدا دژ نین و دەگونجێ لە رێگەی زانستەوە پەی بە زۆرێك لەو بیردۆزانە ببرێت کە دەکرێ سوودیان لێ ببینرێت و لە خزمەتی تێکڕای مرۆڤایەتیدا بەکار بهێنرێن، بۆیە لەم بارەیەوە نووسەر روو دەکاتە مرۆڤەکان و

دەڵێت:-

من ناڵێم کە دەس لە سەنعەت کێشن | ئەڵێم بۆ سەنعەت کە زۆر لەپێشن
با لەگەڵ دین بێ ئەم تەطەووره | بۆ بۆ بەشی دین بەرئەدەن ورە!
جا ئەوان ئەگەر ئەهلی تەمیزن | کەی سەنعەت و دین زیدد و نەقیزن
کەی دنیا لەگەڵ دین مونافی‌یە | وا گومان بردن هۆی نەفامی‌یە

پاش چەند دێڕە شیعرێکی تر دەڵێت:-

با تۆ بە یاسای خودا و پێغەمبەر | بڕۆی بۆ کورەی موشتەری و قەمەر
نەك بە ڕێبازی موزدەك و مانیی | یاخۆ مارکس و لینینی بیانیی
جا کە تۆ پەنا هەر بە غەیر ئەبەی | شیعار بە نێوی غەیری کورد ئەدەی
حەیفە تۆ کە خۆت بە کورد ئەزانی | ئەگەر قیمەتی کوردیی بزانی
خۆت بێ نرخ کەی لە شوێن ئەمانە | بەڵێ ئەمانە ناویان ئینسانە

لێرەدا نووسەر روو دەکاتە خوێنەری کورد و دەڵێ: ئەگەر دەتوانی تۆش لە ڕێگەی زانستەوە هەوڵ بدە بگەیتە سەر هەسارەی موشتەری و مانگیش، چونکە دین ڕێگە لە زانست ناگرێت و دەکرێ لە ڕێگەی دینەوە پەی بە چەندین زانست ببرێت، بەڵام بۆ دەبێ تۆی کورد هەر لە ڕێگەی شوێنکەوتنی بێگانەوە هەوڵی بەدەستهێنانی زانست بدەیت و شوێن کەسانی وەك (موزدەك)و (مانیی)و (مارکس)و (لینین)و هاوشێوەکانی ئەوان بکەویت! ئەگەر مەبەستت ئەوەیە سەرفرازیی دنیا و قیامەت بەدەست بێنی بۆچی شوێن ناودار و سەروەر و ڕابەرێکی وەك پێغەمبەری ئیسلام ﷺ ناکەویت کە پێشەنگی مرۆڤایەتییە لە جیهاندا تەنانەت بە شایەتیی دوژمنانی ئیسلام و بێگانەکانیش.

هەروەها لە شوێنێکی تردا نووسەر دێت بەراوردێك لەنێوان یاسای پیرۆزی ئیسلام و

داب و نەریت و یاساکانی تری دنیاییدا دەکات و دەڵێت:-

دەبــا بــێن تــاوێ لەگــەڵ مــەلادا | هەرچــی یاســایە و وا لــە دنیــادا
بیخەنــە نێــو تــای تــەرازووی ژیریــی | لێــی بکۆڵنــەوە بــە ڕۆشــنبیریی
بەبێ ڕێگــەدان بــە ئــارەزووی نــەفس | بــێ لایــەنگیریی لــە بــیروڕای کــەس
بەس بە مەبەستی کەشفی حەقیقــەت | لە بــەینی یاســای خــەڵك و شــەریعەت
چــاوێ بخشــێنن بــەم قورئانــەدا | لەگــەڵ گشــت یاســای ئــەم جیهانــەدا
بــزانن کامیــان بــەگوێرەی قیــاس | چــەوتە و کامــەیان بــە بێگومــان ڕاس

یاخود لە شوێنێکی تردا بــاس لــە مــافی ئــافرەت لــە پــێش ئیســلامدا دەکــات و دەفەرموێت:-

هەرکەس کچی با عاری لــێ ئــەهات | بــۆ کــوڕ مزگێنیــی ئــەدا لــە خــەڵات
خــاوەن دەســەڵات فــەقیری ئــەخوارد | تەنیا خزمەتچی و کەسی خۆی ئەبوارد..
تەنانــەت ژنیــان ئــەدا بــە کــرێ | بــە نامووســی خــۆی پــارە وەرگــرێ
ئــەرکی ژیــان و بەڕێچــوونی مــاڵ | بەشــی ژنــان بــوو لــە ڕێگــەی بــەتاڵ
هــەر ژنــێ ئەگــەر هــەتا ئێــوارە | خــەرجیی ماڵەکــەی بــەو جــۆرە پــارە
پەیــدا نــەکردبا شــەو ئەمایــەوە | تــا دەمەوبــەیان ئەســووڕایەوە..
ئەوســا بــەو شــێوە نــاموس ئــەدۆڕا | ئێســتە بــە یاســا ناوەکــەی گــۆڕا

پاشان باس لە شکۆی ئافرەت دەکات لە دوای هاتنی ئاینی ئیسلام وەك دەڵێت:-

دین کە هات وەك ڕۆژ پرشنگی وەشاند | بەرنامەی حەیا و حورمەتی نواند..
پیاو بە وێنــەی شــێر بــە شیر و تــیری | ژن دەرچوو لە ژێر باری ئەسیریی..
شەرم و شکۆی ئەو لــە ریــزی صــەفدا | وەکــو دوڕ وابــوو لــەنێو صــەدەفدا
پارێــزگاریی لەو ئــەرکی گشــتیی بــوو | ڕێــزی لە یاسای دین سروشتیی بــوو

پاشان له شوێنێکی تردا نووسەر دێتە سەر باسی مافی ڕەوای هەر میللەت و گەل و نەتەوەیەك کە خوا پێی بەخشیوە، ئاماژە بەوە دەکات کە گەلی کوردیش وەك تێکڕای گەلانی تر مافی ژیانی سەربەرزانە و سەربەخۆیی ولاتی خۆی هەیە و هیچ شتێکی لە گەلانی تر کەمتر نیە ئەگەر زیاتریش نەبێ، بەڵام لە هەمان کاتیشدا بە ئاخ و داخ و حەسرەتەوە دێت پەنجە دەخاتە سەر خاڵی دیار و سەرەکیی بەئاوات نەگەیشتنی گەلی کورد و بەدەست نەهێنانی مافە ڕەواکانی، هۆکاری ئەمەش دەگەڕێنێتەوە بۆ خودی گەلی کورد و حیزب و سەرکردەکانی لە هەموو سەردەم و بارودۆخەکاندا، کە لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندیی تایبەتیی و جیاوازیی و یەکتر قبووڵ نەکردن و ڕوو کردنە بێگانە و دوژمنانی کورد خاڵی دیار و سەرەکیی بوون لە بە ماف نەگەیشتنی گەلی کورد، کە بەداخەوە ئێستاش بە چاوی خۆمان ئەم ڕاستییانە زۆر بە ڕوون و ئاشکرا دەبینین، بۆیە نووسەر ئاماژە بەوانە دەکات و دەڵێت:-

| | |
|---|---|
| مــن وائــەزانم زوربــەی ئەمانــە | هۆی چەن موشکیلەی گەورە و گرانە |
| یەکـەم نـاکۆکیی بـەپێی ئیختـیلاف | لــە بــیروڕادا بــێ درۆ و گــەزاف |
| هەرکەس بەگوێرەی هەست و لێـزانین | یـا لـە نـەزانیی و خـۆ بـە زل زانـین |
| ئەکەوێتــە شــوێن خەیاڵاتــەوە | جـوابی کەسـی تـر هـەر ناداتـەوە |
| تاقمــێ ئــەڵێ مــن دیموکراســیم | خــاوەنی بـیر و یاســای ئەساسـیم |
| هەر خۆمم تەنیا ڕۆڵەی هەڵکەوتووم | لە بەزم و ڕەزمی دنیـا سەردەرچـووم |

ئیتر لێرە بەدواوە نووسەر لە درێژەی شیعرەکاندا هەریەك لەو حیزب و دارودەستە و کۆمەڵانە باس ئەکات کە لەنێو کۆمەڵگەی کوردەواریدا هەڵکەوتوون و هەریەکە و بە جۆرێك بانگەشە بۆ خۆی ئەکات و ڕۆڵەکانی گەل بۆ لای خۆی ڕائەکێشێت و لە هەمان کاتیشدا کاری تایبەتییان پێیانە و بۆ بەرژەوەندیی خۆیان بەکاریان ئەهێنن.

هەروەها لە باسی ئەو کۆمەڵ و لایەنانەی کە بە رواڵەت ئیددیعای ئیسلامەتیی ئەکەن و لە هەمان کاتیشدا مەبەست و ئامانجی تری دنیاییان هەیە و ئاین ئەکەنە ئامرازێك بۆ گەیشتن بەو ئامانجە تایبەتییانەی خۆیان، وەك دەڵێت:-

| | |
|---|---|
| یەکێ بەناوی حیزبی ئیسلامیی | بۆم بڵاو ئەکا پەرتووکەی نامیی |
| بە ژەهری بکوژ ئاو ئەدا خەیاڵ | تێك ئەدا زەینی ساویلکە و منداڵ |
| تەنیا بە وشەی ئیسلامە لافی | ئیسلامیش لەگەڵ ئەودا مونافیی.. |
| یەکێ وەهابیی، یەکێ ئیخوانە | ئەڵێ تەنیا من یاسام قورئانە |
| هەر منم بە راس ئەهلی تەوحیدم | بۆ خوداناسین فەردی وەحیدم |
| باقیی موشریکن یا بتپەرستن | لە ئیسلام دوورن، تەواو بێ هەستن |

هەرچەندە نووسەر خۆی یەکێك بووە لە پیاوانی هەڵکەوتووی رێبازی پیرۆزی تەریقەت و تەسەووف، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هاتووە باسی ئەو کەسانەشی کردوو کە بەناوی تەسەووفەوە خەڵکیی فریو ئەدەن و وایان نیشان ئەدەن کە ئەوان بە زۆرێك لە پلەوپایەکانی رێبازی تەریقەت و خواناسیی گەیشتوون و شاد بوون، وەك دەڵێت:-

| | |
|---|---|
| یەکێ بەناوی سۆفیی یا دەروێش | خۆی نیشان ئەدا دەم دێنێتە پێش |
| بە جەزبە و حاڵ و صەیحە و هەیاهوو | وا ئیشعار ئەکا لە عەرشیش سەرچوو |
| لە فەوقی سەما و فەلەك سەرکەوت | واتە لە باڵی جیبریل بەرکەوت |
| مەقامی نەشئەی سەیری سیفاتی | تەی کرد و بە دەم گەیشت بە زاتی |
| دەرچوو لە فەنا چوو بۆ لای بەقا | ئەڵێ نایل بووم بە فەیزی لیقا |
| ئیتر ماسیوای بەلاوە کایە | وەعزی مامۆسای بەلاوە بایە |
| بەڵام خەیاڵە و ناوی ناوە حاڵ | خاوەن حاڵ دوورە لە فیز و فیشاڵ |
| یەکێ تر ئەڵێ بەم شان و پەستە | کلیلی خەزنەی خودام بەدەستە |

ئیتر بەم شێوەیە دێت باس لەو کۆڕ و دەستە و تاقمانە دەکات کە هەر لە هەوڵی بەدەستهێنانی سەروەت و سامان و ماڵی دنیادان و بە جۆرەها شێوە گەل فریو ئەدەن و ئەیانخەڵەتێنن، جا هەندێکیان لە ژێر ناوی خزمەتکردنی گەل و وڵات و نیشتمان و هەندێکی تریش بەناوی ئاین و جۆرەها دروشمی رازاوە و بریقەدار رۆڵەی ئەم گەل و نەتەوەیە بەلای خۆیانا رائەکێشن و بۆ مەرام و بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیان بەکاریان ئەهێنن، ئەمەش راستییێکە کە ئەمڕۆ ئێمە بە چاوی خۆمان ئەیبینین و ئەیبیستین..

بە راستیی کاتێك کە خوێنەر ئەم بەرهەمە دەخوێنێتەوە، وادەزانێ نووسەر بۆ ئەمڕۆی نووسیوە و لەم کات و ساتەدا نووسراوە، چونکە هەر برینی قووڵی سەردەمی کۆنە نوێ دەبێتەوە و هەمان ئەو قەوان و بەیت و بالۆرانە لێدەدەنەوە کە پێشتر هەبوون و میللەت بەدەستیانەوە ناڵاندوویەتی.. بە کورتیی ئەوەی کە نووسەر مەبەستی بووە ئەوە بووە کە میللەتی کورد پابەندبێ بە ئیسلامەتیی و کوردایەتیی راستەقینە.

هەوڵ و کاری منیش لە ئامادەکردنی ئەم بەرهەمەدا ئەوەی پێویست بووبێ بیکەم ئەوە بووە کە نووسینی کتێبەکەم هێناوەتە سەر رێنووسی ئێستا، چونکە ئەمێك جیاوازیی لەگەڵ ئەوسادا هەیە، لەگەڵ کورتە (فەرهەنگۆك)ێك بۆ واتا کردنی چەند وشەیەکی پێویست، بەو ئومێدەی ئەم بەرهەمەش کەلێنێك لە کتێبخانەی ئەدەبی کوردیی پڕ بکاتەوە و خوێنەران لێی سوودمەند بن.. ئیتر با لەوە زیاتر درەنگتان نەخەین و زووتر بە گوڵستانی ئەم بەرهەمە ئاشنا بن و لێی بەهرەمەند بن.

عابد بابان

هەولێر

١٤٣٥/٤/١٢ - کۆچی

٢٠١٤/٢/١٢ - زاینی

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

پێشەکی:-

پاش حەمد و سەنا و ستایشی پەروەردگار و درووودی بێپایان بۆ گیانی پاك و پیرۆزی سەروەری کائینات و رەهبەری بەرز و بێوێنەی ئیسلامی پیرۆز حەزرەتی (محمَّد المصطفَی ﷺ)و هاوڕێ خۆشەویست و بەوەفاکانی (رەزای خوایان لێبێ).

لەبەر ئەوەی ماوەیەکی زۆر بوو بڕێك شتی ناڕەوا و پێچەوانەی یاسای سروشتیی گەلی کوردم لەناو گەلەکەماندا ئەکەوتە بەرچاو، وەیا لە پیاوی باوەڕپێکراوم ئەبیست کە زۆربەی زۆریان نەك هەر خیلافی فەرمان و بەرنامە بەنرخەکەی قورئانی پیرۆز بوون، بەڵکو پێچەوانەی یاسای پڕ لە شانازیی رابردووی گەلەکەشمان بوون، بە راستیی ئەو شتانە زۆر تەئسیریان کردە سەر دڵ و شعوورم، چونکە هەرچی بیرم لێکردۆتەوە زیاتر بۆم دەرکەوتووە کە ئەمانە هەمووی پاشماوە بۆگەنەکانی بێگانە مونافیقەکانی دەوری جەهالەتی کۆنن، کە بێجگە لە بێ ئەخلاقیی و جەهلی دووپات شتێکی تریان رەچاو نەئەکرد، وە بە فێڵ و تەڵەکە ئەو هەموو کردەوە ناحەزانەیان هێنا بۆ ناو وڵاتە ئیسلامییەکان و لەوانیشەوە گەیشتە نیشتمانە خۆشەویستەکەمان، وە گەلی کوردیش لەبەر ئەوەی هەر بە تەبیعەت خۆش باوەڕ و دڵپاکە و رێزگرتنی غەریب و بێگانە شتێکی سروشتییە بۆی، زۆر زوو بۆیان هەڵخەڵەتان و بیریان لەوە نەکردەوە کەسێك دوژمنی هەموو یاسا و بیروباوەڕێکی نەتەوەکەیان بێت چۆن ئەبێ چاوەڕوانی چاکە و شتی چاکی لێ بکرێ! تا لە ئاکامدا نەك هەر یاسای سروشتیی باب و باپیرانیان و هەستی خواپەرستیی و ئەخلاقی بەنرخیان لەنێو گەلان و گەلەکەماندا نەهێشت شارەگەکانی ژیانیشمانیان بڕی و تەنانەت جێگەی دانیشتن و بەرهەمی ژیانیشیان لێ دابەش دابەش کردین و لەبەر تێبینیی دوارۆژی خۆیان تەنیا بەوەش رازیی

نەبوون، دەستیان پێ لە خوێنی یەکتریش نایێ، بۆ ئەوەی کە گەلی کورد نەك هەر لە سەدەی بیستەمدا بەڵکو لە سەدەی سەدەمیشدا نەتوانێ بیر لە چارەسەر کردنی گێروگرفتی ناوخۆی بکاتەوە، وە سەیریش ئەوەیە پێشیان سەلماندوون کە فەرمانڕەوا موسڵمانەکانی خۆتان زاڵم و لە خوا نەترسن، ئەمان مافی ئێوەیان پێشێل کردووە ئەگینا ئێمە لەوپەڕی بەزەیی و دادپەروەریدا حەز ئەکەین ئێوە بە مافی ڕەوای خۆتان بگەن، جا لە هەر کات و هەلێکدا هەستیان بەوە کرد کە نزیکە سوودی خۆیان بکەوێتە مەترسیی لە ژێرەوە دەمیان ئەگەیێنن بە کەمایەتییەکانی ولاتان و بەڵێنیان پێ ئەدەن: ئەگەر ئێوە گوێ لە مشتی ئێمە بن ئێمە دەستی یارمەتیتان بۆ درێژ ئەکەین و هەتا بە مافی ڕەوای خۆتان نەگەن پشتتان بەر نادەین، جا هەروا بە بەڵێن و پەیمانی بێناوەڕۆك هانیان ئەدەن و ئەیانکەن بەگژ یەکدا تا ئەوەندە لاوازیان بکەن کە هەردوو لایان تەنانەت بچووکترین کەرەسەی بەربەرەکانیی و نانی ڕۆژانەشیان دەس نەکەوێ و بە ناچاریی چاوەڕوانی دەستی چەپەڵی ئەوان بن و بە هەموو مەعنای کەلیمە سەریان بۆ شۆڕ بکەن بۆ ئەوەی بتوانن هەرچی مەبەستیانە لە خۆسەپێنیی و بڵاوکردنەوەی بێ ئەخلاقیی لەنێو گەلاندا بیچەسپێنن و خۆشیان لە دوورەوە سەیریان بکەن و پێچکی کورسیی دەسەڵاتداریی خۆیان بپارێزن.

جا لەبەر ئەوە هەستی نیشتمان پەروەریی و گەل خۆشەویستیی پاڵی پێوەنام کە لەم دەرفەتەدا دەس بەرم بۆ قەڵەم و شتێك بنووسم، بۆ ئەوەی -زۆر نا- کەمیش بێ، وەکو لە نەزیرەیەکی عەرەبیدا ئەڵێ: (مَا لاَ يُدْرَكُ كُلُّهُ لاَ يُتْرَكُ جُلُّهُ) بەڵکو ببێ بە هۆی ڕێنوێنیی بۆ بەشێك لە خوشك و برا خاوەن هەستەکانی خۆشەویست و ئاگادار بینەوە و ئاگاداریی و ئامۆژگاریی خوشك و براکانیان بکەن و بە چاوێکی بێ لایەن و حەقیقەت بینییەوە سەیری بکەن بۆ ئەوەی بۆیان ڕوون بێتەوە

که به راستیی شوێنکەوتنی یاسا و قسەی بێگانەکان بێجگە لە سوودی ئەوان و زیان گەیاندنی دین و دنیا بە خۆمان شتێکی تری لێ دەس ناکەوێ، جگە لەوەش بیر بکەنەوە لەوەش کە ئێمە ئێستە لە قەرنی بیستەمدا ئەژین و هۆی جموجۆڵ و ئاڵوگۆڕ هەر زۆر زۆرە، ئێمەش لەقەدەر خۆمان هاتوچۆی ناو بێگانەکان ئەکەین و ئەوانیش بە زۆریی لەناو ئێمەدا بەرچاو ئەکەون، ئەی بۆ بە رێکەوتیش نەمانبینی یەکێك لەوان بێتە سەر یاسا و تەقالیدی ئێمە! وە بۆ ئەبێ ئێمە تەنانەت لە وڵاتەکەی خۆمان بەڵکو لەناو خێزان و ماڵی خۆشماندا بچینە سەر یاسای بێ‌نرخی ئەوان ؟! وە بە تەنیا شوێنکەوتنی یاساوەش نەوەستین، بیروباوەڕە زیان بەخشەکانیشیان لێ وەرگرین و کەشخە و شانازیشی پێوە بکەین، تەنیا بۆ ئەوەی هەڵخەڵەتاوە تاوانبارەکان پێمان بڵێن: فلان کەس تەقەددومیی و پێشکەوتنخواز و موسەققەفە، کە لە راستیدا ئەو جۆرە تەقلید و چاولێکەرییە بێجگە لە بێ‌نرخ کردنی گەل و یاسا سروشتییەکانی شتێکی تری تێدا بەدیی ناکرێ، وە ئەمەش هیچ گومانی تێدا نیە کە بەم جۆرە ئەخلاقە دوژمن زیاتر هەست ئەکا بەوەی کە هەر کۆڕ و کۆمەڵێك ئەو سیفەتانەی تێدابێ زووتر و ئاسانتر تەئسیری تیا ئەکرێ و بە فڕ و فێڵی بە زاهیر جوان و بە حەقیقەت پووچ و ناحەزی ئەوان زووتر هەڵئەخەڵەتێ، سا بەناوی تەماعی فەردیی بێ یا بەناوی قازانجی کۆمەڵایەتیی و بەدیهێنانی چارەنووسی مافی گەلان بێ، وەیا دەستی کەم بۆ سەر گەرم کردن بە هەوا و ئارەزووی نەفسەوە بێت.

وە دووبارە لە دوای هاتنم بۆ سلێمانیی لە ساڵی (١٩٨١ ز)دا لەبەر جەنگی نێوان (ئێران)و (عێراق)و تۆپبارانی لادێکان و وێران کردنیان، ئەو شتانەی کە لە دوورەوە ئەمبیست، لە شارەکاندا لە نزیکەوە ئەکەوتنە بەرچاو و جارجاریش لەگەڵ برێك لە مامۆستا و موسەققەفەکان تووشی دەمەتەقە و وتووێژ ئەبووم و

هەروەها نووسراو و نامیلکەشیان لە مەکتەبەکان ئەکەوتە بەرچاو، کە لە راستیدا لەگەڵ یاسا و بیروباوەڕی گەلی کورددا یەکیان نەئەگرت، وە بە راستەوخۆ لێیان دەرئەکەوت کە ئەیانەوێ منالە ساویلکە و بێگەردەکانی گەلەکەمان بە یاسا و بیروباوەڕی دوژمن و بێگانە پەروەردە بکەن و پێیان بسەلمێنن کە گەلی کورد یاسایەکی وای نیە کە ئادەمیزاد پێی سەرکەوتوو بێت، بەتایبەتیی یاسای پیرۆزی ئاینی ئیسلامی بەنرخ سوودێکی وای نیە کە بتوانێ ئادەمیزاد بەرەو لوتکەی ئاوات و سنووری چارەنووس و سەربەخۆیی بخاتە رێ و ئەرکی کۆمەڵایەتیی بە هەموو لایەنەکانیەوە بگرێتە ئەستۆ، کە لە راستیدا ئەمەش یەکێکە لە هەڵە هەرە گەورەکانی سەقافەی تازە و پێشکەوتنخوازەکانی بەناو رۆشنبیری زەمانی هاوکات، چونکە ئاینی پیرۆزی ئیسلام بە هەموو ئینسانێکی راستیی خوازی سەلماندووە کە ئەگەر بە راستیی بیبەن بەڕێوە هیچ کەند و کۆسپ و تەنگ و چەڵەمەیەك لە ژیانی ئادەمیزادا نایەڵێت و بەوپەڕی دادپەروەرییەوە ئەرکی هەموو کۆڕ و کۆمەڵێك دابین ئەکات و هیچ نەوعە نوقسانییەکی لە هیچ لایەکەوە تێدا نیە، مەگەر بۆ ئەوانەی کە هەموو هەست و دڵخوازێکیان لە ژیاندا هەر رابواردن و بێ ئەخلاقیی و جەور و ستەم و زیان گەیاندن بێ بە خەڵك! بەڵێ بە نیسبەت فیکرەی پڕوپووچی ئەوان نەك هەر تەواو نیە زیان گەیێنیشە، وە بێگومان ئەمەش ئەوەمان بۆ دەرئەخا کە لە راستیدا ئەمانە ئینسانییەتیان ناوێ و ئەیانەوێ هەموو کەس وەکو خۆیان لە رێبازی راستەقینەی ئینسانیی لابدەن و بەرەو حەیوانیی و بولهەوەسیی رایانکێشن، ئەگینا نە یاسای هەزار و چوارسەد ساڵەی گەلەکەمان و نە یاسای بەرزی ئیسلام ئێمەیان نەخستۆتە دواوە، بەڵێ بە واتەی کوردیی ئەبێ پێیان بڵێین: (کەر لە کوێ کەوتووە و کوندە لەکوێ دڕاوە!) وەیا هەر هیچ لە دین و یاسای ئیسلام تێ نەگەیشتوون، بۆیە یا دژی ئەوەستن وەیا لانی کەم دوورەپەرێزیی

لـێ ئەکەن، لەم حاڵەشدا (ضَرْبُ المثَـل)ی عەرەبیی شمولی حاڵیان ئەکات کە ئەڵێن: (اَلْمَرْءُ عَدُوٌّ لِمَا جَهِلَ)، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا داوا لە خوێندەوارە بەرێزەکان ئەکـەم کە وا گومان نەبەن ئێمە جیاوازیی نەخەین لەنێوان چاك و خراپدا، بەڵکو بە سـەیر کردن و چاوپیاخشاندنی هـەمووی کتێبەکـە بۆتـان روون ئەبێتـەوە کـە مەبەسـت لە تاوانبار و بەهەڵەداچوو کێیە! جا لەبەر ئەوە ئەگەر لە بـەعزە شـوێنێکی ئـەم کتێبەدا برێ شوێنتان کەوتە بەرچاو و بە ئەووەڵ جار واتان گومان بـرد کـە قەڵـەم لە سنووری ئەدەب دەرچووە، داوای لێبوردنتان لـێ ئەکەم، ئیتر تەوفیق و بـەئاوات گەیشتنی هەموو لایەك لەسەر رێبازی چاك لە خوای بێ‌هاوتا داواکارم.

عبدالله مصطفی صالح (فەنایی)

ئیمامی دووەمی مزگەوتی (شێخ بابە عەلی)

لە سلێمانی

١٩٨٥/١١/١٠

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

## لێرەدا بە پێویستی ئەزانم مانای حوزووری خوا کەمێ روون کەمەوە

ئەپاش سەنای زات کیبریای مەننان      هەم حەمدی لایق بە زاتی یەزدان
هەڵسووڕێنەری چەرخی زەمانە      ئەزەل تا ئەبەد بۆ ئەو عەیانە
هەموو کردەوەی بێ چەند و چوونە      مەیلی بێ، ئەبێ، بوونیش نەبوونە
هەر کات بۆ شتێ مەیلی بوونی کرد      فەورەن دێتەجێ بەبێ دەستوبرد
سیفاتی وەك زات عەینی نموونە      عالەم بەرهەمی (كُنْ فَيَكُون)ە
پەروەردگارە و توانا و قادر      ئاگادار لە گشت، لەگەڵ گشت حازر[1]
بەڵام کام حوزوور! حوزووری زانین      هەروەك لەلات بێ ئاوای بزانین
نەك حوزوور بە زات چونکە بەم وێنە      ناگونجێ لەگەڵ خودای بێ وێنە
کونهی زاتی ئەو ناکرێ باسی      بە راسیی ئەگەر هەڵۆەدای راسی
زاتی ئەو بێ شك (وَرَى الْوَرَى)یە      دەسی کەس ناگا بەو کیبریایە
ئەوەی کە ئەڵێن حوزوور بۆ خاسان      بەڵێ دەس ئەدا، نەك وا بە ئاسان
ئەویش وا لەژێر سایەی سیفاتا      نەك لەگەڵ کونهی حەزرەتی زاتا
بڕێ شتی تر لە شتی نیهانیی      جەنابی ئەسما و جەماڵی جوانی
هۆی ئەو شتانەن، نابێ بێ ئەمان      بوونی ئەوانە لە عالەم عەیان
ئەویش هەر مانای تەجەللای زاتە      چونکە خۆی ئەسڵی ئەسما و سیفاتە
بەڵام سیفاتیش وەك حەزرەتی زات      دوورن لە شێوەی باقیی مەوجوودات
جا ئەو کەسانەی وان لە ئەحوالا      غەرق ئەبن لەناو بەحری خەیالا
حوزووری رووحیی بەبێ (كَيْف)و (كَمْ)      دەس ئەدا بۆیان بە زۆریی یا کەم
هەرکەس هەرچیی دی لە حاڵی حوزوور      سەرسامە لەنێو تەجەللا و سروور
نوور لە صاحێب نوور جیا ناکاتەوە      هەستی بێ هەستی دەور ئەکاتەوە
دەرکی بێ دەرکی لەوێ ئیدراکە      ئاوایە فەنای تەواویی، کاکە

فەنا لە بەقا دەنگ ئەداتەوە  ڕێگای ماسیوای حەق ناکاتەوە
جا وا ئەزانێ حوزووری زاتە  مەقامی لەژوور ئەسما و سیفاتە
ئەو ماوا سارای لای (لاَ مَکَان)ە  بۆ سالیك جێگای پێ خلیسکانە
چونکە ئەم خاوەن بەخت و مەقامە  نازانێ خۆی و ماسیوا کامە
لێرە دەس ئەدا ڕوتبەی (أنَـا الْحَقْ)  لەبەر شەعشەعەی تەجەللای موتلەق
پاپۆڕی شکاو غەرقە لەو ئاوە[٢]  ماسیی لە دەریا چی لە بەڕ داوە!
نەمانی تەواو دێتە بەرچاوی  نامێنێ ناوێ لە خۆی و ناوی
خۆی لێ ون ئەبێ لەگەڵ (مَا سِوَى)  شتێك ئەبینێ بێ چوون و چەرا
بە ناچار ئەڵێ منم ئەم نوورە  خۆ بێ شك زاتیش لەو ساحە دوورە
تا ئەو لە حاڵی ئەو فەنادا بێ  خەڵکی لە خالیق بۆ جیا نابێ
بەم مەعنا نەفی ماسیوا ئەکا  چی تر نابینێ، دەی چۆن وا نەکا
چونکە هەر شتێك ئەبینێ نەك دوو  واتە لەم جێدا خۆشی لێ ون بوو
بۆیە مەغروورە ئەو خاوەن حاڵە  فکری حاڵ نەزان لێرە بەتاڵە
حاڵی فیرعەون و ئەم لەیەك جیایە  فیرعەون خۆی ئەدی، (مَرْئِي) ئەم خوایە
فیرعەون لەبەر خۆی خودای لێ ون بوو  ئەم لەبەر خودا خۆشی لەبیر چوو
چونکە بە بادەی ساقیی مەدهۆشە  هەرچەن مەستیشە بەزمێکی خۆشە
بەڵام کام بادە! بادەی محەببەت  ئەنجا کام ساقیی! حەزرەتی وەحدەت
سا ئەگەر دەرچوو لەو بەند و باوە  پاڵی دا بەلای مولکی بەقاوە
ئەگەر موڕادە هەر بە ئیرادە  بێ نیاز ئەبێ ئەو لە ئەو بادە
بۆ (بَقَـاءْ بِاللّٰه) ئەگوێزێتەوە  قیزی لەو فەنا ئەشێوێتەوە
بە ڕۆژێ گەیشت یاخۆ بە تاوێ  خۆی و بەختی خۆی، قسەی پێ ناوێ
ئەم جۆرە چوونە فەزڵی خودایە  میسالی وێنەی کارەبا و کایە

ئەگەر ساڵیك بێ لە ڕێی تەریقەت  پیری مەیخانەی بادەی حەقیقەت
ئەگا بە دادی لەو جێگەی خەتەر  نەجاتی ئەدا و ئەیهێنێتە دەر
ئەنجا ئەزانێ چ دەنگوباسە  کامە ئیشتیباه، کامەیان ڕاسە
جا ئەگەر لەوێش ڕۆیشت بەرەوژوور  چوو بۆ شوێنێ تر لە سارای حوزوور
لەوێش ماوەیەك گەڕا و خولاوە  بەختی یاری بوو لەوێش بەولاوە
کەوتە نێو دەریای سەیری ئەسماوە  حیسابی ئەویش لەوێ بڕاوە
هەنگاوی هەڵگرت بۆ سەیری سیفات  لەوێش تێپەڕی بۆ حوزووری زات
یا بۆ شئوون و ئوسووڵی ئوسووڵ  لێرەدا داوای ڕەوایە و قبووڵ
ئەمجارە نۆبەی تەجەللای زاتە  موراقیب لەوێ غەرقی خەڵاتە
بەڵام کام خەڵات! قوربی بێ وێنە  وێنە چی ئەکا لەلای بێ وێنە
جا کە لێرەدا بڕاوە ڕوتبە  نەفسی دامەزرا بەو حاڵی قوربە
بێجگە لە ڕوتبەی ڕەزا و عەبدییەت  یا دەرکی کاڵای باڵای فەردییەت
چی ئەوێ ئاخۆ ئەو خاوەن جاهە  کە وا لە سایەی (لِي مَعَ الله)ە
غەیری (تَقَرُّبْ) ڕوتبە مەمنووعە  دائیرەی (وَلِي) بیستە مەقطوعە
ئەم شوێنە شوێنی ئاخرین خاڵە  بۆ (وَلِي) ڕۆیین لەولا مەحاڵە
مەگەر بە ڕێکەوت لەکاتی ئەحواڵ  بە سورعەت بڕوا وەك سەیری خەیاڵ
ئەویش لە سایەی ویلایەی (نَبِيْ)  کە ئەسڵە لەبۆ ویلایەی (وَلِي)
لێرە بەرەوژوور بۆ ئەنبیایە  قوربی ئەوانیش لەم قوربە جیایە
بێجگە خۆیان و خوداکەی خۆیان  شەرحی نادرێ، کول مەبە بۆیان
ئەمان موقتەدای گرۆی بەشەریین  لە هەموو شێوەی بەشەریی بەریین
واتە لە سەیر و سورعەتی ڕێدا  ڕێگەی کەسێ تر نابێ لەوێدا
ئەگەرنا ڕەشیی هەرگیز لە حەبەش  ناسڕێتەوە، خولقاوە بە ڕەش

کەس بە تۆزی پێی ئەو بزورگانە    نەگەیوە و ناگا بێ شك بزانە

چونکە ئەمانە مەدعووی خودانە    خەڵکی تر هەمووی مەدعووی ئەمانە

جا ئەم مەقامە تا ئەو مەقامە    فەرقی نیسبەتیان تێفکرە کامە

بەشێکی خاصە بەوان دراوە    لێرەدا گشت کەس برواتە دواوە

بەڵام واش ئەبێ لە سایەی ئەمان    کەسێ کەوتە سەر رێبازی ئەمان

لای ئەدا بەقەد تاڵێ مووی سەری    ئەستێرەی بەختی دەری خست سەری

دائیرەی صوغرا و کوبرای بەجێ هێشت    لە ئەعلا و عولیاش تامێکی لێ چێشت

هەتا کەم کەمە ئەگا بەو دەمە    کە یەك دەم لەوێ شیفای سەد خەمە

کە هات و لەوێش بە دەستی قەزا    گەیشت بە روتبە و مەقامی رەزا

خەڵاتی رەزای ئەکەن بەبەردا    تاجی (مَرْضِیَّه)ی ئەنێن بەسەردا

لەپاش گەیشتن بەو شوێنە پاکە    ئەگەڕێتەوە بۆ لای ئەم خاکە

ویسعەت و پاکیی دڵ و دەروونی    بێ فەرقە لەلای بوون و نەبوونی

بوونی بۆ عالەم سوود و رەحمەتە    ئەو ئاوەخۆرەی دەریای رەحمەتە

صوحبەتی مایەی رەزای خودایە    گۆشە چاوێکی بۆ دڵ دەوایە

مامۆسای دەرسی قوربی یەزدانە    کاڵای حەقیقەت لەلای ئەوانە

خاوەن شکۆیە ئەو کەسەی وابێ    با بە دەم لەگەڵ من و تۆدا بێ

قەت غافڵ نابێ هەروا لەجێوە    وەزیفەی دەعوەت ئەبا بەڕێوە

خاوەنی مولکی بەقای لیقایە    بەڵام کام بەقا (بَقَاءْ بِالله)یە

سەرێکە و هەزار سەودایە، کاکە    ئاوایە حاڵی ئەو پیاوە چاکە

ئا لەمەوژووریش هەزار هەزارە    ئەو کەس تێ ئەگا خۆی وا لەو شارە

ئەویش بە ویست و لوتفی خودایە    ئەمنا چۆن بەشەر ئەگا بەو پایە

بەرام ئەمانەن (أَوْلِیَآءُ اللهْ)    (هَنِیئاً لَهُمْ، هَدَاهُمُ اللهْ)

ەم رێبازەیە مانای تەریقەت　　ئا بەمە ئەڵێن لوببی شەریعەت
ەریعەت یانی کردەوە و زانین　　تەریقەت مانای رۆیین و روانین
ەری (عَـيْنُ الْيَـقِينْ) (حَـقُّ الْيَـقِين)ە　　لێرەدا ئەڵێن بڕۆ و ببینە
هەرکەس نەچێژێ مەزەی ئەو بادە　　تێ ناگا بە تۆ بەس بە قسەی سادە
خۆتی لێ لادە یا بەجێی بێڵە　　چونکە لە بەزمی ئەو بادە وێڵە
زانا و نەزانا لێرە نەزانە　　تا خۆی نەچێژێ بادەی ئەمانە
بەریەرەکانیی لەگەڵ ناحاڵیی　　بەزایەدانی عیلمە و کەمالی
ئەگەر ئەو مەزە زەوقی دا بە دڵ　　ئەو لە تۆ باشتر دڵی دێتە کوڵ
ئەوسا ئەزانێ کە ئەو نەزانە　　دەوای زامی دڵ بەدەس ئەمانە
نەزانیش کاتێ تەواو خراپە　　ئا لەو چاکانە بگرێ خراپە
نەقس و نەزانیی خۆشی بە زانین　　دابنێ کاکەم نەك بە نەزانین
خۆی لە زەلکاوی نەزانییدا بێ　　تانەی لە زانای رەببانیی دابێ
سا پەنا بە خوا لەو نەزانییە　　غەرقی غرووورە و لاشی وا نیە
هەرچەند ئەولیای خالیقی وەدوود　　وێنەی درەختی بەرن پڕ لە سوود
سەد کەرەت نەزان بەردی تێ بگرێ　　ئەو بۆ ئەو خەڵکە سەمەر هەر ئەگرێ
هەرکەس بە ئیخلاص دەسی لەبۆ برد　　زەنبیل فرۆشە و زەنبیلەی پڕ کرد
بەلام بۆ نەزان بە ئینکارەوە　　دەس ئەخاتە نێو کونی مارەوە
ئەولیا جێگەی غیبطەی ئەنبیان　　وەك لە (بَيْضَـاوِي)[3] وا ئەکا بەیان
حەیفە ئەو کەسەی خاوەن شعوورە　　لە دەرکی فەیزی ئەمانە دوورە
نەتبیستووە سەگی یارە غارەکان　　شوێنی ئەوان کەوت گەیشت بە ئینسان
بەم مانا لەگەڵ ئەوان کەوتە گەشت　　بۆیە لەو دنیا ئەچێ بۆ بەهەشت
هۆشت بێ نەکەی لە بێ خەبەریی　　لە قسە تێ نەگەی، وا گومان بەری

که من مەبەستم لە غیبطەی ئەوان   بەرزیی مەقامی ئەمان بێ لەوان
ئەوان بە نیسبەت میر و وەزیرن   ئەمان خزمەتچییی ماڵ و گزیرن
فەرقی دەستوپێ و وەزیر بزانە   ئەزانی مانای فەرقی ئەمانە
خزمەتچیی هەرچەند دایم بەردەستە   بەڵام مەقامی هەر نزم و پەستە
لەگەڵ ئەمەشدا دووری مەزانە   ئاواتەخواز بێ وەزیر بەمانە
ئەنا مەقامی وەلیی تا نەبیی   مەسافەی بەینی سەمایە و زەویی
نەبیی مەتبووعە و وەلیی تابیعە   لە سایەی ئەودا بەرقی لامیعە
بەڵام فەرموودەی زانایان وایە   حاڵی پێغەمبەر لەمانیش جیایە
عرووجی جیسمییش دەسی دا بۆ ئەو   قیاسی عالەم ناکرێ لە ئەو
ئەو بە مەرکەبی تیژباڵی بوراق   سەرکەوت لە لوتکەی سنووری ئافاق
تا ئەو جێ جێ بوو جیبریلیش بەرکەوت   ئەنجا لەوەوژوور ئەویش پەکی کەوت
ماوە بەینی ئەو لەگەڵ خودادا   ئەما وەسیلە لەوێ بەدوادا
واتە لەوەوژوور هەرچی روویداوە   مەربووتە تەنیا بە لوتفی خواوە
چی بوو چی کرا، چۆن بوو ئەو حاڵە   بۆ غەیری داعیی و مەدعوو مەحاڵە
چونکە ئەو حاڵە گەنجی ئەسرارە   دەعوەتی ئیسرای سەیری ئەنوارە
بوراق لە پێ کەوت، ئەما مەجالی   بەسرا لێی سارای سەیری جەمالی
وەك پەیکی ئەمین بەو شاباڵەوە   خۆی دایە پاڵی پارە و لاڵەوە
فەرمووی تا ئێرە رێم پێدراوە   رێ لە غەیری خۆت خەڵوەت کراوە
لێرە بەولاوە هەر خۆت مەئزوونی   بۆ ماوای سارای بێچەند و چوونی
ئەو بەر لە میعراج عونصوری پاکی   ناریی و هەوایی هەم مائیی و خاکیی
دەرچوو لە پەردەی تاریکی حیجاب   طەی کرد دائیرەی عالەمی ئەسباب
هەر زوو کرابوو صەفای جیسم و رووح   تا دەس دا ئەو شەو خەڵوەتگای فتووح

ئەندامی پاکی لەسەر ئەم ئەرزە
چوار کەرەت شۆرا بەو شێوە و تەرزە

بە دەستی جیبریل بە ئاوی زەمزەم
تا بۆ ئەو شەوە ببێ بە مەحرەم

جیسمی شەریفی لەبەر پیرۆزیی
هەرچوار ماددەکەی نەیمابوو تۆزی

تەزکیەی ماددە و وەسفی عەناصیر
لەودا ئەبینرا بە چاوی زاهیر

بووبوو بە کۆی نوور ئەو بڵند پایە
هەر لە دنیادا نەیمابوو سایە

کاکە هۆشت بێ نەفست چاغ نەبێ
ئەم جۆرە باسەت لا قاچاغ نەبێ

قیاسی نەکەی لە حاڵەکەی خۆت
لە بەژن و باڵا و گیپاڵەکەی خۆت

نەڵێی ئەی بۆ من هیچم نەدیوە
خۆت رێی بینینت لە خۆت بڕیوە

وەك حافز ئەڵێ خۆت لە خۆت دەرچۆ[٤]
تۆتۆت نەمێنێ تا ببی بە تۆ

واتە پەردەی (من) لە خۆت دارنە
ئەوسا تێ ئەگەی لەم قسەی منە

وا خەیاڵ نەکەی چی تۆ نەیزانی
یا هەر ئیشێکی کە تۆ نەیتوانی

نابێ کەسی تر بیکا و بیزانێ
ئەگەر سەری خۆی لە رێیدا دانێ

ئایە نابینی حاڵی قەل و قاز
قیاسی چۆنە لەگەڵ هەڵۆ و باز

ئەوان هەمیشە وان لە زەویی دان
ئەمان لە فەزا و هەوای جەویی دان

هەردوو خاوەنی دوو باڵ و دوو پێن
ئەی بۆچی ئەوان لە دێ نیشتەجێن

یاخۆ رێڕەوی فیل و کەرگەدەن
بازی کەروێشك و ئاسك لە چەمەن

کەچیی هەردوویان لە دەست و پێدا
بە چوار پەل ئەڕۆن لە رەوتی رێدا

بەڵام تێفکرە سروشت و خوویان
لە شێوە و پاکیی یا رەنگ و روویان

ئەم قیاسانە پووچ و بێ تینن
لەخۆدەرچوون و خۆنەناسینن

ئەمانەت هیچی لا سەیر نەبێ
نازانی! هەرچی کەوتە بەحری خوێ

رێك ئەبێ بە خوێ بێ شك و گومان
بەڵام میقداری بە توولی زەمان

وەك لە ئێرانا دەریاکەی ورمێ[٥]
ئاسنیش بە توول ئەگیرێ بە خوێ

زیاتر لە چەند جار ئا بەم دوو چاوە — لەوێدا دیومە چەن شت گۆڕاوە
وەهای ئەگۆڕێ تەواو و کەماڵ — کەلاکی مردووش ئەکا بە حەلاڵ
سەیریش ئەوەیە کەس نوقم ناکا — سەد جار مەلەوان خۆی بە بن دا کا
جا ئەگەر حاڵی ئاو و خوێ وابێ — ئەی ئەگەر بەحری رەحمەتی خوا بێ
نابێ تەئسیری فەیزی رەببانیی — ئا لەو دەریایە کەمتر بزانی
بەڵکە هەر قیاس ناکرێن لەیەك — نە بە زۆر و کەم نە بە هەزار یەك
چونکە پێویستە ئەم بە وەخت و کات — پێویستیی بۆ ئەو هەیهاتە هەیهات
جا بۆیە ئەڵێین ئەو پلە و پایە — نادرێ بە کەس هەتا هەتایە
ئەم تەشریفاتە ئیختیصاصییە — نەك بە کەسب و حاڵ ئەوەی راسییە
سەیری حوزووری زاتی خودایە — بەزمی مەقامی (لِی مَعَ اللە)یە
بڕوانە مووسا و قورپی سوبحانیی — ساحەی لێ تەنگ بوو بە (لَنْ تَرَانِي)
گەر کەسێ بڵێ من رۆژم دیوە — راس ئەکا، بەڵام رۆژی نەدیوە
ئەوەی ئەبینرێ نوورەکەی رۆژە — هەر ئەو نوورەشە حیجابی رۆژە
کەوابوو بە (لَنْ) نەچی بە هەڵە — دیتم و نەمدی بیکە مەتەڵە
بەڵام بینینی ئەو نوورە جوانە — لێرە یا لەوێ فەرقی بزانە
تێفکرە ماوای ئەم و کێوی طوور — (بُورِكْتُمْ لَنَا نُورٌ عَلَى نُورْ)
باسی هەر خاڵێ لەو تاکە خاڵە — مەزهەری جەلای حوسنی جەماڵە
پێویستی بە سەد دەفتەرە و قەڵەم — با لەوە زیاتر دەمی لێ نەدەم
سەیری خەیاڵی خاوەن خەیاڵان — لێرەدا گشتی رۆیی بە تالان
بۆ غەیری حەزرەت بۆ عیجزی حوزوور — کافییە حاڵی مووسا و کێوی طوور
هەوری بەهاری خەزێنەی رەحمەت — فەزا جەلا دا، لابەرێ زوڵمەت
بە خوڕ بڕژێنێ رەژنەی بارانی — بۆ رووحی پاکی لەگەڵ یارانی

بۆ ئەهلی بەیت و ئەصحابی کیرام — تا قافی قیامەت لەگەڵ سەد سەلام
قەڵەم بە رێکەوت رێی کەوتە ئێرە — ئەنا من زەینم لێرەدا کوێرە
بەڵام کە زانی باسی خودایە — نێوی ئەو زاتەش هاتۆتە کایە
وەسڵی دڵدارە و جەژنی لیقایە — زەمزەمەی بەزمی شەوی ئیسرایە
وەك سەیری خەیاڵ شێت بوو هەڵوەدا — بۆیە دەستی کرد بە چەقرە سەما
لەم قۆناغەدا بڕێ هات و چوو — تا سەری شکا مات و بێدەنگ بوو
خەیاڵیش سەرسام ماوە، بێهۆشە — باسی دۆسی دۆست ئۆخەی چەن خۆشە
خۆ هەرچەن دوورم من لەو خۆشییە — قەیناکا ئەمەش نیوەی خۆشییە
قەڵەم وەك بولبول با نەشگا بە کام — حەز لە باسی گوڵ هەر ئەکا، بەڵام
هەرچەن تازە من لەگەڵ خۆشیی دڵ — دووریین لەیەکتر لێرە تا تۆی گڵ
تا سەرای مەحشەر لە شەرمەساریم — لەتاوی ئێشی دەردەکەی کاریم
کۆکۆی شەرارەی مەینەت بارمە — دڕکی مەم و زین لە جێی یارمە
خەفەتخانەکەی دڵەی ناکامم — دووریی مەیلەکەی لەیلە هۆی زامم
من بۆ ئەم دڵەی کۆسکەوتەکەی خۆم — بڕیارم داوە هەر مەینەت ئەخۆم
مەگەر یەکێ بێ لە خاسەی راسان — غیرەت خاتە کار لە رێگەی ئاسان
بە کوێرە کوێرە ئەو بگرێ دەستم — تا بگەم بە کۆی کۆگای مەبەستم
خوا خۆی ئەزانێ مەبەستم کامە — تەنیا قبووڵی ئەوم مەرامە
ئەگەر مەیلی بێ کەرەم فەرما بێ — کێ هەیە بڵێ نابێ ئاوا بێ
خۆ ئەگەر مەیلی سزاش کا بە قەهر — با فریشتەش بێ لێی ئەکا بە زەهر
بیستووتە حاڵی هارووت و مارووت — گیرۆدەی چی بوون هەردوویان بە جووت
کەمتر لە نەفەس هاتوچوونێکە — بەس بە ئیرادە و (کاف و نوون)ێکە
وا ئەبێ ئاگر ئەکا بە بەهەشت — هەروەك دەری کرد ئادەم لە بەهەشت

گاه سوله‌یمانێ ئه‌کا به صه‌ییاد / ته‌ختی ملهوڕان ئه‌داته به‌ر باد
جارێ دوور ئه‌خا یووسف له یه‌عقووب / کرمه‌ڕێز ئه‌کا ئه‌ندامی ئه‌ییوب
چاوه‌که‌ی یه‌عقووب نابینا ئه‌کا / یووسف ته‌سیری زوله‌یخا ئه‌کا
عاله‌م قڕ ئه‌کا به تۆفانی نووح / خه‌تا ئه‌به‌خشێ به تۆبه‌ی نه‌صووح
حۆریی له‌بۆ شیث دێنێ له به‌هه‌شت / ئیدریس له دنیا ئه‌با بۆ به‌هه‌شت
چونکه ئه‌م زاته خۆی حۆریی زاده(٦) / هه‌ردوو حاڵه‌که‌ی خه‌ڕقه بۆ عاده
یا یه‌دی به‌یزا ئه‌دا به مووسا / ئه‌شبا بۆ سه‌ما به به‌ده‌ن عیسا
نیل ئه‌کا به ڕێ بۆ مووسای عیمران / غه‌ڕق ئه‌کا فیرعه‌ون بۆ په‌ندی ده‌وران
قاڕوون به ئه‌رزا ئه‌باته خوارێ / عه‌صا بۆ که‌لیم ئه‌کا به مارێ
وا ئه‌بێ چاکێك زۆر خراپ ئه‌کا / یاخۆ خراپێك به پیاوچاك ئه‌کا
گاهێ زانایێ ئه‌کا به نه‌زان / جارێ ئه‌زانێ ئه‌کا به لوقمان
جارێ بێ به‌ختێ به‌خته‌وه‌ر ئه‌کا / گاه شاهه‌نشاهێ ده‌ربه‌ده‌ر ئه‌کا(٧)
گاه به گه‌دایێ ئه‌به‌خشێ شاهیی / ئینسان مات ئه‌کا تیپ و سوپاهی
گاه فه‌قیر ئه‌کا به سه‌رمایه‌دار / به پیاوێ ماقووڵ له دێهات و شار
گاه ده‌وڵه‌مه‌ندی خاوه‌ن سفره و خوان / وا فه‌قیر ئه‌کا موحتاج به دوو نان
وا هه‌یه له پیاو دروست ئه‌کا ژن / وا ئه‌بێ بێ‌باب کوڕ ئه‌دا به ژن
گاه له هه‌ردووکیش زاووزێ نیه / که‌وابوو ئه‌مه‌ش ئه‌مری عادی‌یه
وا ئه‌بێ له به‌رد حوشتر دێته ده‌ر / وه‌ك تاقه ناقه‌ی ساڵح پێغه‌مبه‌ر
یه‌ك به خه‌یاڵی چوونه بۆ زوحه‌ل / یه‌کێ داماوه بۆ که‌رێکی شه‌ل
یه‌کێ له ده‌ریا دوڕ دێنێته ده‌ر / یه‌کێ سووڕ ئه‌خوا به‌شوێن ڕێویی له‌ڕ
یه‌کێ پێخواسه له ده‌شت و له ده‌ر / یه‌کێ سه‌رئه‌خا بۆ کوره‌ی قه‌مه‌ر
یوونس ئه‌خاته قورگی حووته‌وه / بیخه تای عه‌قڵی ته‌رازووته‌وه

هــەروا تێفکــرە لــەو خــوار و ژوورە     لــە عــەقڵی ئێمــە تــا چــەندە دوورە
لەگــەڵ ئەمەشــدا بــێ شــك بزانــە     بەبێ حیکمــەت نــین هــیچ کــام لەوانــە
جــا ئەگــەر زانیــت شــوکری خوداکــە     ئەگەر نــەتزانــی بێــدەنگ بــە، کاکــە

**بە موناسەبەی ئەوە کە بە ڕێکەوت لە سەرەتاوە باسی حوزووری خوا و دۆستانی خوا هاتە کایەوە، بە پێویستی ئەزانم هەندێکی تر لەسەر مەوزووعەکە بڕۆم بۆئەوەی باشتر روون بێتەوە بۆ خوێندەوارانی بەڕێز کە ئینسانی حەقیقیی و راستەقینە کامەیە و چۆن بەو پایە ئەگا، وە تەسەووف بنەڕەتەکەی چییە و ئەهلی تەسەووف بەڕاستیی کێن و چۆن ئەگەن بەو پلەوپایەی خواناسییە**

بێگومــان گــرۆی نەتــەوەی بەشــەر     ئــەهلی چــاکە بــن یــاخۆ ئــەهلی شــەڕ
هەموو یەك رەگەز، یــەك بــەر و پشــتن     لــە ئەســڵا هــەموو لــە یــەك سروشــتن
دەســکردی قــەزای خــودای غــەفوورن     نێر و مــێن، ســپین یــا رەش و ســوورن
جــا کــە مــەیلی کــرد یــەزدانی تــەنیا     ئیطــاعــەی بکــرێ لــە رووی ئــەم دنیــا
هــەر بــەردەوام بــێ وەزیفــەی بەنــدە     تــا لــە قیامــەت نــەبێ شــەرمەندە
بە هــۆی تەناســول لــە نێــر و لــە مــێ     وای کرد کۆمەڵێك بڕوا و هــی تــر بــێ
تا یەك لەدوو یــەك ئاگــا بــن، حــاڵیی     خەڵوەی خواناسیی قەت نــەبێ خــاڵیی
ئــەنجا دوو رێگــەی بــۆ کــردن دیــاریی     یەکێ رێگــەی راس، ئــەوی تــر لاریــی
ئەفــەرموێ هەرکــەس لەســەر چــاکەیە     وا حــاڵی باشــە و جــەزای چــاکەیە
بــەڵام کــە بــاری نابــاریی بگــرێ     جــەزای ســزایە هــەرکاتێ بمــرێ
بەهەشــتی دانــا بــۆ چــاکەکاران     دۆزەخ بــۆ گــرۆی خراپــەکاران
هــەروەك بەهەشــتی لیقــا بــۆ خاســان     دووریی ئــەبەدیی بۆ خــوانەناســان

جا بڕێ بە هۆی ئەنبیا و ڕەسووڵ
ڕێگەی چاکەیان بە دڵ کرد قبووڵ

بڕێ تر بە هۆی ئیغوای شەیتانیی
چوونە سەر ڕێگەی هەوای نەفسانیی

چونکە لە هەریەك لەم نێر و مێدا
دوو هێزی چاکە و خراپەی تێدا

هێزی نوورانیی رووحی ئینسانیی
لەگەڵ جنوودی قوای رووحانیی

کە دایم مایل بە خوداناسیین
دژی کردەوەی خراپ و قاسیین

ئەوی تر نەفسە، کە ئەو ناپاکە
حەز ناکا هەرگیز لە ئیشی چاکە

خۆی و جنوودی قەڵب و ناڕەسەن
هەر حەز لە کاری ناڕەسەن ئەکەن

جا بە حەقیقەت ئەم دوو هێزانە
هۆی بەرزیی و نزمیی نەوعی ئینسانە

هەرکەس هەوڵی دا رووح و جنوودی
زاڵ کرد لەسەر نەفس لەگەڵ جنوودی

ئەوا عەبدێکی راسە و قاڵ کراو
وەك جلی چڵکن بیشۆری بە ئاو

خۆ ئەگەر نەفسی زاڵ بوو لەسەر رووح
سا مەگەر بۆتەی تۆبەکەی نەصووح

بگا بە دادی ئەو نامورادە
ئەرنا چرووکە و (أُمُّ الْفَسَاد)ە

کەوابوو بەشەر هەرچەن بە زاهیر
تێکەڵ کراوە لە چوار عەناسیر

بەڵام بە کورتیی ئەعزای ئەندامی
لەسەر دوو بەشە، ئەگەر بفامی

ماددە و موجەڕڕەد واتە لەطیفە
ئەم پاکە وەك نوور، ئەویان کەثیفە

ئەتوانم بڵێم ئەم دوو سروشتە
هۆی بوونی دنیا و قیامەت گشتە

تا بۆی خەریك بی بە وردەکاریی
سەرسام ئەمێنی لە صونعی باریی

باسی حیکمەتی هەریەك لەمانە
پێویستی بە چەن عیلمی گرانە

فەلسەفە و کەلام، عیلمی مەعانیی
عیلمی گژ و گیا و نەشەی حەیوانیی

چونکە بێگومان گرۆی ئینسانیی
سێ گیانی تێدا ئەبێ بیزانی

رووحی نەباتیی بۆ نەشە کردن
رووحی حەیوانیی بۆ خەو و خواردن

یا بە چەشنێ تر ئەڵێین بۆ لاشە
ئەم دوانە ئەرکیان بەس بۆ مەعاشە

ڕووحی ئینسانییش بۆ خوداناسیی
بەڵام دوای ئەوەی کە خۆتت ناسیی

سوودی ئەمیشیان ڕێگەی ڕەشادە
بەرهەمی خۆشیی ڕۆژی مەعادە

حەزرەت ئەفەرموێ هەرکەس خۆی ناسی
ئەنجا ئەتوانێ بڵێ خوام ناسی[8]

قەیدی تەقلید و چێوی ئیستیدلال
بشکێنێ و شهوود جیلوەدا جەمال

واتە شهوودی تەجەللای حوزوور
وێنەی تەجەللای جەلای کێوی طوور

جا وا تێنەگەی کە ئەم شهوودە
شهوودی کونهی زاتی مەعبوودە

بەڵکو شهوودی شەعشەعەی نوورە
کە حەزرەتی زات بە ئەو مەستوورە

بەڵام ئەو حاڵەش لە ڕێی نەوافیل
لەگەڵ فەرائیز بۆی ئەبێ حاصیل

حەدیسی قودسیی صەریحە و دیارە
بەم ڕوتبە بەرزە ئەکا ئیشارە

ئەگەر لە کانگەی ئیخلاص و یەقین
تێکۆشێ ئەگا بە (عَیْنُ الْیَقِینْ)

لەوێش بەولاوە بۆ (حَقُّ الْیَقِینْ)
جا تەجەللای زات ئەبێ بە یەقین

ئەرنا ماسیوا بێ سەر و شوێنە
بۆ دەرکی کونهی زاتی بێ وێنە

فیکری سەقافە و عیلمی قیل و قال
پڕ لە ئاژاوە و خیلاف و جیدال

یا دەرك و فەهمی ڕووحی ئینسانیی
چۆن ئەگا بە زات! نەقصە بۆ شانی

بەڵکە ناسینی کونهی ڕووح هەر خۆی
گرانە بە باشیی ئەگەر بۆی بڕۆی

تەنانەت دەرکی ئەسڵی عەناصیر
دوورە لە عەقڵی ئینسانی قاصیر

واتە سروشتی ئەجزای عەناصیر
بزانێ چییە و چۆنن جەواهیر

هەروا تەرکیب و پەیوەندیی ئەمان
پێکەوە چۆنە و چۆن کران بەمان

یا ڕووح بەو هەموو بەسط و صەفاوە
بە کام دانە و داو بە لەش بەسراوە

ئەنجا نیسبەتی بە گشت ئەجزاوە
جیوارە یاخۆ تێکەڵ کراوە

یا (سَرَیان)ە وێنەی ئاو و گوڵ
خۆی کەم کەم ئەچێ بۆ سەر پۆپە و چڵ

سابیتە و سەییار، یا نیشتەجێیە
هەرکام ئەفەرمووی، ئادەی لەکوێیە؟

ئەنجا لە حالی خەودا چی ئەکا    ئەگەر وا لەلات ئەی خەو چی ئەکا
ئەگەر نەماوە لەلات ئەوکاتە    کەوابوو حالّت حالّی مەماتە
باقیی لەطائیف کە هەروەك رووحن    مەزهەری صەفا و جنوودی رووحن
بەپێی ژمارە سێسەد و شەستن    هەموو وەسیلەی ئەسڵی مەبەستن
ئەگەر حیجاب و پەردەی نەزەریان    لە رێی دینەوە لاچێ لەسەریان
چ دەورێك لەنێو لەشدا ئەبینن    کە موو لە قیر و هەشدا ئەبینن
شەرحی ئەوصاف و جێگەی ئەمانە    بەم کورتە باسە مومکین مەزانە
ئەوانەی بە دەم وێنەی ئەرەستوون    ئەتوانم بڵێم ناویان نەبیستوون
تا بگا بەوەی بزانن کە چین    بەس لەبەر ئەوەی لەبەرچاو خەفین
کەچیی ئینسانییش[9] تەنیا بەمانە    ئەنا ئینسانیش وەکو حەیوانە
ئەخوا و ئەخەوێ، ئەچێ بە رێدا    کرۆکاش ئەکا لێرە و لەوێدا
بە ژیانی کاتیی تۆماری تەمەن    ئەپێچێتەوە لە دەشت و چەمەن
چونکە چی مایەی لەززەتی لەشە    لەنێو عەناصیر دابەش دابەشە
بەلام سولّتانی (لَذائِذ)ی لەش    نەفسی خەسیسە پڕ لە حیلە و غەش
واتە ئارەزووی قوای شەهوانیی    بەس بۆ ئەندامە و هەوای نەفسانیی
ئەو بەشەش کە وا پاك و بێگەردە    عالەمی ئەمرە و دوورە لە پەردە
هۆی خوداناسیین، خۆت نەناس مەکە    خوداناس لەگەڵ خۆت قیاس مەکە
بەپێی سروشت و ئارەزووی خۆیان    تالیبی چاکەن تا بکرێ بۆیان
وەك بڵێی دایم وان لە دەعوادا    لەگەڵ جنوودی نەفس و هەوادا
تاوێ ئەم زاڵە تاوێ تر ئەویان    بۆ شەخسی خاوەن دین و موسڵمان
بەلام بۆ شەخسی فاسق و فاجر    هەر نەفس زاڵە وەك شەخسی کافر
مەگەر جاربەجار فاسقی بەفام    بڵێ هەیاران من بەندەی خودام

بۆ ئەبێ نەچم بەلای چاکەدا ‌‌ — خۆ گشت کەس سوودی وا لە چاکەدا
ئەویش کەم وایە هەتا سەر وابێ — مەبەستی ڕەزا و ئەمری خودا بێ
تانەی ڕەفیق و هاوەڵی لاری — نایەڵن دەرچێ لە ڕێی نابااری
ئەمانیش هەر زۆر وەسیلەی شەڕن — وەك نەفس و شەیتان پیس و بێ فەڕن
ئەنجا عەناصیر وەك شووشە و چران — لەطائیف وێنەی نووری نێو چران
ئارەزووی نەفسیش نەوت و ئاگرە — تا شوێنی کەوی تینی زیاترە
جا چرا ئەگەر پاك و بێگەردە — شووشەکەی سەری نابێ بە پەردە
بەڵام هەرکاتێ ڕەش بوو ئەو شووشە — بە دووکەڵ، حاڵی نووریش مەغشووشە
کەم کەم تێك ئەچێ شێوەی نوورانیی — تا تەبدیل ئەبێ نوور بە زوڵمانیی
بۆیە ئەوانەی ئەسیری هەوان — بێبەش لە نوور و وەسیلەی هودان
یا لە ئەسڵی دین دەرئەچن تەواو — یا موسڵمانن بەڵام هەر بە ناو
دووکەڵی گوناه دڵی داگرتوون — بۆیە بە ڕووح و بە دڵ وەك مردوون
ئەنجا لەطائیف بەپێی تەسەووف — پێنجیان ڕەئیسین بەبێ تەخەللوف
قەلب و ڕووح و سیڕ هەم ئەخفا و خەفیی — کە لای ئەهلی خۆی ڕوونن نەك خەفیی
سەیر و سلووکی ڕێگەی تەریقەت — بەمانە ئەکرێ بە ڕووی حەقیقەت
بۆ سەیری صەفای لیقا ئەمانن — بۆ جیلوەی ڕوتبەی بەقا ئەمانن
ئەم ڕێبازەیە بۆتەی ئینسانیی — قاڵ ئەکا لاشەی ڕەش و زوڵمانیی
مشتوماڵ ئەکرێ شووشەی لاشەکەت — بە ڕوون بوونەوەی چاوە باشەکەت
واتە چاوی دڵ هەم لەطیفەی ڕووح — خەفیی و ئەخفا و سیڕ پڕ بێ لە فتووح
بۆ شەخسی سالیك ئەنواری باریی — بەپێی ئیستیعداد بۆی ببێ جاریی
جا لەمانەوە بۆ نەفس و ئەندام — بە مەقصوود ئەگا (فَنِعْمَ الْمَرَامْ)
خودا ئەناسێ بە عیلمی شهوود — دەرئەچێ تەواو لە قەید و قیوود

مەجال نامێنێ بۆ شك و گومان      عیلمی تەقلیدیی ئەبێ بە ئیزعان
تەصدیقی تەواو لەکاتی ئەحواڵ      ئەکا لە دڵدا بە جیلوەی جەماڵ
بەڵام بێ ئەمان عیلمی لەش بە زات      مەحاڵە دەس‌دا هەیهاتە هەیهات
چونکە نیسبەتی بەو کیبریایە      بە وێنەی قیر و نوور و ضیایە
بەبێ تێکەڵیی لەطائیف بە لەش      دەرکی چی ئەکا لە نوور قیری رەش!
ئەنجا ئەمانە کە چوونە بەر لەش      بۆ باری تەکلیف ئەبن بە هاوبەش
ئەمانیش لەبەر صەفوەتی خۆیان      عەکسی زوڵمەتی لەش ئەچێ بۆیان
حەتتا منالّی بچکۆلە و ساوا      لەم عەکسیاتە بێبەش نەماوە
تەنانەت کاتێ وا لە منالّدان      عەکسی زوڵمەتی دایکی بێگومان
پێ ئەگا تا خۆی کەم کەم پێ ئەگا      عەکسی تریشی هەروا لێ ئەدا
جا ئەگەر هات و لەبەر نابارییی      باری گوناهیش بوو بە سەرباری
هەر تەواو تەم و دووکەڵی رەشی      ئەدا لە رووح و لە لانەی لەشی
وەك چرا و شووشە و نوور و دووکەڵی      عەکسی قەساوەت ئەبێ تێکەڵی
جا ئەبێ لە نوێ دەس پێکاتەوە      هەریەك صەفای خۆی لە نوێ داتەوە
لە رێی سلووك و ئادابی طەریق      رابیطەی مورشید بکا بە رەفیق
وەکو مامۆسا دەرسی بۆ دادا      پارێزگاریی کا، نەیەڵی لادا
لە رێگەی تەقوا و زوهد و شەریعەت      لەگەڵ ئادابی خاصی طەریقەت
بەپێی ئیستیعداد بۆ زیکری باریی      هەریەك لەجێی خۆی بۆی بکا دیاریی
تا ئەگەر لوتفی خودای لەگەڵ بێ      ئەویش تێکۆشێ ئەوەك تەمەڵ بێ
بیخەنە مالّی بۆتەی تەصفیە      مەشغووڵ بێ تەواو لەبۆ تەزکیە
تا ببێ بە جێی سەرمایەی فتووح      حالّی تەجەررود دەس بدا بۆ رووح
بتوانێ دەرچێ لە لانەی لاشە      بڕوا بە کەونا وەك باز و واشە

بێ بە خاوەن تەصەڕڕوف لە حاڵ    بۆ خۆی و بۆ خەڵك بێ بە خاوەن ماڵ
نەبیرت نەچێ ئەمەش بزانە    ئەم حاڵە حاڵی رووحی ئینسانە
رووحی حەیوانیی تا ئاخر نەفەس    هێلانەی لاشەی بەرنادا لە دەس
بە هۆی ئەم رووحە هەڵئەستێ و ئەڕۆی    هەروا بە هۆی ئەم ئەخەوێ و ئەخۆی
نابینی کە تۆ لە حاڵی خەودای    خەریکی دەیان مامەڵە و سەودای
رووحی ئینسانییت بێ ئاگای بەدەن    حەز ئەکا بڕوا بۆ ئەسڵی وەتەن
واتە بۆ ئەو جێ(١٠) نیدای ئەلەستە    صەفی ئەرواحە و کۆگای مەبەستە
بەڵام تا رزگار نەبێ لەم داوە    لە عالەمی خەلق ناچێ بەولاوە
کە کەوتە حاڵی تەزکیەی تەواو    ئەبێ بە خاوەن ئیرادەی تەواو
ئەهلی تەجەڕڕود بەم رووحە پاکە    مەشغوولن بە ئیش لە کەونا، کاکە
وەك بەرقی لامیع مەشریق بۆ مەغریب    طەی ئەکەن بە ئان لات نەبێ عەجیب
دەرئەچن لەنێو عالەمی ئەشباح    ئەڕۆن بۆ ماوای عالەمی ئەرواح
بۆ کەسبی فەیزی تەجەللای جەماڵ    مەقامی قوربە و دەرئەچن لە حاڵ
سەرێکە و هەزار سەودایە لەوێ    هەرچیی داوا کەن رەوایە لەوێ
لە حاڵی (جَمْعُ الْجَمْع)ان ئەمانە    رەبطیان بە ئەشباح هەروەك چەلانە
وەك بڵێی فەسڵ و وەسڵ لەم شوێنە    جەمعیان جائیزە لێرە و لەوێنە
حاڵێکی سەیرە حاڵی ئەمانە    فەهمی بۆ بڕێ هەر زۆر گرانە
ئەمڕۆ دەستی کەس بەم حاڵە ناگا    بەبێ مورشیدی شارەزا و ئاگا
چونکە بەحرێکی قووڵ و عەمیقە    عیلمی ئەسرارە و حاڵی طەریقە
غەوواصی ئەوێ لەگەڵ کەشتیی شەرع    ئەویش بەوپەڕی ئیخلاص لەگەڵ وەرع
عیلمێکی خاصە و خاصی خەواصە    راویی لێرەدا (إِبْنُ عَبَّاس)ە(١١)
ئەفەرموێ حەزرەت: دوای شەوی ئیسرا    پێی فەرمووم خودا علوومی (شَتّٰی)

پێی عەتا کردم بەنرخ و گران
عەهدی پێکردم بۆ بڕێ لەوان

کەتمی کەم لە خەڵك لە خاص و لە عام
کەس لێم نەبیسێ (لِیَوْمِ الْقِیَامْ)

لەبەینی خۆم و زاتی حەقدایە
مەئزوون نیم بڵێم وابوو یا وایە

لەبۆ نەوعێ تر ئەمری پێ فەرمووم
لەپاش وەرگرتن عەهدی پێکردووم

بەپێی توانام تا ئاخر نەفەس
دریغم نەبێ، نەیپۆشم لە کەس

بۆ نەوعێ تری، لە زاتی باریی
ئەمری شەریفی وەها بوو جاریی

خۆم موخەوەڵ بم بیڵێم بە هەرکەس
صەڵاحم زانی، یا نەیلێم بە کەس

ئایەت و حەدیس بۆ عیلمی ئەسرار
زۆرە بۆ کەسێ دەرك کا ئەسرار

راویی ئەفەرموێ روون و دیارە
ئەو بەشەی حەزرەت تێیدا موختارە

عیلمی ئەسرارە بەبێ تەخەللوف
موختارە موختار لەبۆ تەصەڕڕوف

ئەنجا ئەوانەی تێیدا بەشدار بوون
لەخزمەت حەزرەت لە ئەووەڵ چوار بوون

بووبەکر و عومەر، عوسمان و عەلیی
هەرچوار خەلیفەی بەرحەق و وەلیی

جا بەعزێ ئەهلی صوففەی پڕ صەفا
لە موهاجیرین ئەڕبابی وەفا

لەگەڵ بڕێ تر ئەنصار بەو تەرزە
تەعلیمی فەرموون بەم عیلمە بەرزە

لەدوای پێغەمبەر ئەم چوار رەفیقە
بوون بە رەئیسی ئەم چوار طەریقە

هەروا ساڵ بە ساڵ، قڕوون بە قڕوون
قەطعی نیسبەتیان تا ئێستە نەبوون

بەڵام بێگومان لەپاش نوبووەت
روتبەی صەحابەی (أُولُوا الْفُتُوَّةْ)

وا لەژوور هەموو روتبە و ناوێکە
بۆ فەیز و شەرەف وەلەو تاوێکە

تۆزی قەدەمیان سورمەیە بۆ چاو
ئێستاش ئەسەریان روونە وەك هەتاو

نەجمی هودات و نووری نەجاتن
بۆ دین پێشەوای رێگەی خەباتن

نەك هەر لە دنیا رەحمەتن بۆ عام
قائیدی خەڵکن بۆ (یَوْمَ الْقِیَامْ)

لە هەرکوێ یەکێ لەمان مەدفوونە
مردووی ئەو شوێنە لەوان مەڕهوونە

کاتێ کە زیندوو ئەبنەوە یەکسەر  ئەمان پێشەوان بۆ دەشتی مەحشەر

فەزلێکی خاصە خودا پێی داون  بۆ یاری حەزرەت هەڵبژێرراون

شەرع و طەریقەت هەر بە هۆی ئەمان  ئەگا بە ئوممەت تا ئاخر زەمان

بەڵێ سەرچاوەی دینن ئەمانە  زاهیر و باطین لەلای ئەمانە

صوحبەتی تاوێ حوزووری حەزرەت  قیاس ناکرێ لە هەزار خەڵوەت

لەگەڵ ئەوەشدا قادەی شەرع بوون  زیاد لە هەموو کەس ئەهلی وەرع بوون

سینەی پیرۆزی حەزرەت دەریایە  سینەی ئەمانیش بۆ ئەو مەجرایە

چی لە دنیادا بە عالەم گەیشت  بەرهەمی رەنجی ئەمان بوو گەیشت

سا خەڵك بزانن یاخۆ نەزانن  هەموو پەروەردەی خوانی ئەوانن

هەرکەسێ سپڵە و حەق نەناس نەبێ  نابێ بۆ ئەمان بەئیخلاس نەبێ

چونکە واریسی شەرع و طەریقن  هەموو بۆ حەزرەت یار و رەفیقن

شەرع میزانە بۆ زاهیری حاڵ  ئەسرار بۆتەیە و ئینسان ئەکا قاڵ

هەرکەس قاڵ نەبێ ئەندام و ئەعزای  ئەهلی طەریقەت وا ئەدەن فتوای

ئەڵێن هەرکەسێ لە گەنجی ئەسرار  نەرژێ بەسەریا فیووز و ئەنوار

نەنۆشێ دەم دەم لە بادەی صەبووح  سەد کە زیندوو بێ، جیسمێکە بێ رووح

سا چ زانا بێ یا نەزانا بێ  نابێ بە مەحرەم هەتا ئەو وابێ

وا بەسەر لوتکەی هەوای نەفسەوە  ئایەی (سَوَّلَتْ لَهُمْ) بۆ ئەوە

دڵی بێ ئاگا و رووحی پێ بەسراو [١٢]  لەنێو دووکەڵی قەسوەتا خنکاو

کەی ئەمە رووحە یا ئەو کەی دڵە  بازیش بێ دایم کۆتا مەنزڵە

ناگەی بە ئاوات لە جێگەی ئاوات  سەد کەرەت فیز کەی بە ژینی ئاوات

جا با هەر بڵێی من موسڵمانم  یا بڵێی زانا و ژیر و لوقمانم

کاتێ کە زانیت مونکیر و نەکیر  وا هاتن بۆ لات ئەمەت دێتە بیر

ئەوسا ئەزانی بەم قالەقالە          بێ ئاگا لە حاڵ دەستی بەتاڵە

چونکە لای خودا دڵێ مەقبوولە          دایم بە یادی خودا مەشغوولە

ئەمەش ناگونجێ بەبێ طەریقە          خۆزگە بەو کەسەی ئەهلی طەریقە

لەو سەرچاوەوە دڵ ئەکا پاراو          با بڵێن شێتە و عەقڵی ناتەواو

مەبەست لێرەدا لەم دەنگوباسە          بزانن طەریقەت خاوەن ئەساسە

تۆ کە نەیزانی، هەی نەزانییتە          خەتای مەعشووقەی دنیای فانییتە

هەوڵت نەداوە بەئیخلاسەوە          ڕێگە بەی بە لای ڕێگەی ڕاسەوە[١٣]

تا تۆ دەس نەبەی بۆ ئیشوکارێ          قەت لە هەواوە شت بۆت ئەبارێ؟[١٤]

تۆ کە هیچ نەکەی چۆن بە شت ئەگەی          ئەویش لە دەریای ئەنواری بێ پەی

خەتای نەبوونی طەریقەت نیە          کە تۆ خۆت ئاگای طەریقەت نیە

ئەنا لە صەدری ئیسلام تا ئێستە          بووە و هەر ئەبێ و ڕێگای مەبەستە

بەڵام ئەوکاتە هەموو ئەصحاب بوون          یاری حەزرەت بوون (أُولُوا الأَلْبَابْ) بوون

نیسبەتی هەموو ناوێك لە ناوان          زیاد لە (صەحابە) ئەبوو بە تاوان

لەپاش نوبووەت جوانترین لەقەب          لەفزی (ئەصحاب) بوو بۆ ڕێز و ئەدەب

ئیصطیلاح ئەوسا شەرع و وەرع بوو          یاخۆ بە کورتیی ئەسڵ و فەرع بوو

یاخۆ بە فەرز و سوننەت نێو ئەبرا          وتە و کردەوە وای پێ ئەوترا

یا فیقه و تەوحید بۆ (أُولُوا الأَلْبَابْ)          واتە (أَخَصّ)و (خَوَاصّ)ی ئەصحاب

بەڵام ئەهلی شەرع بە هۆی ئیستیعمال          لەفزی فەقیهیان گۆڕیی (بِالْمَآلْ)

مەشهوور بوون هەموو بە لەفزی (فَقِیهْ)          چونکە بە ئەهلی صەفا بوون (شَبِیهْ)

بۆیە غەزالیی ئەفەرموێ[١٥] ئەوسا          بە ئەهلی صەفوەت (فَقِیهْ) ئەوترا

جا لەوان بەدوا بوون بە (تَابِعِینْ)          ئەمەش بۆ ئەوان پڕ بوو لە تەمکین

ئەنجا تابیعی ئەو تابیعانە          بەس بوو بۆ بەرزیی ڕوتبەی ئەوانە

تا ئەم سێ جیلە فەرمانڕەوا بوون    شەرع و طەریقەت لە برەودا بوون
تا قەرن و نیوێك بەم شێوە رۆیی    ئەنجا دین بەرەو کزیی ئەڕۆیی
زانایان لەگەڵ فەرمانڕەوایان    موڵهەم بوون هەموو، روون بوو لەلایان
ئەگەر جیل بە جیل هەر بێن و بڕۆن    لەسەر ئەم حاڵە و خەمی دین نەخۆن
زۆری پێ نەچێ هەر بەتەواویی    دین لەنێو گەلان نەمێنێ باوی
ئەنجا بە کۆمەڵ بەوپەڕی ئیخلاس    هەم بە ئیستینباط هەم بە هۆی قیاس
رەئیان دەربڕیی بە خاص و بە عام    چارەسەرێ کەن بۆ دینی ئیسلام
نەبادا ئەهلی بیدعەت و فەساد    دەس خەنە رێگای (سَبِيلَ الرَّشَادْ)
هاتن خەریك بوون بە تەدوینی شەرع    حەدیس و تەفسیر عیلمی تەقوا و وەرع
هەریەك بە خۆی و کۆڕ و کۆمەڵی    ناوێ تایبەتیی کەوتە بەر دڵی
بۆ ئەحکامی شەرع بڕیار وا درا    زانایانی بەرز، دڵ روون وەك چرا
هەموو لە دەوری یەکتر ببن جەم    بۆ بەحس لە دین وەك پەروانە و شەم
بە میزانی عەدڵ عیلمیان بکێشن    بزانن کامیان بەرز و لەپێشن
کامیان زۆر و کەم بەپێی ئیستینبات    ئەحکام لە قورئان ئیستیخراج ئەکات
یا لە حەدیس و ئیجماع و قیاس    بۆ فتوا لەمان ئەکا ئیقتیباس
جا بە بڕیاری عولەمای ئەرشەد    مالیك و نەعمان، شافیعیی و ئەحمەد
رەئی و فتوایان وەرگیرا بە عام    بۆ زۆر و کەمی ئەحکامی ئیسلام
چونکە بەس ئەمان رەئیان تەواو بوو    رەئی ماباقیی گشت ناتەواو بوو
بۆیە ئەم چوارە بوون بە سەرمەزهەب    ناوی ئیمامیان بۆ بوو بە لەقەب
بە یەك دەنگ وتیان زانا یا نەزان    ئەبێ تابیع بن بە رەئی ئەمان
خیلافی ئیجماع بێ قسە و خیلاف    خیلافی دینە و بەس لافە و گەزاف
کەوابوو هەرکەس لەم چوارە لادا    زیان ئەدا لە خۆی، سوودی پێ نادا

چونکە ئەو کەسە بە خۆی مەغروورە
مەغروریش یەقین لە راسیی دوورە

نەك هەر ئەمە و بەس، ئەو بەو غروورە
لەکاتی خۆیدا غەیرە مەعزوورە

لادان لە ئیجماع خیلافە و شیقاق
ئەمەش لە دینا پێی ئەڵێن نیفاق

بۆیە حەفتاوو دوو فیرقەی نادان
حەزرەت بە ئەهلی دۆزەخی دانان

تەنیا یەك فیرقە بەگوێرەی حەدیس
فیرقەی ناجییە و دوورە لە تەدلیس

ئەویش ئەوانەن لەبەر بزانیی
کەوتنە شوێن حەزرەت خۆی و یارانی

یارەب سەنای تۆ قەت تەواو ناکەین
ئێمەش شوێنکەوتووی ئەو فیرقە چاکەین

با بە کردەوەش ئەهلی تاوانین
بەڵام تابیعی رێگەی ئەوانین

ئەمیش لە خۆتە نەك لە ئێمەیە
لاریی و ناباریی ئەرکی ئێمەیە

لوتف و هیدایەت لەسەر ئیشی چاك
لایق بە تۆیە ئەی خودای بێباك

خۆتی رێنوێن بۆ هەموو بەندەت
وەك خۆت ئەبەخشی بەندەی شەرمەندەت

ئەمجا ئەوانەش ئەهلی مەعنا بوون
خەریکی وەرع و زوهد و تەقوا بوون

لەسەر فەرموودەی بەرزی پێغەمبەر
پاڵیان دا بەلای جیهادی ئەکبەر

واتە جیهادی نەفس و رەزائیل
دایم بە فەیزی خودا بوون مائیل

مەبەستیان حوبب و رەزای خودا بوو
خەیاڵیان لەلای گەنجی لیقا بوو

تا هەموو گەیین بەو لیقا و بەقا
رزگار بوون لە دەس مەینەت و جەفا

(هَنِيئاً لَهُمْ بِمَا هُمْ فَازُوا
بِهِ مِن كَأْسِ الْحُبِّ وَامْتَازُوا)

لەفزی تەصەووف بەنیسبەت ئەمان
یەکجار بەجێ بوو بۆ ئەرکی ئەمان

بۆیە مەشهوور بوون بەم ناوە جوانە
سینەیان چرای نووری ئیمانە

هەرکەس لە وەزعی ئەمان ئاگایە
ئەزانێ حاڵی ئەمانە وایە

ئیتر لەو کاتە کە ئەم ناوانە
نەبووبن، مەعنای ئاوا مەزانە

کە ئەم عیلمانە هیچ کام نەبووبن
یا عولەمای دین بە هەڵە چووبن

عیلمی ئەمانە بە نێو کەسبییە　　بە رووی حەقیقەت هەمووی وەهبییە
زەینیان بە غەڵەت قەت ناچێ ئەمان　　موشکیلیان لە دەس دەرناچێ ئەمان
بۆ دین و دنیا حەقیقەت ناسن　　بۆ کالای شووشەی مەبەست ئەڵماسن
بە لوتفی خودا بوون بە موقتەدا　　(جَزَاهُمْ عَنَّا أَحْسَنَ الْجَزَا)
کەوابوو عیلمی دینیی بە گشتیی　　ئەبێ بە دوو بەش بە شێوەی گشتیی
بەشێکی شەرع و حەدیسە و تەفسیر　　بۆ نیزامی دین بەگوێرەی تەقدیر
ئەو بەشەکەی تر عیلمی ئەسرارە　　کە بۆ تەزکیە و جەلبی ئەنوارە
هەتا بەو عیلمە خودا بناسن　　وەك ئێمە نەبن رەقتر لە ئاسن
ئەوانەی زیاتر بە شەرع خەریك بوون　　لە تەکیە و چلە و خەڵوە تەریك بوون
بە شەوخوونیی شەوانی درێژ　　ئەتکا لە نووکی قەڵەمیان سەد نوێژ
بۆ کەشفی رمووز، حەللی مەسائیل　　دەعوا رەوا بوون بەپێی دەلائیل
بەم حاڵە لە رێی وەرع و تەقواوەش　　مەعشووقەی دڵیان ئەگرتە باوەش
ئەکثەریان ئەهلی صەفای دەروون بوون　　ئەهلی بەصیرە و چاو و دڵ روون بوون
(ذِي الْجَنَاحَيْنْ) بوون زاهیر و باتین　　یەك لەیەك چاتر شاریح و ماتین
بەڵام ئەوانەی سیریان مەبەست بوو　　دڵیان هەر لەلای عەهدی ئەلەست بوو
لەبەر صەفوەتی دڵ و دەروونیان　　لەبەر زەمیری هەمیشە روونیان
لەبەر صەفاگای فەزای لیقایان　　لەبەر ئەحواڵی فەنا و بەقایان
لەبەر عرووج و نزوولی رووحیی　　بە زەوق و نەشەی بادەی صەبووحیی
هەموو لەم رێدا وا موصەففا بوون　　وەك ئەهلی صوففەی مەدینە وابوون
فەرقی مابەینیان تابیع و مەتبووع　　حاڵەتیان یەك حاڵ بە نەصصی مەقطووع
تەنانەت لەگەڵ موعجیزەش هەروا　　ئەم بە تەحەددا، ئەو بێ تەحەددا
واتە ئەم ئەبێ بڵێ من ئەبیم　　وەلیی قەیناکا نەڵێ من وەلیم

بەڵگەی موددەعیی روتبەی ریسالەت     نزوولی وەحیە و خاریقەی عادەت

وەك عەصای مووسا و بوونی نیل بە بەڕ     یا شەققی قەمەر بۆ (خَيْرُ الْبَشَرْ)

هەروا خاریقەی عادەش بۆ خەواس     لە ئەولیای حەق دەس ئەدا بە راس

بەڵام بەو ئەڵێن موعجیزەی نەبیی     بە ئەم کەرامەت بۆ شەخسی وەلیی

خاریقە مەعنای بەگوێرەی عادەت     دەس نەدا بۆ کەس بە سەد مەرارەت

وەك تەی مەسافەی بەعید، یا فڕین     بە رووی هەوادا یا لەسەر زەمین

ئەنجا خاریقەش ئەبێ بە شەش بەش     چواری صەحیحە و دوانی پڕ لە غەش

موعجیزە و ئیرهاص بۆ ئەنبیایە     بەڵام کەرامەت بۆ ئەولیایە

مەعوونەش بە هۆی فریشتەی خودا     بۆ شەخسی ساڵح زۆر جار روو ئەدا

پێنجەمین سیحرە، شەش ئیستیدراجە     لای ئەهلی فجوور خاوەن رەواجە

لێرەدا زانای کوردی شارەزوور     (مەولانا خالید) نابیغەی مەشهوور

لە مەکتووباتا ئەفەرموێ: ئەگەر     تەنیا بە (خَرْقُ الْعَادَة)ی پێغەمبەر

باوەڕت ببێ، نەك بە هی وەلیی     ئەبێ خۆت بە خۆت بفەرمووی غەبیی

چونکە (مُؤَثِّرْ) بۆ خەرقی عادە     قودرەتی خاصی (رَبُّ الْعِبَاد)ە

گاه زاهیر ئەبێ لە یەك پێغەمبەر     گاه شەخسی وەلیی ئەکا بە مەزهەر

منەت هەر لەوە و هەر لە خۆیەتی     بیدا بە هەرکەس مەیلی خۆیەتی

کەوابوو گشتی هەر هی خودایە     بۆ خوداش هەمووی سەهلە و رەوایە

تانەدان لەمان وەك تەشەر لەوە     چونکە خاریقەی ئەمان هی ئەوە

ئینکاری ئیعجاز کوفری صەریحە     ئینکاری (وَلِي)ش هەر زۆر قەبیحە

چونکە ئەمانە نوخبەی ئوممەتن     مەحبووبی خودان، خاوەن هیممەتن

خوا بە ئەولیای خۆی ناوی بردوون     (خَارِقُ الْعَادَة)ی زۆری بۆ کردوون

لە کەشفی غیطای حیجابی حوزوور     زیندووکردنەوەی ئەصحابی قوبوور

تەسخیری وحووش، نوطقی حەیوانات     سەیر و عرووجی فەوقی سەماوات
ئیحضاری طەعام لەکاتی ناکات     گەیاندنی خەڵك بەوپەڕی ئاوات
ئیحیا کردنەوەی دڵانی مردوو     ودبیرخستنەوەی بەسەرهاتی زوو
بڕێ لەوانە بە نەصصی کەلام     سابیتە و بڕێ بە ئیجماعی عام
(خَارِقُ الْعَادَه)ی ئەمان لەم بارە     ئەوەندە زۆرە نایەتە ژمارە
ئەمانەن بەرام ئەهلی تەصەووف     مەنبەعی صەفان بەبێ تەکەللوف
صوففەی سینەیان[١٦] عەرشی خودایە     صوحبەتیان بۆ دڵ بە حەق دەوایە
ئایەی (وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِيْنْ)     شموولی ئەمان ئەکا بە یەقین
کەون و مەعییەت لەگەڵ ئەمانە     بە قەلب و بە ڕووح شەرتی بزانە
بۆ سلووك لە ڕێی (جَاهَدُوا فِينَا)     نەفس و شەیتانت وان لە کەمینا
جیهادی ئەم دوو دژەی حیلەباز     مەحاڵە بۆ تۆ برای بە خۆ ناز
ئەمانە دژی نهێنیین لەبۆت     نزیکن لە تۆ وەکو خۆت لە خۆت
بەبێ وەسیلە و سیلاحی خەفیی     بەرسیسای عابید دەنگ نادا دەفیی
دەستی مەعنەویی ئەوێ ئەم جەنگە     دنیات بەدەس بێ مەجالت تەنگە
ئەم دەستە دەستی ئەولیایە بەس     بە غەیری ئەمان ناکرێ بە کەس
ئەمان حەریفی ئەم دوژمنانەن     مەردی مەیدانی ئەم دین مژانەن
ئەمان جنوودی عالەمی مەعنان     سوپای خودایین، چالاك و وریان
لە ڕێگەی سلووك نەفس مرێنن     بە باڵی هیممەت شەیتان شکێنن
ئەمانە بازی قودس ئاشیانن     لە حیلەی نەفس و شەیتان ئەزانن
لاقەیدی تیر و تانەی ئەوانن     دایم بۆ ئەوان دەس بە کەوانن
ئەمان لە دەشتی وەفا ڕاو ئەکەن     هەزار دژی وا تووشی داو ئەکەن
بە دانە و داوی دەسائیس فێرن     لە بادەی سەبووی حەقائیق تێرن

ئەمان لە دەریای عیلمی (مِن لدنْ)
جورعەنۆشن گشت لەدەس ئەمری (کنْ)

سەرچاوەی دەریای عیلمی ئەمانە
میشکاتی[17] سینەی حەزرەت بزانە

ئەمان لەو نوورە ئیقتیباس ئەکەن
بۆیە چی ئەڵێن هەموو راس ئەکەن

ئەمان نەهەنگی دەریای عیرفانن
ئەمان شارەزای کەون و مەکانن

پەردە بۆ ئەرواح لەدوای رەهابوون
نامێنێ، هەروەك چۆن لەوەوپێش بوون

فەرقی ژێر زەویی یا چوونە سەر عەرش
نیە بۆ ئەمان وەك چۆن بەبەر لەش[18]

کەوابوو فریادرەسیی ئەمانە
بە شتێکی سەیر و بەعید مەزانە

هەتا پێ نەگەن بەو پلە و پایە
وەك ئێمە هیچیان قەت لە دەس نایە

بەڵام دوای گەیین بەو مەقامانە
خاریقەی عادەش بۆیان ئاسانە

چونکە هەرکاتێ رووحی ئینسانیی
خۆی باتە شێوە و شکڵی جیسمانیی

ئا لەو حاڵەدا وەك باقیی ئەجساد
ئەتوانێ بۆ گشت یارمەتیی و ئیمداد

بگا بە دادی هەر مەدەدخوازێ
بێ ئەوەی هەرگیز بە خۆی بنازێ

ئەمری عادیی بێ یا غەیرە عادیی
بۆ ئەو بەسیطە و شتێکی عادیی

بەڵکە ئەو هەر زۆر لە ئەجسام زیاتر
بەهێزە و زووتر بۆت ئەبێ حازر

وەك موجەددیدی هەزارەی دووهەم
قوطبی رەببانیی، نابیغەی موڵهەم

لە مەکتووباتا بە نەهجی سەدید
لە باسی قسەی سوڵتان بایەزید

باسی ئەم حاڵە ئەکا بە تەفصیل
رووناکتر لە رۆژ، مەگەر بۆ عەلیل

ئێستە بەبۆنەی صەنعەت و پیشە
نموونەی دیاری دیارە هەمیشە

بڕوانە رەسمی سینەما و ڤیدۆ
یا تەلەفزیۆن لەبەرچاوی تۆ

ئەو هەموو رەسم و هەیکەل و رەنگە
ئەو هەموو تەپڵ و مۆسیقا و دەنگە

گیاندار و بێ گیان بەو شێوە باشە
هەروەك ئەسڵەکەی ئەیدا بە شاشە

بە هۆی ئەو دەزگا وات نیشان ئەدات
بێ شك و گومان سابیتە لەلات

کەچیی هەرهەمووی صەنعەتە و پیشە     جێگەی سەرنجی خەڵکن هەمیشە
ئەنجا بۆ کەسێ زانا بێ بە راس     هێزی رووح لەمان ناکرێ قیاس
چونکە خاوەنی عیلمە و ئیرادە     (تَمَثُّلْ) بۆ ئەم بەسیطە و سادە
ئەم کە خۆی گیانە و ئەسڵی ئینسانە     رووحی پیرۆزی شێرە مەردانە
بۆ ئەبێ وەك ئەو یا زیاتر نەبێ     بۆ بڕیار ئەدەی ئەم حازر نەبێ
یا وەك فریشتە خۆیان بگۆڕن     بۆ تەمثیل بە لەش، چ کەم چ زۆرن
هیچ نەبێ مومکین ڕەوایە بوونی     ئەی بۆ حوکم ئەکەی تۆ بە نەبوونی
ئومووری مومکین بە مەحاڵ زانیین     دەلیلە لەسەر جەهل و نەزانیین
ئایە بۆ زانا تەمثیلی جیبریل     بە شێوەی (دەحیە)[19] نابێ بە دەلیل!
یاخۆ ئەوانەی بوون بە میوانی     حەزرەتی لووط و قەومی نەزانی
بە شێوەی گەنجی ئەمرەد و بێ موو     هەر بە ئاشکرا خۆیان گۆڕیبوو
نابن بە بەڵگەی (تَمَثُّلْ) بە رووح؟     کەچیی خۆ لەوان لەتیف ترن رووح
ئەوەش مەعلوومە چی لەتیف تر بێ     ئەبێ ئیشی وای بۆ سەهل‌تر بێ
نصووصی قورئان بۆ ئەم تەمثیلە     لەگەڵ ئەحادیث چاکتر دەلیلە
هەروا ئەشکال و صوورەت لە خەودا     تەمثیلی رووحە لە نیوەی شەودا
ئەو ئەچێ بۆ گشت مەقام و شوێنێ     لاشە لەجێی خۆی بەجێ ئەمێنێ
نە ئاگای لە خۆی نە لەو رووحەیە     کەچیی رووحەکەی ئاگای لەم هەیە
مەگەر جاربەجار کە زۆر ئیشغاڵ بێ     بە ئیشێ عەجیب سەری جەنجاڵ بێ
ئەویش کە بانگت کرد لە لاشەکەی     زۆری پێ ناچێ هۆشە باشەکەی
دێتەوە بەر خۆی، دێتەوە بەر لەش     بێ ئەوەی هەست کا بەم دوو حاڵە لەش
ئەمەش شتێکە ئینکار ناکرێ     گشت کەس ئەیزانێ و پەنا نادرێ
ئەنجا ئەرواحی ئەو بزورگانە     چی ئەیکەن هەمووی لە رووی فەرمانە

واتە فەرمانی حەزرەتی باریی — سا لە خەودا بن یا لە بێداریی
غەفڵەت بۆ ئەمان تازە مەحاڵە — سا لەش ئاگا بێ یا نا لەو حاڵە
وەك موجەددیدی دووهەمین هەزار — لە مەکتووباتا وا ئەکا ئیزهار
تەنانەت ئەڵێ بۆ چاو نووقانێ — نابێ غافڵ بن، وەلەو بۆ ئانێ
لەدوای گەییشتن بەو پلە و پایە — غەفڵەت بۆ ئەرواح نایەتە کایە
شەرحی ئەم حاڵەش لێرە زەحمەتە — چونکە باسێکە پڕ لە حیکمەتە
فەهمی بڕێکی ناکرێ بە دەم — مەجالی ئەحواڵ تەنگە بۆ قەڵەم
(هَنِيئاً لِمَنْ نَالَ بِالْمَجَالْ — وَيَا حَبَّذا لِفَهْمِ الْمَقَالْ)
سوقم و صیحەتی راس لەگەڵ درۆ — لە من وەرگرە، راستت ئەوێ تۆ
ئەمانە رووح و دڵی ئینسانیین — بەریی لە پەردە و غیطای جیسمانیین
خۆیان نەپێچا بە جیفەی ئەشباح — خەریك بوون بە دڵ بە سەیری ئەرواح
گەیین بە روتبەی میعراجی رووحیی — بە زەوق و صەفای بادەی صەبووحیی
هەرکەس قەترێکی لەو بادە نۆشیی — تازە ئەو لەکوێ و کۆنە فرۆشیی
ئەوەی تۆ لەلات جوان و پەسەندە — لای ئەمان پووچ و بۆگەن و گەندە
ئەگەر هەر زۆریش رژا بەسەریا — ئەو لەلایێ تر ئەیخاتە دەریا
واتە بە ئیحسان ئەیبەخشێتەوە — بیری بەلایا قەت ناچێتەوە
یەعنی لاقەیدن بە دڵ لەو ماڵە — لای ئەمان عەکسی عەقڵ و کەماڵە
دەس بەردان لە دین بۆ جیفەی دەنیی — ئیشی عەوامە و نەزان و شەقیی
ئەمان شتی وا دەس ئەدا بۆیان — سەرسوڕهێنەرە بۆ غەیری خۆیان
چونکە سەیرانچیی سارای تەوحیدن — لە ماسیوای حەق بە دڵ بەعیدن
ئەمان لە روانگەی دڵی پڕ لە نوور — لە ساحەی سینەی وێنەی کێوی طوور
فەزاچیی سەمای بەرزی عیرفانن — ئەمان بەهەشتیش بە کەم ئەزانن

سەما لای ئەمان (تَحْتَ الثَّرَی)یە     من یووسفم بێ، چیم لە هەودایە!
بۆ نموونە وەك مەلای بیارە [20]     کە نێوی لەنێو نێوان دیارە
ئەفەرمووێ کە بەم کەڵاش و پاوە     ئاسمانانم گشت داوە وەپاوە
واتە کە من خۆم کەڵاش وا لەپێم     بە لەش لە خاکی بیارە نیشتەجێم
بە سەیری رووحیی ئاسمانان گەڕام     فیکرەی فەلسەفیی غەڵەت بوو لەلام
صونعی کردگار لەژوور فەزاوە     لە بەدئی کورەی ناریی بەولاوە
واتە لە ئەووەڵ سەما یەك بەیەك     تا ئەچێتە ژوور نۆهەمین فەلەك
وا نەخولقاون فیکرەی فەلسەفە     یاخۆ سەقافەی نەزان و سەفە
بگا بە (کَمّ)و (کَیْف)ی ئەوانە     هەمووی خیلافی فیکری ئەمانە
کەشفی ئەوانە دوورە لە ئەفکار     مەگەر بە وەهم و خەیاڵ و پوندار
وەهم و خەیاڵیش لێرە وەك کوێرە     عەینی نیشانە و پلاری کوێرە
مەگەر بە رێکەوت رێکەوێ جارێ     هەدەف بپێکێ بە بەردێ دارێ
جا قەڵەم ئەگەر بڕوا لەم بارە     سەری لێ ئەبێ بە داشە هارە
چونکە باسێکی هەر زۆر غەریبە     نە ئیشی مەلا و نە هی ئەدیبە
ئەهلی خۆی نەبێ دەرناچێ سەری     ئەگەر تا ئەبەد بڕوا لەسەری

## بزانین هەیکەلی ئادەمیزاد لە چەند شت دروست کراوە و سوودیان لە راستیدا چیە

ئەنجا وەك وتم عەناصیر چوارە     ئاوە لەگەڵ گڵ، هەوایە و نارە
نیسبەتیان لەگەڵ ئێمە ئەم چوارە     بۆ کوری زانا روون و دیارە
یەعنی لە دوو دوو دروست کراوین     لە نار و هەوا، لە خاك و ئاوین
بەڵام بەشی گڵ لەو تەرکیبەدا     بۆ تەکمیلی لەش لەو تەکوینەدا

هەر زۆری بەپێی ئایەرە و حیکمەت        لەو سیانەکەی تر زیادە بە نیسبەت
هەروەك بەشی ئاو لەگەڵ هەوا و نار        زۆری زیاترە [٢١] بەگوێرەی ئاسار
ڕەمزی ئەمانەش کە بۆچی وایە        هەرچەند حەواڵەی عیلمی خودایە
بەڵام حیکمەتی ئەم دوو بەشانە        کە بۆ زیاترن ئا لەو دووانە
شتێکی روونە بەنیسبەت ئەوان        ئاو و گڵ هەر زۆر پەست و بێ‌هەوان [٢٢]
بە پێچەوانەش بۆ قازانج و سوود        زۆر بەرێزترن بۆ پلەی مەقصوود
هەرکەسێ زیاتر لەگەڵ خودادا        سەری زەلیلیی بێنێ بەلادا
هەر بەو نیسبەتە ڕێزی زیاترە        لەوەی شوێنکەوتووی هەوا و ئاگرە
چونکە ئەم دووە مائیل بە بەرزین        وەك ئەسپی سەرکێش داتئەخەن لە زین
واتە وەك نەفسی چەمووش و بزۆز        ئەتبا بۆ ڕێگەی پڕ لە تەپوتۆز
وەك گێژەڵووکەی بووکە جنۆکە        گێژت پێ ئەدا وەك پووش و لۆکە
مەرکەزی ئەسڵیی نەفسیش بزانە        تەویڵە و لەژوور ئەعزای ئینسانە
ئەڵێی وا لەسەر لوتکەی چیادا        دایم ئەڕوانێ بە رووی دنیادا
جا ئەوەندەی تر فیز ئەکا بەمە        بۆیە کڕنووشی نوێژ لەسەر ئەمە
تا بەو کڕنووشە بشکێ دەماخی        ڕۆژێ پێنج کەڕەت، لێت نەبێ یاخیی
بۆیەش نوێژنەکەر بەرزە دەماغە        چونکە دەماغی نەفسەکەی چاغە
حەز بە سەرکزیی ناکا بۆ خوداش        مەگەر بیهاڕێ وەك ئارد بە بەرداش
تا لە (أَمَّارَە) بێ بە (لَوَّامَە)        بزانێ مانای بەندەگیی کامە
جا (مُطْمَئِنَّە)و نەفسی دامەزراو        دەرچوو لە حیلەوحەواڵەی تەواو
ئەنجا (رَاضِیَە)و بە قەزا ڕازیی        جا ئەوسا خودا لە خۆی کا ڕازیی
یەعنی تەزکیەی تەواو کرابێ        مەیلی بێ‌ئەمریی خودای نەمابێ
بە سەد بارەوبار بە دەس قەزاوە        سکاڵای نەبێ بە هۆی ڕەزاوە

لە حالّی خۆشیی و تالّیی ژیانی     ڕەزای خودا بێ ئەرکی سەر شانی
بە سەد هەلومەرج تۆبە نەشکێنێ     پەتی بەندەگیی لە مل نەپسێنێ
بەلاّم پەیڕەوی شەرع و تەریقەت     نەبێ، قەت نابێ بەم[٢٣] بە حەقیقەت
جا کە نەفسەکەت گەیشت بەم پایە     ئەوسا ئەزانی قیبلەت خودایە
بەلاّم تەفصیلی گەیشتن بێرە     ئێستە نادرێ بۆ ئێمە لێرە
چونکە ئەم پلەوپایەی ڕەزایە     هەرچەن هەر بە هۆی دەستی قەزایە
بەلاّم تا هێز و قوای نهێنیی     وەکو لەطائیف نەکەن دەمبێنیی
تەزکیەی نەکەن بەشێوەی خەفیی     مەحالّە دەنگ‌دا لەو شوێنە دەفی
جا بۆیە دەرکی حالّی ئەمانە     بە عیلمی ئەسرار نەبێ گرانە
ئەمەش لێرەدا باسی ناکرێ     وا چاکە دەرگای لەسەر داخرێ
بەلاّم کە ئەهلیش نەبووی لەم شوێنە     هەر لە خۆتەوە بەرد مەوەشێنە
بەوپەڕی ئەدەب لەگەلّ ئەمانە     بدوێ و پڕ بە دلّ نرخیان بزانە
با ڕێی حەقیقەت لە خۆت نەبەستی     ئەگەر تۆ زانا و خاوەنی هەستی
چونکە بێ‌ئەدەب بە حوکمی ئەدەب     نابێ بە خاوەن فەضیلەی ئەدەب
ئەدەب تاجێکە بینێ بەسەرتا     بۆ هەرکوێ ئەچی گەنجە لەگەلّتا
زانایان ئەلّێن بێ‌ئەدەبیی تۆ     ڕێگەی هیدایەت سەد ئەکا لە تۆ
چونکە ئەوانەی بە حەق ئەولیان     خەواصن هەموو مەحبووبی خودان
ئەنجا عەداوەت لەگەلّ دۆسی دۆست     وەك ئەوە وایە تۆ دژ بی بە دۆست
تا ئێرە کەمێك بە زمانی کوردیی     لەبەر زەروورەت باسم بۆ کردی
لێرە بەولاوە فەهمی گرانە     نرخی حەقائیق بە زایە دانە
تەصەووف بەلای ئەهلی صەفاوە     ئاوایە، باقیی بنێرە لاوە
چونکە بێگومان ئەوانەی بە دەم     دەم لە تەصەووف ئەدەن دەم بەدەم

بڕێ بە نەقشیی و بڕێ قادریی     با بڵێم دووربێ لە ڕووی حازریی
نەك ئەهلی طەریق نین بە حەقیقەت     هەر تێنەگەیون هیچ لە طەریقەت
چونکە طەریقەت بەبێ شەریعەت     بەتاڵە و دوورە ئەو لە حەقیقەت
ئەگەر بە ڕێکەوت لەگەڵ بێ دینیی     خاریقەی عادەت تۆ لە ئەو بینی
تۆ ئەو خاریقە بێنە بەملاوە     بیخە تەرازووی شەرعی خوداوە
ئەگەر دەرنەچوو سەربەسەر سەری     بەتاڵە بێ شك ئەو لە حەق بەریی
زانایانی شەرع وا ئەدەن فتوای     ئەگەر ئاوابوو مامەڵە و سەودای
ئەڵێن یا سیحرە یا ئیستیدراجە     بەریی لە شەرع و وەرع و مینهاجە
ئەتوانم بڵێم بەبێ ترس و لەرز     هەر لە ڕووی ڕاسیی نەك بە وەهم و فەرز
بەعزێ ئیختیلاف کە دێتە بەرچاو     سەرچاوەی لەمان هەڵقوڵیی تەواو
وەکو (وەهابیی)و (ئیخوان)و غەیرە     کە ئیفراط ئەکەن بەو شێوە سەیرە
بە هۆی ئەمان بوو وا لەم بارەوە     دەرچوون لە سنوور بە ئینکارەوە
قیاسی حەقیان کرد لەگەڵ بەتاڵ     ئەسمای موشتەرەك بوو بە زەرفی حاڵ
وتیان ئەوانەش کە ڕابراون     هەموو وەك ئەمان لە حەق بڕاون
هەریەك لەکاتی ماوەی ژیانی     بەڵگەی هەڵەی خۆی بەمانە هانیی
سەریان لێ شێوا بەو قیاسەوە     تا دەسیان دەرچوو لە ژێر کاسەوە
چوون بە گژ هەموو ئەهلی طەریقەت     بێ فەرقی بەتاڵ لەگەڵ حەقیقەت
خۆیان بە زانا زانی وەك مەلا     بەڵام لە عیلمی حەقائیق (فَلاَ)
تا دەستە دەستە کردیان بە کارێ     لە واتەی دەمیان غەزەب ببارێ
لە بابی فیکرەی دژ بە ئەولیا     چاك و خراپیان لێك نەکرد جیا
سنووریان نەهێشت بۆ باسی دژیی     گەیین بە تەکفیر تا براکوژیی
ئەنجا بڕێکیش شێخە بەتاڵە     کە دەوریان ئەڵێی دەوری جەجاڵە

دەم بە هەیاهوو، دڵ لە حەق غافڵ     بە سەربڕینی حەق بە دەس باتڵ
ئەوەندە دەرچوون لە ڕێی شەریعەت     بە نێوی وەجد و حاڵی طەریقەت
ئەوەی پێی بڵێن طەریقەی ئەبڕار     قاتییە لایان وەك صەفای ئەنوار
بەهەرحاڵ گلەم لە پاشێخ کەمە     عەوامە و عەوام لە دەوری جەمە
ئەگەر هەڵەش بێ چونکە عەوامە     قەیناکا، کە ئەو بۆ دین نەفامە
بەلام بۆ کەسێ بڵێ من زانام     لە شەرع و حەدیث لە تەفسیر ئاگام
حەیفە نەزانێ حەقیقەت کامە     وەك داشە هارەی سەر تەختە دامە
پەلامار بدا لە راس و لە چەوت     کەس نەپارێزێ هەرچێکی بەرکەوت
تا بڵێن کاکەم ئەهلی تەوحیدە     کەچیی نازانێ جێگەی وەعیدە
حەدیثی قودسیی بە (مَنْ عَادَى لِي     وَلِيّاً) بەسە بۆ دژی وەلیی
هێشتا بەو حاڵەش بە خۆی مەسروورە     ئەگەر عەوام با ئەموت مەعزوورە
بەلام کە زانا وەك دوڕناسی چاك     فەرقی خراپی نەکرد لەگەڵ چاك
بە کام روو بە خۆی ئەفەرموێ مەلام     هەتا ئەو وابێ خۆزگەی بە عەوام
شەجەرەی طووبای نیسبەتی خاتەم     واتە پەیوەندیی ئەو لەگەڵ عالەم
بە رەبطی رووحیی و کنووزی ئەسرار     بە بەردەوامیی فیووز و ئەنوار
کە ئێستاش وەك رۆژ دیارە ئاساری     بەحرەکەی سینەی میشکاتی ساریی
وەك پەڵەی بەهار بێتە سەر گوڵان     ئەبارێ لەسەر مەزرەعەی دڵان
تۆ کە خۆت نەیکەی دەرکی ئەم نوورە     ئەمری واقیعییت بۆ لەلا دوورە
بە چاوی ئینصاف هەڵبڕە چاوت     بڕوانە خۆت و بەرهەمی ناوت
من دڵم بۆ تۆ ئەسووتێ، کاکە     ئەنا حەقیقەت لە تۆ بێباکە
تۆ ببی و نەبی، وەعدەی خودایە     نیسبەتی حەزرەت هەتا هەتایە
نابڕێتەوە و هەر بەردەوامە     فەزڵی خودایە و خەلاتی عامە

تۆ کە ناتەوێ بەشت تێکەوێ
بە دوو قاڵ و قیل کاکە چیت ئەوێ

بەتەمام ئەگەر زڕە و سەدای زەنگ
لە پەیکی ئەجەل لێم نەیێتە دەنگ

لە کتێبێ تردا بە شێوەی پەخشان
بە بەڵگەی نصووص حەدیث و قورئان

باسی ئەولیا و تەصەووف تەواو
بە بەربڵاویی بیخەمە بەرچاو

بەڵام لێرەدا ئومێدم وایە
نەڵێن ئەم باسە وەك (مُعَمَّی)یە

ئەوانەی لەسەر دڵیان گرانە
نێوی لێ نەنێن وەهم و ئەفسانە

قەڵەم نەکێشن بە نووسراوەکەم
کامی ئیشکالە، فەرموو چاوەکەم

منیش نەمێنم، هەن پێگەیشتوون
لەم زانکۆیەدا چاك تێگەیشتوون

چونکە ئەوانەی هەڵوەدای یارن
باشی تێ ئەگەن، بە دڵ وشیارن

جا ئەگەر قورسیی باری خەتاکەم
نوقم کا لە ئەرز تاکەی خەتاکەم

ئێوە کە خاوەن هەستێکی چاکن
ئەدیبن، زانان، لە خەتا پاکن

بە چاکەی خۆتان خەتا ببوورن
لەوانەی خاوەن خەتا و قصوورن

لەگەڵ دوعای خێر بۆ حوسنی خیتام
(مِنَّا عَلَيْكُمْ سَلاَمٌ سَلاَمْ)

## باسی چۆنیەتیی حاڵی ئادەمیزاد و بەشداریی ئەو لە ژیانی خۆی و گەلیدا بەڵام زیاتر ڕووی قسەم لە برای کوردی بەڕێزە

کوردە هەژاردی سەر حەسیرەکەم
ماف خوراوەکەم، برا ژیرەکەم

بڕبڕەی پشتم لە هەرکوێ کە هەی
گوێ بگرە لە من، بە قسەی دژ نەکەی

هەر من دڵسۆزی خەڵکی وڵاتم
هەر من بە راسیی دۆسم، براتم

من لە خەڵك زیاتر دڵم بۆت دێشێ
لە کوردی پەتییم، دڵت نەیێشێ

خەڵك ئەگەر وتی من تۆم مدبەستە
لە ژێر مەبەستی سەدان مەبەستە

ئیشی بە خۆتە یا بە وڵاتت — لە نەکاو ئەبڕێ ڕەگی حەیاتت
من بەبێ مەبەست مەبەستم تۆیە — چونکە ئاواتم سەربەستیی تۆیە
بۆ دین و دنیات خەمت بۆ ئەخۆم — بە کز بتبینم وا ئەزانم تۆم
چونکە تۆ لە خۆم، بۆ خۆشم لە تۆ — ئەزانم بە دڵ، بە ڕاس بێ درۆ
شەرتە تا ماوم من تۆم مەبەست بێ — بەو مەرجە هەستی ئێمەت نەگەستبێ
هەر نەبێ نەچی دژمان بوەستی — چونکە ڕێی شەرتی برایی ئەبەستی
ئێمە ئەندامی یەك گیان و لەشین — ئەگەر بەشدارین ئەگەر بێبەشین
جا مادام لق و بەری دارێ بین — وا چاکە گشتمان لەسەر بارێ بین
چونکە یەك باریی گەلێك پێکەوە — وەها ئەبەستێ لێك نەبێتەوە
هەروەك دنیامان مەبەستە بۆ ژین — دەبا پێکەوەش تێکۆشین بۆ دین
چونکە ئەم دینە یاسای خودایە — کە تۆ بوونیشت لە دەس ئەودایە
با لەو داوا کەین بەرزیی و نزمییمان — تا بۆ لەمەودواش نەبین پەشیمان
بیرکەوە لە خۆت، هەویری لاشەت — لە فکر و هۆشی پڕ هاشە و پاشەت
کە تۆ هەرچیی بی هەر ناتەواوی — چونکە بە دەستی خۆت نەخولقاوی
هیچ نەقصێك لەمە ناقیص تر نابێ — تەنانەت بوونت لە دەس غەیرا بێ
تۆ لە بوونی خۆت بێ ئاگا و تەئسیر — بزانە بوونی خۆت قەت دێتەوە بیر
کە تۆ نە بوونت نە نانەبوونت — نە خەو نە خواردن نە هاتوچوونت
نە گەشەی نەشەی دەورانی گەنجییت — نە لەڕیی و کزیی و پیریی پڕ ڕەنجییت
نە خۆشیی و شادییت نە نەخۆشینت — نە ساغیی لەش و هێزی بەتینت
نە برسیی و تێریی سك و دەروونت — نە ژین نە مردن نە زیندووبوونت
نە دەوڵەمەندییت نە فەقر و فاقەت — نە ڕیش و قژ و سمێڵی باقەت
هەروا نە هەست و هۆشی تەواوت — بیستنی گوێت و بینینی چاوت

یا تامی دەمت بۆ تاڵیی و سوێریی     حیسسی ویجدانییت، سەد کە تۆ کوێری
لە عیلم و زانست دەرکی حەقائیق     لە بۆنی گوڵ و لالە و شەقائیق
هەروا پێنج هێزی نهێنییت مەگەر     بە نەزم و تەرتیب لەنێو کاسەی سەر
تۆ بەدیت هێنان! یا لەخۆوە بوون     یا بە ئیشارەی رەمزی کاف و نوون
یاخۆ هاتوچۆی هەناسەی دەمت     نیشاطی رووحییت یا باری خەمت
جوانیی ئەندام و رێکیی قامەتت     خۆت و ویژدان و رۆژی قیامەتت
بۆ کام لەوانە خاوەن تەئسیری     ئەگەر راس ئەکەی پیاوێکی ژیری
هیچی بە دەستی تۆ نەخولقاوە     ئەمانەت یەکێ تر بە تۆی داوە
کەوابوو نابێ تۆ کەس نەناسی     کە ناسیت ئەبێ خودا بناسی
بێجگە لەو نابێ کەس بۆ پەرستن     باقیی مەخلووقن بێهێز و پەستن
بۆ کرنووش لە ئەو هاتوویە گۆڕێ     لەو یاخیی نەبی، خۆت لێ نەگۆڕێ
نەڵێی من خاوەن عیلم و فەلسەفەم     بە عەقڵ و زانست قەزاوەت ئەکەم
هەر خۆم رۆژبەڕۆژ ئەڕۆمە پێشێ     تەرازووی عەقڵم عالەم ئەکێشێ
هەرچیی سەربەسەر دەرچوو کێشانەی     بە میزانی عەقڵ گەز و پێوانەی
ئەوا ئەزانم ئەمیان تەواوە     هەرچی دەرنەچوو ئەیخەمە لاوە
واتە بە حوکم و یاسای سەماویی     یا وتە و واتەی فلانە (ڕاوِي)
خۆم خەریك ناکەم ئاخۆ چ باسە     چیم بە چاك زانی هەر ئەوە خاسە
تۆ چی ئەزانی لە خۆت بێ خەبەر!     سەرت لە هێلکە چۆن هاتۆتە دەر
بیرکەوە لە خۆت بزانە چی بووی     قەترە ئاوێکی رووت و پەتیی بووی
لەکوێ، بەکوێدا چوویتە نێو رەحەم     بووی بە چڵك و خوێن بۆ پلەی یەکەم
جا بووی بە وڵمە گۆشتێکی ناساز     بێ ئێسقان و پێست، بێ گیان و لاواز
پاش تەواوبوونی شێوە و ئەندامت     گیان کرا بەبەر لاشەی بێ فامت

خەبەرێك نەبوو لە عەقڵ و هۆشت     لە ناو مەشكۆڵەی قێزەون پۆشت
ئەگەر بەو حاڵە ئەهاتیتە دەر     وەك ئێستە ئاوا ئەبووی بە بەشەر!
یا فڕێ ئەدرای لەنێو زبڵگا     بۆ هەتا هەتا ناوت نەئەما
براکەم هێزی (خَلْقُ الْخَلاَئِقْ)     نەخشی نەقاشی (أَحْسَنُ الْخَالِقْ)
گیانی کردە بەر لاشەی داکەوتووت     جموجۆڵ کەوتە ئەندامی مردووت
پەروەردەی کردی تا ئەو بناسی     زۆر حەیفە لادەی لە ڕێگەی راسیی
پەردەی تاریکیی جەهل و نەزانیی     لەسەر لابردی بۆ خووی ئینسانیی
خۆت لە خۆتەوە نەبووی بەو پیاوە     بۆچیی ئاوا زوو خۆت لێ گۆڕاوە
دەرکی هەموو شت بە چاك یا خراب     بە عەقڵی ئێمە چۆن دێتە حیساب
عەقڵی من و تۆ وەکو خۆمانە     ئەویش مەخلووقی خودای خۆمانە
قووە و هێزێکە وا لە دەماغدا     یا لەناو دڵی بەهۆش و ساغدا
واتە بەشێکی بچووکە لێمان     هەست بە شت ئەکا بوونی ئەو پێمان
خۆ زانیت خۆمان چەن ناتەواوین     دەی چۆن خاوەنی عەقڵی تەواوین!
بەشی ناتەواو هەر ناتەواوە     بەڵام زۆر و کەم فەرقی خراوە
زۆرەکەش نیسبەت بەو کەمە زۆرە     ئەنا بە راسیی کەمە و بێ زۆرە
جا کە تۆ نەبووی، بەو جۆرە هاتووی     بۆ بە گژ دەستی قەزادا داچووی
دەم لە دەم مەدە لەگەڵ قەزادا     سەری تەسلیمت بێنە بەلادا
خۆت خەرە پاڵی قەڵای رەزاوە     رەزا بە قەزات فەرز بێ لاوە
چونکە هەر شتێ قەزای خودا بێ     بۆ دەم لێدانی من و تۆ نابێ
کەسێ وا نەکا ئەهلی غرووره     نەفامە و لە ڕێی حەقیقەت دووره
با فەیلەسووفی رووی سەر زەویی بێ     یا مەلەوانی فەزای جەوویی بێ
یا بە ئۆکسیژین لە ژێر دەریادا     پەنجە لە پەنجەی دووڕی یەکتا دا

یا داوێن پڕ کا لە لەعل و گەوهەر		بووە نموونەیەك لە عیلم و جەوهەر
لای خاوەن عەقڵی سەلیم و بەجێ		رەنجی بێ‌سوودی ئەو بە چی ئەچێ!
با سوودیشی بێ بۆ گرۆی بەشەر		باری ئاڵتوونە و بارەبەری کەر
دەی باری ئاڵتوون بۆ کەری فەقیر		بۆی‌کە بە رەشمە و هەوسار و زنجیر
یا بە کورتان و سەرکورتانەکەی		لەگەڵ سەرتەنگە و ژێر کورتانەکەی
هەمووی بە ئەتڵەس یاخۆ بە حەریر		وەك زین و بەرگی پاشا یا وەزیر
برازێنەوە بە وەستای کاشان		بیخە سەر پشتی و بڕوانە پاشان
چی پێ زیاد ئەکا ئەو بێ‌زمانە		بەو رازانەوەی لا مل و شانە
سەد کەڕەت بڵێی ئەسپی حدوودە		ئەو حاڵە بۆ ئەو بێ‌کەڵك و سوودە
ئاخۆ فەرق ئەکا کەری بێچارە		ئەمڕۆکە لەگەڵ دوێنێ ئێوارە
هەر بەو شێوەوە بیبە بۆ مەکە		کە هێناتەوە هەیهەی[٢٤] لێ مەکە
ئەو هەر خۆیەتی، تۆ بە هەرچی‌کەی		هەزار جار باڵ و کلکی قەیچیی‌کەی
من ئەم میسالەم بۆ کافرانە		تەشبیهم کردن بەو بێ‌زمانە
چونکە خوا بە ئەم تەشبیهی کردوون		هەر بۆیە منیش وا ناوم بردوون
ئەنا بە رواڵەت ئینسان بەرێزە		با لە باطیندا مردار و دێزە
بەڵام موسڵمان هەر حاڵی چاکە		با خراپیش بێ و دوور بێ لە چاکە
ئەهلی نەجاتە لە سزای سەقەر		بە شەرتی ئیمان هەر ئەیهێننە دەر
کافر با بە دەم دەم لە بەرزیی‌دا		تا حوشتر نەچێ بە کونی دەرزیی‌دا
یا پەتی کەشتیی هاتوچۆ نەکات		بەگوێرەی عادەت (فِي سَمِّ الْخِيَاطْ)
نەجاتی نابێ، ئەمەش مەحاڵە		تەعلیق بە مەحاڵ مەعنای مەحاڵە
واتە هەرکەسێ دوژمن بێ بە دین		ئەبێ بچێژێ عەزابی بەتین
ئەمەش فەرموودەی خودایە، کاکە		دەخیل قەت نەڵێی بە کافر چاکە

شتێ تر زیاتر سەرنج راکێشە      بوون و نەبوونی هۆی رەنج و ئێشە
جا ئەگەر ببێ سکت ئەماسێ      خۆ ئەگەر نەبوو سەرت ئەکاسێ
چ زۆر بێ چ کەم وەك تای تەرازوو      فەرق ئەکەی بە خۆت سا درەنگ یا زوو
ئەویش بە کوردیی پێی ئەڵێن پیسیی      کەچیی هەر ئەوە ماددەی رەئیسیی
هەرکام لە ئەندام گەشە ئەسێنێ      لەو بناوانە نم هەڵئەمژێنێ
بەرهەمی هەموو رەنج و تەقالات      حاسڵی جینس و کووتاڵ و کاڵات
یا نان و ئاوە یا جل و بەرگت      بوونە هۆی فیزت تا رۆژی مەرگت
ئەبن بە پیسیی یا کۆنە پەڕۆ      بە چی بنازین! سا من بم یا تۆ
جا کەسێ ژینی ئا بەمانە بێ      سکی هەمانەی ئەو شتانە بێ
چۆن ئەبێ فیز و دەمار کا بەمە      بۆ ئەمە خۆی کا بە مامە خەمە
لەگەڵ ئەوەشدا بڵێی نابێ کەس      بەرامبەر بە من هەڵکێشێ نەفەس
ئەبێ هەناسەی لەنێو گەروودا      خەفە بێ و بڕوا بە چاڵی موودا
ئاخر تۆ ئەبێ بە چی بڵێی من      برام هەر منیی لێت بوو بە دوژمن
منیی بوو بە هۆی لە خۆ دەرچوونت      نەتزانی مانای بوون و نەبوونت
هەر منیی نەیهێشت خودا بناسی      منیی تۆی دەرکرد لە رێگەی راسیی
بە هۆی منیی بوو هەوای ئاغایی      دای لە دەماغت، لە خۆت بووی بایی
منیی دەردێکە زامی کارییە      بەڵام بە زاهیر نادیارییە
ئەسپێکە سەرکێش ئەتبا بەرەوژوور      تا دەرت ئەخا لە حەدد و سنوور
هەڵت ئەدێرێ لە شاخ و هەڵەت      هەست ناکەی بە خۆت بە فکری هەڵەت
پیاوبە هەر منیی بە گژ (من)دا کە      کەللە شەقیی (من) بە تۆتیا کە
تا شوێنەواری (من) لە تۆدا بێ      تۆ بە تۆ نابی باوەڕت وابێ
هەر تۆتۆ ئەبێ ئاخی دەروونت      تێك ئەدا هێز و هەستی زەبوونت

نه خۆت به ئاغا و میر و خان ئەکەی
نە دەردی گەلم بۆ دەرمان ئەکەی

ئەبی بە درك و ئەچی بە پێدا
نایەڵی خۆشیی لە شار و دێدا

یاخۆ خراپتر ئەبی بە نشتەر
ئەبی بە زام و ناسۆری خەنجەر

وەك ئێستە خۆمان ئەبینین بە چاو
بەرهەمی منییت خوێنە بە لافاو

بۆ براکوژیی گشت شێرە کوڕن
لەجیاتی دوژمن یەکتر ئەدڕن

بۆ بە خوێنی یەك زەویی ئەکەن شین!
ماڵێکتان نەهێشت پڕ نەبێ لە شین

ئاوایە حاڵی منیی و تۆتۆیی
ئاوا چۆن ئەگەن بە سەربەخۆیی

تا منیی لە تۆ تۆی بێگانە بێ[٢٥]
دووربینی هۆشت پێچەوانە بێ

تا تۆ (من) ببێ بە تانەی چاوت
نەیەڵێ هەست کەی بە خۆت و ناوت

فیز بە چی ئەکەی! بە چی مەغرووری
تا کەی لە شێوەی خۆ ناسین دووری

بیرکەوە کاکە، بەرهەمی ژیانت
کەی جێگەی فیزە، عەیبە بۆ شانت

تا تۆ ژیانت بەمانە بەندە
بزانە نرخ و قیمەتت چەندە

بۆ ئەم بەرهەمە خۆدان بە کوشتن
یاخۆ بە ناهەق خوێنی خەڵك ڕشتن

لە جێی بەزەیی و ڕەحم و عاتیفە
تەقەی ئاربیجی و ڕەقەی قازیفە

کەی ئەمە شێوەی شعوور و هەستە
ئەگەر بە راسیی گەلت مەبەستە

برا هەرچی بێ، برام برایە
کەی ئەرکی برا بۆ برا وایە

تۆ تاقەتت بێ تا دژ لا ئەبەی
ئەوسا بە مەیلی خۆتی لێ ئەکەی

ئەرکی گەل و خۆی پێ ئەناسێنی
بەو مەرجە ئێستە خوێنی نەڕژێنی

دوژمنایەتیی نەبەی بە دڵدا
لەبەینی هۆز و گەل و کۆمەڵدا

بێ زەحمەت پێدان بیکە بە دڵسۆز
بۆ خەبات گێڕان وەك لاوێکی قۆز

خۆ ئەگەر هات و دژت نەفەوتاند
تۆش تۆوی دژییت لەنێو گەل وەشاند

بەم براکوژییە دوژمن لا نەچوو
دەستیشت لە ژێر هەمانە دەرچوو

قەدیمی ئەڵێن هەر بە زەمانی خۆش
مار دێنێتە دەر لە کون خاوەن هۆش

ئەگەر هەر هات و زۆر نارەسەن بوو
تۆ بگرە پووشێ لە کایێن کەم بوو

فەرزکە تەنیا ببێ بە ئاگر
کێ ئەسووتێنێ ئەو لە خۆی زیاتر

ئاوایە مانای برایی، برام
گوێ ئەدەی بیدە نادەی (وَالسَّلامْ)

## هەرچەند تەمەنی ئادەمیزاد لە راستییدا چاونووقاندنێکە بەڵام بزۆزییش شتێکی سروشتییە بۆی

خۆ هەرچەند هەرکەس هاتە دنیاوە
هەر ئەکەوێتە داوی فەناوە

چاک بێ یا خراپ بەو داوە گیرە
جا خۆزگەم بەوەی کە تۆزێ ژیرە

قەت خودای لەبیر ناچێ لە ژینا
کەمتەرخەم نابێ هەرگیز لە دینا

چونکە هەرچی هات هەر ئەبڕێتەوە
کەس لە دنیادا ناحەسێتەوە

ئەم دنیا بۆ کەس هەتا هەتایە
دەس نادا، هەرگیز نابێ بە مایە

لە خەلقی عالەم هەتا نەفخی صوور
چی هاتۆتە دیی لە خوار و لە ژوور

بە هەر شێوەیەك لێرە تێکۆشێ
ئەبێ شەرابی مردن بنۆشێ

هەر هەوڵێ بیدا هەمووی کاتییە
تەمەن یەك ئانە ئەوەی راستییە

چونکە تا خەوتووی لە خۆت بێ ئاگای
نازانی بە خۆت گەدای یا پاشای

نە شادیی و خۆشیی نە خەم نە خەیاڵ
نە تاڵیی و سوێریی نە خەفەت نە حاڵ

نە ماڵ نە مناڵ نە خۆت و نە کەس
نە مەیل نە ئاوات نە هەوا و هەوەس

نایەتە بیرت کە تۆ چی ئەکەی
تەنانەت نەفەس چۆن دێنی و دەبەی

کەوابوو ئەمەت بەبێ خوار و ژوور
نە ژینە و نە مەرگ بەگوێرەی شعوور

ئەو کاتەش کە خۆت بێدار ئەزانی
ئەگەر بە وردیی برێك بڕوانی

ئەزانی کە ژین یەك لەحزە بوونە
بەر و دوا هەمووی لەسەر نەبوونە

چونکە رابردوو رۆیی و تێپەڕیی      بە چاکە بووبێ یا بە بێ فەڕیی
وەزعی داهاتووش کە نادیارە      کەی لەسەر ئەمەن دێتە ژمارە
کەوابوو ئەمەن نەفەس دانێکە      رۆزییش لە دنیا لوقمە نانێکە
ئەوەی خوراوە تازە ئەوا چوو      بە تۆ چی رزقی لەمەولا هاتوو
خۆ ئەگەر هات و بەویش گەیشتی      ئەویش هەروەك ئەم حیسابە گشتی
بە نان و ئانێ توو بە چی ئەبی!      بۆ ژینی ئاوا ببی یا نەبی
چونکە هەر ئەڕوا ئەم نان و کاتە      هەر نەبوونییە و ناوی حەیاتە
بەڵام بەو حاڵەش بەشەر بزۆزە      لەبۆ تێکۆشان دایم بەسۆزە
هەتا ئەگاتە سنووری ئاوات      بەپێی توانا هەرگیز کۆڵ نادات
یەکێ بۆ ماڵ و بۆ جاە ئەکۆشێ      یەکێ بۆ دین و خودا ئەجۆشێ
یەکێ بۆ سوودی فەردیی رۆژ و شەو      خۆی لە چاوی خۆی حەرام ئەکا خەو
یەکێ بۆ قەسر و قوسووری تازە      دەماخی بەرزە و نیشاطی سازە
یەکێ دەروونی کوویەی شەرابە      تەنیا سەرخۆشیی لەلا حیسابە
یەکێ گێژەی داوی هەوایە      دنیا و (مَا فِیهَا)ی بەلاوە بایە
هەریەك بە رەنگێ هەوڵ ئەدا بۆ خۆی      بگا بەو شتەی کە ئاواتە بۆی
یەکێتر بەرگی مەینەت ئەپۆشێ      لەپێناوی گەل زووخاو ئەنۆشێ
پڕ بە دڵ پلەی بەرزیی غیرەتی      ئەکا بە مایەی خۆشیی میللەتی
واتە تێکۆشان بۆ گەل و هۆزی      بە چاك ئەزانێ و بە هۆی پیرۆزی
بەڵێ بێگومان پیاوی پیاوانە      هەمیشە ناوی لەنێو گەلانە
هەرکەس ئەستێرەی بەختی بوو یاری      لاپەڕەی مێژووی بۆ خۆی کرد دیاریی
هەر ئەوە پیاوێ بەهۆش و ژیرە      کە دایم خنەمی گەلی لەبیرە
وەك شێری مەیدان هەڵمەت دا لە خۆی      نەك بە دەمبازیی هەر بۆ سوودی خۆی

هـۆی بەختــەوەریی دوارۆژێکــی چــاك بــۆ نیشــتمان بــێ، مەردانــە و چــالاك
نــاعیلاج ئەگــەر هیچــی لــێ نەهات زیانیشــــی نــــەبێ بــــۆ گـــــەل و وڵات

## با بڵێم وەك خۆم

مــن کــە شــتێکم نەخســتە بەرچــاو لە خێڵ دواکـەوتم، لـە گـەل بـەجێماو
بەڵام هەر کوردم، بـە کـوردیی ئـەمرم تــا دائــەمرکێ کڵۆکــۆی ســەبرم
خــۆ کــە سوودیشـم نــەبوو بــۆ وڵات زیانیشــم نــەدا، بــە گیــانی بــرات
لــە دوژمنــی گــەل دایــم قیــنم بــوو بەرزیی و نزمیی ئەو شایی و شینم بوو
تــا دژ بــەم نــاوە دەس کــا بــە دژییم دە شەرتبێ منیش بە کـوردیی بـژیم
چونکە بە کـوردیی مـن لـەدایك بـووم دایکم بە شـیری خـۆی گۆچـی کـردووم
بــە لایەلایــەی ئــەو بــوو نیودشــەو گـرینم ئەسـردەوت، چـاوم ئەچـۆ خـەو
بە زمانەکەی خـۆی واتـە بـە کـوردیی قسەی فێر کردم بـە نـەرمیی و وردیـی
هــەروا گاگۆڵکــەم لەگــەڵ پــێ گــرتن لــــە دارەدارەی ئــــەوم وەرگـــــرتن
هــەر لــەو کاتــەوە بــە رۆژ و شــەوم ئێستاش مەمنوونی پـەروەردەی ئـەوم
ئــــەنجا بـــاپیرم بــــە نــــوقڵ و پــــارە وتــی پــێم جزمــی (عَــمَّ)و سـیپارە
هەروا نەحو و صەرف، شتی جۆرجـۆری لەلای ئەو خوێندم، رەحمەت لـە گـۆڕی
پــاش ماوەیــەك چــووم بــۆ قوتابخانــە لەمــدیو بــۆ ئــەودیو بــەپێی زەمانــە
هــەر مامۆســایەك، فــەرموویان چــاکە دەرســی بەکەڵکــە و نفووســی پاکــە
چــوومە خزمــەتی بــەگوێرەی مــەجال لە هەریـەك بـڕێ عیلمـی قیـل و قـال
بــوو بــە زەخــیرەی خەزێنــەی خــەیاڵ خوێندنم تەواو کرد بـە سـەد حاڵـەحاڵ
هەرچـیی وەرمگــرت لــە مامۆسـایان هەر بە کوردیی بـوو دەسـکەوتم لایـان
جــــەزا دانــــەوەی ئــــەو بەرێـــــزانە حەواڵــەی لــوتفی خــودای مەننانــە

کــێ خـاوەن تـەقوا و ئـەخلاقی چـاکە     بۆ خۆی بەڕێــزە و بـۆ گـەلیش چـاکە

## هۆی نرخ و سوودی هەر فەردێك بۆ پاشەڕۆژی خۆی و گەلەکەی چییە؟

ئەگــەر ئەتــەوێ نرخــت زیــاد بــێ     بەر لە هەموو شـت خـودات لـەیاد بـێ
وا بگــرە[٢٧] دایــم لــە دەنگوباســت     لە چەوت و هەڵەت، لە ڕێگـەی ڕاسـت
لــە هەرچــی هەیــە لــەم جیهانــەدا     یــاخۆ ڕوو بــدا لــەم زەمانــەدا
لــە عیلمــی خــودا ناشــارێتەوە     لقــێ گیــا بــێ ئــەو ناداڕێتــەوە
شت لەو ون نابێ، گشت دێتـە حیسـاب     (لاَ رَیْــبَ فِیــهِ ذٰلِــكَ الْکِتَــابْ)
هەرکـەس لـە دڵدا ئـەم حیسـابە کـا     دەسـتی بـۆ ناچـێ قـەت خراپـە کـا
چــونکە ئــەزانێ صــووڕەت و لاشــە     هــیچ نیــە، تــەنیا هــەر چـاکە باشــە
نرخــی بنیــادەم خولــق و کــردارە     زانینــە و هونــەر چــاکیی ڕەفتــارە
نــەك بــە دیمــەن و لــەش و قــەوارە     ئــەنا گیانــداریش لــەما بەشــدارە
ئــەوانیش هــەموو خــاوەن شــعوورن     بــەڵام لــە کەسـبی مەعریفــەت دوورن
بۆیــە ئــەو بەشــەی بــەوان بــڕاوە     هــەر منداربوونــە و ســەری بــڕاوە
کــەوابوو بــڕای لــە ڕێ تــرازاو     بـا بەسـبێ شـێوەی ئینسـانیی بـەناو
پیـاو ئـەبێ پیـاوی دیـن و دنیـا بـێ     هەوڵی بـۆ گـەلیش لـەم دوو ڕێـدا بـێ
واتــە گــەل خاتــە ڕێبــازێکی وا     لەگـەڵ ڕەزای خـوا بـە مەقصـەد بگـا
خۆشـی وا لـێ کـا کـە بـۆ سـەرۆکیی     گــەل بــڕۆن خۆیــان بگــرن بــەرۆکی
تــا ســەربەرز بـێ لــە هــەردوو لاوە     ببینــێ کــە گــەل بــە ئــەو حەســاوە
جـا پیـاوی ئـاوا ئەگـەر دەس کـەوت     گــەلیش دەوری دا ئــەوا ســەرکەوت
چــونکە بێگومــان ئەگــەر وا نــەکا     نەك هـەر بـێ نرخـە، بـە سـزاش ئـەگا

ئەوەی لێ ئەدا لافی بەرپرسیی     ئەبێ لە دوارۆژ بیبێ مەترسیی
هەر لە ئەوەڵ رۆژ بیر کا لەمانە     باری بەرپرسیی باری گرانە
ئەوانەی وا نین، کە واش ئەزانن     هۆی چارەنووسی گەلان ئەوانن
زۆر هەڵەن، خۆیان دائەنێن بە هۆ     هۆیی لەگەڵ دین جێ ئەگرێ بۆ تۆ
جا مەگەر بڵێی کە هۆی خراپەم     گوێ بە دوارۆژی خۆم و گەل نادەم
کە واش بووی یەقین نەبوونت چاکە     حاشا لە خۆت و لە هۆییت، کاکە
چونکە تۆ کە خۆت بە هۆ بزانی     پێویستە ئەبێ ئەمەش بزانی
ئەم هۆیەش بێ هۆ ناگا بە سنوور     هەروا هۆ بە هۆ برۆ بەرەو ژوور
تا لە هۆیەکدا ئەوەستێتەوە     رشتەی هۆت لەیەك ئەبەستێتەوە
بەبێ شك ئەویش ئەبێ زانا بێ     خاوەن ئیرادە و هێز و توانا بێ
بۆ ئەوەی بوون و نەبوونی هۆکان     بتوانێ ببرێ بە لایەك بۆمان
چونکە بوونی شت لە نەبوونەوە     نابێ بێ دەلیل بێتە بوونەوە
جا ئەو کە بوونی لەسەر نەبوونی     زاڵ کرد، نەبوونی ناکرێ بوونی[٢٨]
خۆ ئەگەر هات و پێچەوانە بوو     تازە بوونی تۆ و هۆییت وا نەبوو
حاڵیش لەم دووە نابێ بچێتە دەر     خۆ هەڵەکردن لە قەزا و قەدەر
هۆی نەزانینە نەك زانیاریی     دەس نادا بۆ تۆ لێرە فیل سواریی
بەڵام لێرەدا شتێ تر ماوە     ئەویش پێی ئەڵێن بەسراوە و براوە
واتە قەزای شت یا (مُعَلَّق)ە     یاخۆ (مُبْرَم)ەو ئەمری موتڵەقە
لەو بەسراوەدا ئێمە بەشدارین     بە بوون و نەبوون خەریکی کارین
بەپێی عادەت و هێز و لێزانین     هەوڵی بۆ ئەدەین هەتا ئەتوانین
جا ئەگەر شتێ هاتەجێ لەلات     لەو پێ بەسراوە بۆت رەها ئەکات
خۆ ئەگەر هات و بۆت نەهاتە جێ     پێوە بەسراوی نەهاتۆتە جێ

ئەبێ لەو جێدا هەر نیشتەجێ بێ    تا کاتی خۆی دێ جێگای ئەوێ بێ
کاتی ئەو کاتەش بە دەس خودایە    ئەرکەکەی ئێمە هەر تەقالایە
تا ئەو لە ئەسڵا لە سارای عەدەم    تەرجیح نەدا بۆت وجوود یا عەدەم
بۆت دروس نەکا ماددەی رەئیسیی    بە چاو نەیبینی و بە گوێ نەیبیسی
چۆن دێتە وجوود بۆ تۆی بێ وجوود!    بنچینەی ئاوات، خەزێنەی مەقصوود
ئەوەش کە دێتە مەعرەزی وجوود    لە یەك ملیۆنم یاخۆ نا مەحدوود
عەقڵ و خەیاڵت ناچێ بەلایا    تۆ چی و مامەڵەی (كَشْفُ الْبَرَايَا)!
ئەوەی بەرهەمی دەستی ئینسانە    تەنیا تەجرەبە و تەرکیبە، گیانە
ئەمیش هەر بە ئەو ئەگا بە بەرهەم    من و تۆ ئەسڵەن نە زۆرین نە کەم
(مُبْرَم)یش مانای براوەتەوە    مەجال بۆ هیچ کەس نەماوەتەوە
لە عیلمی خوادا چۆنە وا ئەبێ    بە بوون یا نەبوون، نابێ وا نەبێ
جا ئێمە لەمدا بەقەد ئەم دوورین    لێرەدا ئێمەی بەشەر مەعزوورین
ئەمری تەکلیفیی لێرەدا نیە    مەقام مەقامی ئەمری حەتمییە
هەر ئەمرێ لە ئەو دەربچێ بۆمان    فەزڵە یا عەدڵە، سا بەختی خۆمان
ئیتر نابێ کەس دەم بدا لە دەم    (تَمَّتِ الْقِرْطَاسْ[٢٩] هَا جُفَّ الْقَلَمْ)
خودا خۆیەتی هۆی ئەسڵیی و راسیی    جا ئەو کەس ژیرە هۆی ئەسڵیی ناسی
هەست ئەکا ئەوەی خاوەن شعوورە    راستە کە وایە و لە (جَبْر)یش دوورە
بەڵام درێژەی ئەم باس و دەنگە    لەم چەند دێڕەدا مەجالی تەنگە
لە جێگەی خۆیا باسی کراوە    رێی قسە و رەخنە بۆ کەس نەماوە
من پیاوی ئاوام ئەوێ بۆ خەبات    نەوەستێ هەتا گەل ئەدا نەجات
ئەوسا ئەتوانێ بڵێ من پیاوم    خاوەنی هێز و هەستی تەواوم

* * *

## لێکۆڵینەوەیەك لەسەر ئەدەبی تازەی برێك لە ئەدیبانی کوردی هاوکات
## کە خۆیان وا ئەزانن بەرهەمێکی گرنگ و بەنرخیان
## پێشکەشی گەل و کۆمەڵ کردووە

هەروا ئەوانەش ئەدیبی گەلن　　چاوەڕێی کات و دەرفەت و هەلن
بۆ خزمەت بە گەل زەحمەت ئەکێشن　　زانا و ئەدیبن، بەرز و لەپێشن
هەست و مەبەستیان یاسای گەلانە　　ڕێز و جێگەیان لەنێو دڵانە
خەریکی نووسین، قەڵەم بەدەستن　　نووسەرن بە ڕاس، خاوەنی هەستن
بۆ شوێنەواری گەلی چەوساوە　　هەوڵ ئەدەن بە دڵ لەملا و لەولاوە
تا ئەوەی مردووە زیندووی کەنەوە　　زیندوو لە مردوو وەدەس خەنەوە
ئەوەش کە ماوە و پەرش و بڵاوە　　لە تاقە و دۆڵاب فڕێدراوە
هەوڵ ئەدەن دایم کۆیان کەنەوە　　تا ڕێز و پێزی خۆیان دەنەوە
لەگەڵ بەرهەمی بیر و ڕای خۆیان　　تا ئەو جێگایەی مومکین بێ بۆیان
پێشکەشی گەل و کۆمەڵی ئەکەن　　تا لەگەڵ خۆیان بۆ گۆڕی نەبەن
ببێ بە حەسرەت بۆ خۆیان لەو جێ　　لە دەس ئەوان و لە دەس گەلیش چێ
لەنێو قووڵایی دڵمەوە، گیانە　　سوپاسم تەقدیم بەو ئەدیبانە
بڕێکیش لەوان بە مێژوونوسیی　　تەقالا ئەدەن بۆ چارەنووسیی
بە ڕاسیی گەلێ جێگەی تەقدیرن　　قەت لەبیر ناچن، جوان و دڵگیرن
بڕێکیش لە ڕێی فۆلکلۆریدا　　زاڵ ئەبن بەسەر بەشی زۆریدا
بەڵام بەشداریی بڕێ لەم کۆڕە　　نەك هەر بێسوودە، زیانیشی زۆرە
یاسای سروشتیی گەل بێ پێز ئەکەن　　ڕێزی یاساکەی پێ بێهێز ئەکەن
بۆ وێنە بڕێ بەیت و باڵۆرە　　لەنێو ئەمانەدا زۆر باوی زۆرە

بیرکەود لە خۆت کاکی هونەرمەند / رەقسو سەرچۆپیو خەجێو سیامەند[٣٠]
بەناوی شایی رەش بەڵەك تێکەڵ / ئەم لەکوێ و حاڵی ناسر و مامەڵ!
بە حەقلەمەقۆ و حیلکە و هەڵپەڕین / چۆن رێ ئەکەوێ عەشقی مەم و زین
ئەمانە لەنێو مێژووی دڵداران / جێیان پێ مەدەن دەخیل هەی یاران
بڕێ لەمانەی بۆ گەل خەلسیون / بە واتەی کوردیی هەتیو مەتیون
ئەگەر مەبەستی دڵە و دڵدارە / عەشقی دەروونە و دیتنی یارە
کوڵی دڵی خۆی بەبۆنەی یاری / ئەڕژێنێ وێنەی هەوری بەهاری
یاخۆ تەماشای بالآی بلوورە / بەرهەمی ئاهە و فرمێسکی سوورە
یا مەجازیش بێ ئەم (مَجَازِي)یە / شەهیدە، روتبەی لە جێی (غَازِي)یە
بە شەرتی پاکیی لە گشت عەیب و عار / بولهەوەس نەبێ سەرخۆش و خومار
بۆ دڵخوازێکی چاو بە غەمزە و ناز / تۆتۆی پەڕەی دڵ پڕ بکا لە راز
بە کوورەی سینە و هەناسانی سەرد / بێتە دەر، لە دوور بۆی نەرم کا بەرد
تا وێنەی فەرهاد لە کۆی بێستوون / لە بەرد بتاشێ تاقی بێستوون
چونکە مەقامی عەشقی مەجازیی / بەم شێوە بەرزە و پڕ لە شانازیی
بەپێی شەریعەت لە رووی تەحقیقیی / وا لە ژێر سایەی عەشقی حەقیقیی
بۆیە بەشی زۆر ئەدیب و زانا / سەریان لە رێگای ئەم بەزمە دانا
کۆمەڵێ زۆریش بەشی ئەولیا / بە هۆی ئەو ئەمیان بۆ سەهل کرا
واش نیە هەر کچ چرای دڵان بێ / یا بولبولێ بێ و شەیدای گوڵان بێ
یاخود شەمعێ بێ لەگەڵ پەروانە / کە دەستە چیلەی عەشقی دەورانە
هەر دڵێك عەشقی لەیلێ ئەبێژێ / داخی خەمی خۆی بەمان ئەڕێژێ
شەرحی ئەم باسەش دوور و درێژە / چونکە بەزمێکی کۆن و لەمێژە
بە سەدان تێیدا تلاوە / نەگەیشت بە کام، سەری لێ ناوە

رێبازی عاشق سەخت و گرانە
هات و نەهاتە و مان و نەمانە

هەر ئەوەی بەسە ئەو بۆ نیشانە
خەمگینە و لاقەید لە تیری تانە

دەی خۆ ئەوانەی کە جێگەی گلەن
دوور و بێبەشی ئەم کەل و ملەن

ئیتر نازانم بە چی ئەنازن
دایم خەریکی سەمتوور و سازن

بەشێکی زۆری ئێزگە و ئیزاعە
ئیزاعەی ماڵە و کات و بیزاعە

تەنانەت لەگەڵ کەلامی خوداش
تۆماری ئەکەن بۆ پارە و مەعاش

ئاخر تۆ بیت و ویژدانت، برا
دەهۆڵ و زورنا و کەلامی خودا!

ئا بەمەش ئەڵێن دنیای سەقافە
یا خەرافەتە و دەریای سەخافە

باشە هەرچی بن ئەو ساز و بازە
چی ئەکەن بۆ گەل بەم دابە تازە

ئەگەر حەز ئەکەن هەر لە بەیت و باو
بە شێوەی گشتیی مەیخەنە بەرچاو

ئەوانەی خۆیان لە ئەدەب دوورن
ماخولیای دەنگی ساز و سەمتوورن

بە هەوای نەفس و شەیتان مەغروورن
کڕیاری بیرە و شەرابی سوورن

لە جێی نهێنیی چی ئەکەن بیکەن
چی ئەخۆن بیخۆن، چی ئەبەن بیبەن

با دوژمن نەڵێ چی کوردە وایە
بێبەش لە یاسا و دینی خودایە

هەرچەند پێشینان وا ئەکەن ئەدا
چەم بەبێ چەقەڵ نابێ لە دنیا

هەروا بڕێکیش بەشی ڕیازە
بەم شێوە پیسە و ناحەزەی تازە

تیپی وەرزشیی بەشی گۆڵ گۆڵێن
خۆ هەڵنەماڵن تا لای بەنەخوێن

یاخۆ سەیران و رووتیی مەلەی گۆم
تێکەڵیی کوڕ و کچان لەنێو چۆم

بۆ دەس بزێویی لە شیو و دۆڵان
یا لە بەردەرگا و شەقام و کۆڵان

یا مەلەی تێکەڵ لە مەسبەحگادا
بە راسیی حەیای گەلی بە با دا

هەروا سینەما و ڤیدۆ لە ماڵان
خولق و رەوشتی گەلی کرد تاڵان

کە لە راستییدا هەموو زیانن
هەتکی حورمەتی یاسای گەلانن

ئەفەرمووی بەمەش هەر بڵێین هونەر ‌ ‌ ‌ ئاخۆ بێ‌هونەر کامە بێ مەگەر!
بەڵام ئەوانەی ئەدیب و پاکن ‌ ‌ ‌ خاوەنی هەست و بەرهەمی چاکن
خۆیان بە پاکیی بە گەل ئەناسن ‌ ‌ ‌ بۆ هەتا هەتا جێگەی سوپاسن
هەرچەند لەمانیش بەشێکی کەمی ‌ ‌ ‌ ئەڕۆن بۆ مەبەست بە کەمتەرخەمیی
تا لەو شتانەی بۆ گەل بەڕێزن ‌ ‌ ‌ نازانم بۆچی دوورەپەرێزن
گوڵچن لە باخا وەختێ پێ ئەگا ‌ ‌ ‌ هەر گوڵێکی دی دەستی بۆ ئەبا
چونکە هەر گوڵێک کە ئەو ئەیهێنێ ‌ ‌ ‌ بولبولێک ئەبێ لەبۆی بخوێنێ
بەڵام بۆ دڕکی بێ‌نرخ و بەئێش ‌ ‌ ‌ هەتا مومکین بێ دەس ناباتە پێش
ئەو کە مەبەستی پەندی بەسوودە ‌ ‌ ‌ لەوانەی تیری چاوی حەسوودە
ئەدیبی کۆن و تازەی بلیمەت ‌ ‌ ‌ بەرهەمیان زۆرە و بەنرخ و قیمەت
ئەگەر مەبەستی کۆمەڵ و ژینە ‌ ‌ ‌ کۆمەڵی ئێمە ژینی بە دینە
ئەدیبی وامان بە زۆریی ئەوێ ‌ ‌ ‌ کە دین و ژینی لەلا دەس کەوێ
ئەگەر مەبەستی ئەو لە ئەدیبیی ‌ ‌ ‌ ئازادیی گەلە و یاسای نەجیبی
لە ژێر چەپۆکی دوژمن و لە بەند[٣١] ‌ ‌ ‌ کەی تا بەو شێوە شیرینە و پەسەند!
ئەگەر مەبەستی ئازادیی کارە ‌ ‌ ‌ بۆ سوودی چینی رووت و هەژارە
بە رووتیی رووتی بۆ پۆشتە نابێ ‌ ‌ ‌ هەرچۆنی دیو: ئەبێ هەر وابێ
ئەمان بە جێی خۆی، بڕێ تر ئاسار ‌ ‌ ‌ بە نێوی ئەدەب ئەخرێنە بازاڕ
کە لە راستییدا دوژمنی دینن ‌ ‌ ‌ میکرۆبی یاسا و بەرهەمی ژینن
لەجیاتی هەستان بە ئەرکی سەر شان ‌ ‌ ‌ ئەوەی پێی بڵێن ئەدەب بۆ دەرمان
قاتییە ناوی لە نووسراویان ‌ ‌ ‌ چۆن لە کۆمەڵدا هەڵدێ چاویان!
زۆر بەبێ پەروا ئاواتەخوازن ‌ ‌ ‌ بە یاسای شەرقیی و غەربیی ئەنازن
رۆڵەی بێ‌خەتا و دڵپاکی کوردیی ‌ ‌ ‌ لە کوڕ هەتا کچ، گەورە تا وردی

هەڵئەنێن، ئەبەن بۆ ئەو ڕێبازە     بەناوی یاسا و ئازادیی تازە
ئا بەو ئەخلاقە و قیافە و شێوە     کە هەر بە ڕواڵەت ئینسانی نێوە
لەو ڕەوشتەیان وا دەرئەکەوێ     بە ڕاستیی مانای ئینسانیان نەوێ
ڕۆڵەی گەل ئەبەن بەرەو حەیوانیی     پەروەردەی ئەکەن بە خووی شەیتانیی
نێویشی ئەنێن ئازادیی و ئەدەب     بێ‌ئەوەی هەست کەن بە مەعنای ئەدەب
هەستی مەسئوولیی ناکەن لە خۆیان     منداڵی خەڵکیش ئەکەن بە خۆیان
نازانن مانای مامۆساش چییە     ئەرکی ئەو خولقە و حوسنی تەربییە
نەك هەر خوێندنەوەی کتێب و نووسین     چونکە ئەوانەش منداڵی رووسیین
ئا لەم بارەوە پێشکەوتوون تەواو     بەڵێ ئادەمیین بەڵام هەر بە ناو
چونکە باوەڕیان بە هیچ نەماوە     ئینسانیی لەوێ تەنیا بە ناوە
قەیناکا ئەوان لە دین بڕاون     بەلای خوداوە پیس و گڵاون
ئەفەرموێ موشریك پیس و (لَئِیم)ە     هەر کە مرد جێگای ناری جەحیمە
لە ئارەزووی نەفس هەرچی کە نەیکەن     زەرەر لە خۆشیی چەن ڕۆژە ئەدەن
بەناو موسڵمان سەرسووڕهێنەرە     لەو زەلکاوەدا بێ‌شوێن و سەرە
بە خۆشیی ئەڵێ زانا و ئەدیبە     بەلای زاناوە سەیر و عەجیبە
ئەم هەموو یاسای بەرزی ئیسلامە     لەلای ئەو نەزمە و بێ‌نرخ و تامە
لە شەو حەز ئەکا شەمشەمەکوێرە     خەتای ڕۆژ چییە! ئەو بە ڕۆژ کوێرە
بەڵێ قالۆنچە بۆنی گوڵ لەلای     هۆی سەرئێشەیە و بۆگەنی هەوای
تەبعی حەز ئەکا لەنێو پەین و پاڵ     بۆیە نابینرێ لای سوورە هەڵاڵ
جا ئەگەر کاکەم یاسا ئەنووسێ     بۆ لە شتی بەنرخ چاوی ئەنووسێ!
دیارە کە ڕەشیی هەرگیز لە حەبەش     دەرناچێ، کە ئەو خولقاوە بە ڕەش
هەرچەن پێشینان ئەڵێن بەرەو ژوور     تف مەخە بۆ خۆت دێتەوە لە دوور

من خەفەت ئەخۆم وایان ئەبینم     وا گومان نەبەن لەوان بەقینم
بەڵکە حەز ناکەم نرخی ئەدیبان     بێتە خوارەوە لەنێو رەقیبان
کوڕی ئەدیبان کە دێن و دەڕۆن     خەمی داهاتووی نەتەوان ئەخۆن
حەیفە ئەدیبی کوردی بەجێماو     چینی داهاتوو نەخاتە پێش چاو
بە پێچەوانەش هەر لە ئێستاوە     بیخاتە گێژ و مەوجی دەریاوە
هەست نەکا بەوەی کە چی بەسەر هات     کەسێکیش نەبێ دەستی بۆ ببات
دەری‌خا هەروا بڕۆن چین بەچین     وەك داروەدەستەی کاخی کرملین
داخی دەروون و ئێشی ئەم خەمە     وەك سوپای دوژمن لە دەورم جەمە
هەرگیزاو هەرگیز لەبیرم ناچێ     کە گەل بۆ دواڕۆژ ئاوا تیا چێ
هەروا بڕێ تر نامیلکە و کتێب     ئەکەونە بەرچاو زۆر و بێ حسێب
ناوێکیان لە دین تیا نەبراوە     رەنگە وابزانن دین بەیت و باوە
چونکە لە بەیت و بالۆرەکەی وان     ناچێ بەرنامەی بەرێزی قورئان
بۆیە قەت ناچن بەلای دینەوە     شەویش ناخەون بە هۆی ژینەوە
خۆ دین بێ ئەمان پشتی نەشکاوە     بۆ ئەدیبی کورد زۆر ناتەواوە
ئەدیبێك گەلی لە ئاین دوور بێ     خۆشی کە دوور بێ رەنگە مەعزوور بێ
چونکە بێ دینیی نەبێ نەیدیوە     بێ دینیی گەلی دەستی بڕیوە
بێجگە لە یاسای کوفر و جەهالەت     کەس بۆ شتێ تر نەیکرد دەلالەت
بەلام ئەدیبێك بزانێ ئەگەر     گەلی ئەو بە دین ژین ئەباتە سەر
ئەبێ زۆر سەرنج لە یاسای ئەوان     بدا و رووش نەکا بیروڕای ئەوان
چونکە نەك هەر خۆی نرخی کەم ئەبێ     دووبەرەکیشی لەسەر جەم ئەبێ
بێ شك ئەو گەلەی بە دین ژیاوە     دین بە قسەی ئەمان نانێتە لاوە
گەل نەزانیش بێ ئەزانێ کاکە     کە دین بۆ دین و بۆ دنیاش چاکە

ئیتر چۆن له ڕێی چاکه لا ئه‌دا    خۆی به‌ده‌م شه‌ن و باکه‌دا ئه‌دا
خۆی ئه‌کا به کا و تۆزی نێو په‌ڕێز    تێکه‌ڵ بێ له‌گه‌ڵ گژ و گیا و هه‌ڕێز
چونکه دین ده‌رسی ئه‌وه‌ی داداوه    که دین زیانی له گه‌ل نه‌داوه
ئه‌دیبێك که خۆی سه‌رمه‌شقی خه‌ته    نابێ نه‌زانێ قه‌ڵه‌م بۆ له‌ته
له‌تێکی ئه‌ڵێ ڕێبازم دینه    ئه‌وی تر ئه‌ڵێ به‌رهه‌مم ژینه
قه‌ڵه‌م له (لَوْح)یش که بوو به دوو له‌ت    بۆ چاره‌نووسی عاله‌م له هه‌یبه‌ت
ڕه‌مزه بۆ ئه‌مه به‌م دوو زمانه    وا ئیشعار ئه‌کا، دووری مه‌زانه
واته دین و ژین پێکه‌وه به‌سران    هه‌ر له‌و ڕۆژه‌وه به ئه‌مری یه‌زدان
که‌وابوو هه‌رکه‌س پێچه‌وانه‌ی ئه‌و    ده‌ستی دا قه‌ڵه‌م، ڕۆژی بوو به شه‌و
ئه‌نجا تۆ ئه‌گه‌ر نووسه‌رێ به‌رزی    بۆ ئه‌بێ خۆت که‌ی به وێنه‌ی ده‌رزی
پینه و په‌ڕۆی خه‌ڵك بکه‌ی، بۆ خۆشت    ڕووت و شڕۆڵ بی ده‌رکه‌وێ کۆشت
تا تۆ له باسی دین و خودادا    دووره‌په‌رێز بی سوودت پێ نادا
ژینی به‌بێ دین ژانه به‌رهه‌می    ئه‌بێ تۆ له‌گه‌ڵ ژین بخۆی خه‌می
قه‌ڵه‌م نه‌ك ئه‌وه و به‌س، به‌و دووانه    ڕه‌مزی زۆری که‌ی تێدا عه‌یانه
ئه‌گه‌ر له ڕه‌مزی قه‌ڵه‌م بزانی    زۆر شتی سه‌یر و عه‌جیب ئه‌زانی
ئه‌توانم بڵێم ڕه‌مزی ئه‌و خامه    (مَا وَرَى)ی حه‌صر و ئیدراکی عامه
کۆڕی ئه‌دیبان بیکه‌ن به سه‌رمه‌شق    لاده‌ن له یاسای نه‌فام و ئه‌حمه‌ق
تێفکره بۆ خۆت له دوو دووی ئه‌شیا    بزانه به حیکمه‌ت چیت نیشان ئه‌دا
سا وه‌کو یه‌ك بن یه‌عنی (تَمَاثُلْ)    یا به‌رز و نه‌ویی و نه‌قص و (تَكَامُلْ)
یا نۆبه نۆبه و (بُعْد)و (تَقَارُبْ)    یا وه‌کو دوو دووی عه‌کس و (تَجَارُبْ)
یا ئیجاب و سه‌لب، یا زیدد و نه‌قیز    یا (مُتَجَانِسْ) ئه‌ی خاوه‌ن ته‌میز
ئه‌گه‌ر به چاوی حه‌قیقه‌ت زانیی    بڕوانی بۆیان ئه‌وسا ئه‌زانی

هەرکام لەوانە تەجزیە و تەحلیل — بفەرمووی، ئەبن بە بەڵگە و دەلیل
پێت ئەڵێن هەروەك دنیات مەبەستە — هەستە بۆ دینیش قەت رامەوەستە
بۆ وێنە و میسال وەکو دەست و پێ — یا دەم و زمان یاخۆ چاو و گوێ
دەستێ بۆ دنیا دەستێکت بۆ دین — راکێشە بەپێی ئیمکانت لە ژین
بۆ رەزای خودا و جەزای قیامەت — با لەوێ بەمان نەخۆی نەدامەت
چاوێ بۆ بینین بۆ وەسیلەی ژین — بڕوانە بەویان بۆ ئومووری دین
با بە چاوی ساغ کوێر نەبی لەوێ — بۆچیتە زیاتر، چیت لە ژین ئەوێ
کە وا حەز ئەکەی سەد دەست و چاوت — ببێ بۆ دنیا بۆ بەرزیی ناوت
خەزن کە بە گوێی راستت قسەی راس — لەنێو حیکمەتگای خەزێنەی حەواس
چی لە خراپە کە بیستت ئەگەر — بێ خەزنەی حەواس لە چەپ بیبە دەر
دەم کە بە مەخزەن، زمانت کلیل — فەتحی بۆ خراپ قەت نەکەی، دەخیل
با لە دادگای عەدڵی خودادا — کەڕ و لاڵ و کوێر نەبی لەولادا
کاتی رۆیشتن تێفکرە لە پێت — بەو پاش و پێشە بزانە چی ئەڵێت
پێی راستت ئەڵێ بەرەو دین بڕۆ — دنیا فانییە و خەمی بۆ مەخۆ
قیامەتە جێگای هەتا هەتایە — هەر بەرهەمی دین کۆگای هیوایە
تۆ ئەوێت نەبێ، با لێرە شا بی — بێگومان لەوێ ئەهلی عەزابی
پێی چەپت ئەڵێ بێرەوە دواوە — تێکۆشە بۆ ژین تا هێزت ماوە
دنیاش پێویستە بەڵام بزانە — کە چۆن هەوڵ ئەدەی بۆ ئەم دووانە
دنیا مەزرەعەی رۆژی جەزایە — ئێرە نموونەی وەزعی ئەولایە
هەموو ماوەی ژین ئەم پاش و پێشە — پێت ئەڵێ دنیا و دینت لەپێشە
واتە هەنگاوێك بۆ دین هەڵێنە — ئەویان بۆ دنیا بەکار بهێنە
با غافڵ نەبی نە لەم نە لەویان — ساتێکت بۆ ئەم ساتێ بۆ ئەویان

هەروا سەما و ئەرز (بِمَا فِیهِمَا)    وێنەی پەرگارن یا قیبلەنما
هەردوو مایلن بۆ نوختەی مەرکەز    بە زمانی خۆیان وەها ئەکەن عەرز
بڕوانە پەرگار سەری دەوواری    چۆن سەرەکەی تر بۆتە مەداری
بە موو لا بدا ئەم سەرەی بە فەرز    تێك ئەچێ تەواو دائیرەی مەرکەز
ئەو سەر بۆ دەوری کەون و کائینات    وەك قیبلەنما ڕێنمات ئەکات
بەڵام بیرێکیش لەو نوختە تاکە    کە وا مەرکەزی مەدارە، کاکە
بفەرموو، ئەڵێ من بە ئیعتیبار    بگرە بۆ تاکی خوای پەروەردگار
ئەگەر من نەبم بە جێگەی مەدار    تێك ئەچێ دەوری دائیر و مەدار
پێت ئەڵێ هەروەك لە ئیستیوادا    قیبلەم نیشانی قیبلەنما دا
ئەگەر من نەبام وەك دێوانە و مەست    دوور ئەکەوتەوە لە قیبلەی مەبەست
هەروا گەڕانی دەوری کائینات    نا مومکین ئەبوو بێ حەزرەتی زات
واتە پێت ئەڵێ ڕۆژانی ژینت    تەرکیزکە لەسەر مەداری دینت
هۆشت بێ دەوری زەمانەی پڕ پێچ    نەتخاتە وزاق، باز بەری وەك کێچ
یا سەرت بشکێ یا پێت لەنگ بێ    یا بە دەس ئەجەل جێت لێ تەنگ بێ
دەوری دائیرەی ژینت قەطع کا    تازە مەجالی دینیش مەنع کا
تۆ کە دنیات چوو، دینیشت نەبێ    ئەوسا بە تۆ چی! بێ یا نەبێ
تەنیا بە دەوری دیندا گەڕانت    سوودە بۆ کاتی مان و نەمانت
چونکە تا ماوی لە (مُسْتَوَی)دای    نەمای لە سایەی ڕەزای خودادای
کەوابوو مەبەست لە دەور و تەکوین    قیبلەی ئەلەستە، نەك دوو ڕۆژە ژین
تۆش کە فەردێکی لەم کائیناتە    قیبلەی دڵ و دین بزانە خواتە
(خُطُوط)ی ژینت ڕێت لێ نەگۆڕێ    با بە ژین مایەی دینت نەدۆڕێ
ژینت بۆ دین و دین بۆ خودا بێ    دەوری ماسیوات قیبلەنما بێ

کەوابوو سەما و زەویی پێکەوە      ئەڵێن دنیا و دین وان بەیەکەوە

دەرسی حیکمەت و فنوونی ئەسرار      ئەدەن نیشانت بە ڕەمز نەك بە زار

پێت ئەڵێن ڕوونتر لە تیشکی هەتاو      صانیعی گشتمان خودایە و تەواو

غەوواصەی فکرت بێنە بیخە کار      بە عەقڵی سەلیم بۆ کەشفی ئاسار

بۆ ئەبێ بەمەش خودا نەناسی      مەگەر نابینی یا بە سەر کاسی

لەپاش چەند هەزار ڕۆژ و مانگ و ساڵ      تێپەڕبوون بەسەر عالەم تا ئەلحاڵ

هەوڵ ئەدا عیلمی سەقافەی بەشەر      بۆ کەشفی دەریا و زەویی تا قەمەر

بەڵام تا هەرکوێ عیلم پێشکەوێ      ناگا بە کەشفی گشت ئێرە و ئەوێ

چونکە ناگونجێ شعووری بەشەر      دەرچێ لە حەدد و سنووری بەشەر

عیلمی موحیطی پێ دەوێ ئەمە      ئەویش هەر تەنیا بۆ خوای عالەمە

ئەنجا ئەوانەی چوونە سەر قەمەر      چی بوو دەسکەوتیان بێجگە دەردی‌سەر

کامە بوو دیاریی و سەوقاتی ئەوان      بۆ کەسێ نەیدی خەڵاتی ئەوان!

(یووری گاگارین) نەبێ، بەو چوونە      بۆی دەرکەوت مەبەست لە گشت ئەم بوونە

بۆیە تۆ بەو صانیع بناسی      مادام خاوەنی عەقڵ و حەواسی

یا (ئارمیسترۆن) پاش چوونی سەر مانگ      وتی من لەوێ بیستم دەنگی بانگ

ئابیت بوو لەلام کەون و کائینات      شەهادەت لەسەر خودای تاك ئەدات

هەروەك بۆم دەرکەوت کە دینی ئیسلام      تەنیا ڕێگەیە بۆ نەجاتی عام

باقیی هەموویان وەلا نراون      نیسبەت بەم دینە گشت ناتەواون

وتیان وەزیفە لە دەس دەرکەوت      وتی قەیناکا، خودام دەس کەوت

ئاوایە مەعنای زانین و ئەدەب      نەك قەڵەم ڕادان تەنیا بۆ نەسەب

کەوابوو لێرە و لەوێش بەولاوە      مەجالی ئینکار بۆ کەس نەماوە

هەروا مانگ و ڕۆژ لەگەڵ ئەستێرە      کە تۆ بە دوو چاو ئەیبینی لێرە

ئەوانیش هەموو هەروەکو زەویین     مەخلووقی خودان، بەرزن یا نەویین
ئەوەش بزانین کوراتی هەوا     هەرچەند بێ حیکمەت نەخرانە فەزا
بەڵام بۆ سوودی ئێمە بۆ ژیان     ناگەن بە زەویی و دەریا بێگومان
بەڵێ مانگ و رۆژ لەنێو ئەوانە     با زۆر بەسوود بن، ئەوەش بزانە
ئەوەی پێویست بێ لە سوودی ئەوان     ئەگا بە ئێمە و زەویی بۆ ژیان
کەوابوو چوونی ئێمە بۆلایان     بێسوودە، ژینمان نابێ لەلایان
چونکە نیسبەتی ئێمە بەوانە     بەپێی عیلم و عەقڵ دوورە لەوانە
ئێمە کە خۆمان نەسلی بەشەرین     لە ئاو و زەویی و هەوا و ئاگرین
چیمانە لەسەر ئەجرامی فەزا     فەزا بە یەك خاڵ ئەبێ بە قەزا [٣٢]
ئەبێ بە مایەی سەر تیاچوونت     دەی بۆ هەوڵ ئەدەی خۆت بۆ نەبوونت
هەر بۆیە ئێمە لێرە نیشتەجێ     کراوین هەموو، کاکە، نەك لەوێ
تەنانەت لەپاش کۆچی ماڵئاوا     هەر زەویی ئەبێ بە جێگە و ماوا
هەر لە زەویشا سەر دێنینە دەر     کۆ ئەکرێینەوە بۆ دەشتی مەحشەر
بۆیە فەزاچییش بۆ چوونی ئەوێ     حەتمەن وەسیلەی ئێرەیان ئەوێ
کەوابوو چیتە لەو بەرەوژوورە     سوودی بوو بە چی ئەو رێگە دوورە!
بێجگە لە ماڵ و کات بە زایە دان     کێی بە مەرتەبەی ئینسانیی گەیاند
بێجگە دەنگی رووت وەك دەنگی دەهۆڵ     ئادەی فەزاچیی چی هێنا بە کۆڵ
دەی بۆ ئەو خەڵکە وەکو دێوانە     شێت و هەڵوەدای چوونی ئەوانە
ئێمە کە خۆمان لێرەدا ئەژین     بینەری سارا و گوڵزار و کەژین
بە پاپۆڕ ئەڕۆین بەسەر دەریادا     وەك بە فڕۆکە بەسەر هەوادا
ئەگەر ئێمە بیر لەمان کەینەوە     ئەبێ لا لەوان هەر نەکەینەوە
چونکە بێگومان بەشەر چی بوێ     لێرە هەمانە بێ چوونی ئەوێ

ئەوانەش کە وا مەرِبووتن بە ژین — بەو هەوایەوە یا بە نەهجی دین
وەکو گەرمیی رۆژ لەگەڵ نوورەکەی — تەئسیری لەسەر مانگ و نوورەکەی
یا ئاڵوگۆڕیان لەم بورج بۆ ئەو بورج — بە نەزم و تەرتیب توندوتۆڵ و گورج
زیاد و کەمیی مانگ تا حەددی کەمال — وەك شەوی چواردە تا فەترەی هیلال
بۆ تەرتیبی شەو، رۆژ و مانگ و ساڵ — گۆڕانی زەمان بە چوار فەسڵی ساڵ
هەروا هەور و با و بەفر و بارانە — ئەوەی پێویستی سوودی ئینسانە
هەمووی لێرەدا دەسمان ئەکەوێ — نازانم بەشەر چی تری ئەوێ
ئاخر چی ماوە خوا پێی نەدابێ — تا ئەو هەڵوەدای سەما و فەزا بێ
خۆ ئەمانە گشت بەبێ دەردی سەر — دوورن لە هێز و کردەوەی بەشەر
بێجگە خالیقی حەکیم و ئاگا — دەستی کەسی تر بەوانە ناگا
کەوابوو چوونی ئەو بەرەوژوورە — سوودی لە عەقڵ و عادەتیش دوورە
جا ئەگەر سوودی تێدایە ئەوێ — بۆ ماوا و مەسکەن ناگرن لەوێ
با زەوییش کەمێ تەنکەی تێکەوێ — بۆ ژینی ئەوەی ناچێ بۆ ئەوێ
بەهەرحاڵ ئەوەی بەسوودە بۆ ژین — لە بەرز و نەویی یا حەضارە و دین
قەیناکا بڕۆن بۆی لە جێگەی دوور — پارەش سەرف کەن بە کلوور کلوور
مادام خیلافی شەرافەت نەبێ — یا دژ بە دین و کەرامەت نەبێ
چی لە دەستت دێ بۆ گەلت لە سوود — دریغ نەبێ وەك پیاوی حەسوود
جا کە تۆ وابووی منیش واترم — تۆ چی ئەفەرمووی منیش حازرم
ئەنجا لە دووی تر وەك (مُتَعَاقِبْ) — بیرکەوە کە چەند سەیرە و عەجایب
زوڵمەتی شەوگار، رووناکیی نەهار — یا بڵێم وێنەی زولف و کوڵمی یار
کەوابێ نۆبەش لەیل و نەهارن — هەمیشە جەمعن، حوسنی روخسارن
خەرقی قاعیدە لێرە رەوایە — حاڵی مەعشووقان لە عالەم جیایە

ئەمەش بزۆزیی قەڵەم بوو لێرە    خۆی بۆ نەگیرا بەم باسە فێرە
واتە دەرسی عەشق ئەنووسێ بە خوێن    لەبەر شەوچرای یاری دڵڕفێن
پێت ئەڵێ ئەگەر لە عەشقا کوڵای    ئەوسا ئەزانی کە بەندەی خودای
چونکە تینی عەشق بێ نەوت و ئاگر    زوو تەئسیر ئەکا، لە ئاگر زیاتر
سا حەقیقەت بێ یاخۆ مەجازیی    هەر بەهانەیە مەعشووقە و نازی
تینی گڕی عەشق سەرچاوەی دوورە    جەزبی جازیبەی ساحەی حوزوورە
بەڵام بەگوێرەی شیاویی بەندە    ریشەی هەر دڵێک بە داوێک بەندە
ئەوانەی ئەڵێن ئێمە عاشقین    سووتاوی عەشقین بە شوێنیا شەقین
ئەگەر مەعنای عەشق ئاوا نەزانن    بێ ئاگان لە عەشق شێت و حەیرانن
خاڵی مەعشووقان بەڵێ دڵسۆزە    بەڵام ئەم سۆزەش هەر هی ئەو سۆزە
نازانێ گڕی شەمعی ئەوێیە    پەپوولەی رۆحی شەیدای ئەوێیە
جا ئەگەر زانی ئەو رەنگ و شێوە    شێوەی نەقاشیی ئەو جێگەی پێوە
ئەزانێ دەوری مەعشووقان بە ناز    هەمووی ئەچێتە بەر بابی مەجاز
بەس مەزهەرێکن بەناوی مەعشووق    حەقیقەتی عەشق وا لەژوور مەنطووق
لەم باسە نووسراو زۆرە بە سەد سەد    با بڕۆینەوە سەر ئەسڵی مەقسەد
تۆ ئەگەر خاوەن تەجرەبە و بیری    بیخە نێو دووتای تەرازووی ژیریی
ئەزانی مەبەست لە بوون خودایە    بەرنامەی رۆژی (قَالُوا بَلَی)یە
کەوابوو برام دێرە تا زووە    سەقافە فێربە تۆ لەم دوو دووە
فەلسەفەی کۆنی یۆنانیی گەنیو    کە شوێنی کەوتوون تازەپێگەییو
خەریکی هەوای نەفسن ئەمانە    ئەمری خودایان لەلا گرانە
دەرکی حەقائیق بۆ ئەم گرۆیە    لەم زەلکاوەدا نابێ، درۆیە
قەیناکا ئەمڕۆ سەقافەی تازە    چی بە دوو چاو و ئامێری تازە

نەیبینێ، هەستیش ناکا بە بوونی     چونکە مەحدوودە فیکری زەبوونی
لە عیلمی مەعنا و رمووز بێئاگان     وا فێر کراون بۆیە هەر ئاوان
بەڵام لێرەدا لەبەر چەند سەبەب     خەریکە دەرچم لە شێوەی ئەدەب
سەرم لە بەعزێ مامۆسای بەناو     پێشەوای دینیی سوورماوە تەواو
کە وا قوتابیی زانکۆی قورئانن     بەناو واریسی پێغەمبەرانن
بە دەم عەللامەی عەصر و زەمانن     کەچیی شوێنکەوتووی فیکرەی ئەوانن
تەنانەت نەفی سەماوات ئەکەن     ئا بەم حاڵەوەش موباهات ئەکەن
لە مەعنای ئایەی (سَبْعاً شِدَادا)     عەرش و سەما و کورس ئەدەن بە بادا
هەر وائەزانن فەردی وەحیدن     لە هەڵە و پەڵە و غەڵەت بەعیدن
بەڵام هەر ئەڵێی بە تووتیی واریی     چوونەتە زانکۆی کەلامی باریی
خودا خۆی لە چەند ئایاتی عەدید     بەبێ تەئویل و بێ شوبهە و تەردید
تەصریح ئەفەرموێ بە حەوت سەماوات     هەروا بە حەوت ئەرز بەپێی طەبەقات
بێجگە لە کورسیی و لە عەرشی بەرین     کە زۆر وان لەژوور سەمای حەوتەمین
هەروا خیلافی حەدیسی میعراج     بۆ شەوی ئیسرای خاوەن شکۆ و تاج
ئەفەرموێ لەگەڵ جیبریلی ئەمین     لەپاش (دَقُّ الْبَابُ) بە شەوق و تەمکین
لەم سەما بۆ ئەو، لەم باب بۆ ئەو باب     تا وەژوور کەوتین لە هەر حەوت باب
ئەنجا لەوەوژوور بەبێ رەفیق مام     لە (سِدْرَة) جیبریل عوزری خواست لەلام
تا هەرکوێ کە چووم لەوێ بەولاوە     مەنووط بوو هەمووی بە لوتفی خواوە
لەگەڵ ئەم هەموو تەصریحە ئێستا     طەریقی جەدەل ئەگرێ مامۆستا
چوونی سەر قەمەر ئەکا بە دەلیل     بۆ نەفی سەما بە سەد قال و قیل[٣٢]
ئاخر لەو چوونە کەی لازم ئەکا     بە عەقڵی سەلیم نەبوونی سەما
رەنگە بۆیەبێ پێ لە حەق نانێ     بڵێن سەقافەی تازە ئەزانێ

یا ئەڵێن سەبەب بۆ خوداناسین	شیرکە، بێجگە لەو نابێ بناسین
بیر ناکەن لەوەی بە هۆی (تَعَلُّلْ)	وەك بڵێن وێنەی (دَوْر)و (تَسَلْسُلْ)
خۆشیان ئەسبابن، چ کوڕ چ بابن	ئەگەر زانا بن نابێ وەها بن
ئەبێ بزانن کە خۆیان لە کێن	هەوێن لە ماستە و ماستیش لە هەوێن
بەڵام لێرەدا هەر بە حوکمی شەرع	جیهەت ئەیگۆڕێ بە ئەسڵ و بە فەرع
عالەم هەرهەمووی هۆیە و وەسیلە	بۆ ناسینی حەق بەڵگە و دەلیلە
نەفی واسیطە و سەبەب بێ سەبەب	ئەبوو بە دوور یا لە ئەهلی ئەدەب
چونکە ئینکاری وەسیلەی تەوحید	بە زیانی خۆیان ئەبێ بە تەنقید
ئایە موعجیزەی گرۆی ئەنبیا	نەبوون بە سەبەب لەبۆ ئەشقیا !
ئایە تەورات و ئینجیل و زەبوور	قورئان و صوحوف وەك مەشخەڵی نوور
نەبوون بە چرای زوڵماتی (ضَلاَلْ)!	بە هۆی ئەنبیای موبارەك خیصاڵ
ئەگەر ئەمانە نەبان تۆ چی بووی	ئەهلی تەوحید بووی یاخۆ شەقیی بووی
خۆت خودات ناسی یا بە وەسیلە	بە راستیی فکرت تەواو عەلیلە
بۆ! مەگەر خودا خۆی نەیئەتوانی	بۆ ناسینی خۆی یا نەیئەزانی!
عالەم بخاتە سەر رێی هیدایەت	لەگەڵ ئەوپەڕی لوتف و عینایەت
نەوعی ئینسانیش وێنەی فریشتە	دووربان لە هەرچی کردەوەی زشتە
هەرکەس لەبەرخۆی بێ شك و تەردید	خەریکی دین با و گەنجینەی تەوحید
هەروەك ئادەمی فێری ئەسما کرد	سەجدەی بە مەلەك وەبەر ئەودا برد
کردی بە رەسوول بۆ ئەولادی خۆی	هەروا کوڕەزا وەك ئەحفادی خۆی
یا وەك ئەفەرموێ (وَعَلَّمْنَاهُ)	بە (مِن لَّدُنَّا عِلْماً) (كَمَا هُو)
بۆ خدری زیندەی زوڵماتی حەیات	یا عالەم ئاوا گەیبا بە ئاوات
پێویستتان نەبا بە چوونی مەکتەب	بۆ باری زانین یا شێوەی ئەدەب

یا هەر شتێ تر لە پێویستیی ژین
یا خوداناسیی و رسووماتی دین

چونکە خۆ خودای ئەمان و گشت کەس
تەنیا هەر خۆی بوو فەردی فەریادڕەس

یا بۆ هەموو کەس وێنەی ئیبراهیم
باوەڕی بە خوای خۆی نەبوو قایم

خۆ خودای ئەم و عالەم یەکێ بوو
ئەی بۆ ئیبراهیم تەنیا یەکێ بوو

چی لە رەحمی خوا کەم ئەبوو مەگەر!
ئەگەر گشت عالەم با بە پێغەمبەر

یا چی زیاد ئەبوو لە رەحمی یەزدان
ئەم خەلقە هەمووی ببا بە شەیتان

خۆ بە حەقیقەت ئەم یا ئەو باری
هەموو یەکسان بوو بەنیسبەت باریی

کەوابوو بوونی عالەم بەم شێوە
مۆری تەرجیحی ئیرادەی پێوە

ئیرادەش بەبێ حیکمەتی تەواو
تەرجیحی وشکیی نادا لە سەر ئاو

چ دین چ دنیا لە رێگەی راسیی
هەموو وەسیلەن بۆ خوداناسیی

بوونی ئەم کەونە دەلیلە لەسەر
وجوودی خودای خالیقی ئەکبەر

بەڵام بەرنامەی ناسینی تەواو
بە هۆی ئەنبیا و روسول کەوتە ناو

ئیرادەی خودا وابوو کە وابێ
هەریەك لەمانە شەمسی هودا بێ

هەریەك بۆ گەلێك لە نەوعی بەشەر
بوون بە شەوچرا و گڵۆپی خەتەر

جارێ بە وەعدە، جارێ بە وەعید
گا بە موعجیزەی لە عادەت بەعید

بەرنامەکانی خودایان گەیاند
تۆوی ئیمانیان بە دڵانا ئەچاند

ئەنجا لە ماوەی فەترەی جەهالەت
کە دنیای داگرت کوفر و ضەلالەت

یاسای ئینسانیی پەتی لێ پچڕا
تۆوی شەرافەت لە عالەم بڕا

دڵان تاریك بوون وەك شەوی دەیجوور
بە وێنەی شەیتان لە رەحمی حەق دوور

ئەنواعی فەساد رووی کردە زەویی
کەس نەما بۆ خوا سەر بکا نەویی

ناوێ لە مەعنای ئینسانیی لە ئەرز
نەما، نەتئەدی تەنانەت بە فەرز

***

## باسی لاچوونی شەوی تاریکی دەوری جەهالەت بە چرای دین

خوا ئەنجا بەزەی هات بە بەشەردا ئەمری دا بەسەر (خَیْرُ الْبَشَرْ)دا
بۆ نەسلی ئێمەی برای موسڵمان وابوو ئیرادەی خالیقی مەننان
پێغەمبەرێکی قورەیشیی نەسەب بنێرێ بۆمان لە نەسلی عەرەب
بۆ رۆحی پاکی هەزاران سڵاو نەسخی ئەدیانی بە ئەو کرد تەواو
کردی بە گەورەی گرۆی مورسەلین دینی بەردەوام (إِلَى يَوْمِ الدِّينْ)
شەمسی برووجی سەمای سەعادەت بەس بوو بوونی ئەو بۆ خەرقی عادەت
هەر بە بوونی ئەو وشك بوو ساوە ئاگری مەجووس فەوردن کوژاوە
تاقی هەیوانی کیسرا شەقی برد شەیتان لەداخا ئەتوت شەقی برد
تەختی زۆرداران گشت کەوتە لەرزین وەك لە ناوەکەی بە دڵ ئەلەرزین
لەنێو پیسترین جەهل و ئەحمەقیی لەنێو ئەوپەڕی کوفر و دڵڕەقیی
رەحم و بەزەیی خستە نێو دڵان وەك بڵێین ئاوی لە بەرد هەڵقوڵان
تا بە خولق و خووی بەرزی بێوێنە بەو شێوە جوانە و وردە تێچێنە
کەم کەم و دەم دەم بە ماوەیێ کەم نەمامی دینی هێنایە بەرهەم
چرای ئیسلامی گرت بەدەستەوە رێی لە جەهالەت تەواو بەستەوە
دین لە شەرق بۆ غەرب جنووب تا شیمال پەرەی سەند، نەما بۆ کوفر مەجال
هەرچەند خودا خۆی هادی و دەلیلە بەڵام ئەنبیای کرد بە وەسیلە
ئەنجا کۆمەڵی یارانی ئەمان بوون بە وەسیلە دوای کۆچی ئەمان
هەروا دەس بەدەس یاری یارەکان دینیان چین بە چین بە خەڵق راگەیان
بوون بە وەسیلەی ئیمانی گەلان بەتایبەت لەوان ئەوانەی مەلان
بەڵام کام مەلا! بەحری علووم بێ شارەزای مەعنا و رەمز و رسووم بێ

خیانەت نەکا لە دین یا لە خەڵك     بە مەعنای واقیع بەسوودبێ و بەکەڵك
روتبەی ئیجتیهاد دەسی دابێ بۆی     ئا بەو مەرجانەی دانراوە بۆی
دەرکی حەقائیق هەر بە حەقیقەت     بکا لە مەعنا و لوببی شەریعەت
شەریعەت یەعنی قورئان و حەدیس     ئیجماع و قیاس لە ئەمری نەفیس
جا بۆ هەر حوکمێ لە ئەحکامی دین     دەسکەوێ بەڵگەی کەلامی موبین
یاخۆ حەدیسی صەحیحی رەسووڵ     یەعنی لە (رَاوِي) ئەمین و مەقبووڵ
ئەگەر صەریح بن لە عەینی کاتا     کافین لە نەهیا هەم لە ئیسباتا
پێویست بە واتەی ئەم و ئەو ناکا     دەفی ئیجتیهاد لێرە دەنگ نادا
بەڵام بێگومان ئەمەش مەعلوومە     هەموو شت بە نەص غەیرە مەعلوومە
هەر بۆیە قیاس یا حوکمی ئیجماع     پێویستن بەڵام لە ئەهلی ئیجماع
نەك بۆ هەر کەسێ خۆی بلێ زانام     بۆ ئەو دوو حوکمە بەهێز و توانام
چونکە ئایەت و حەدیسی (نَبِيّ)     دوورن لە فەهمی نەزان و غەبیی
ئەم دوو ئەسڵانە وێنەی کنووزن     پڕ لە ئیشارە و نیکتە و رمووزن
ئەمانە عیلمی عەطای خودایین     دوورن لە عیلمی بەدوور لە ئایین
دوورن لە لۆمە و لە تانە و تەشەر     مەگەر بۆ کەسێ کەرتر بێ لە کەر
بە عیلمی تەنیا یا بە عەقڵی رووت     طەی نابێ فەزای ناسووت و لاهووت
ئەم دوو ئەساسە بەحرێکن عەمیق     موحیطن بە کەون بە چاوی تەحقیق
بەڵام داخەکەم ئەمڕۆ ئەبینین     بڕێ لەوانەی کە زانای دینین
یا لە مەکتەبیی تازە پێگەییو     کە هیچ نەزانن وەکو هیچ نەدیو
خۆیان بە ئەهلی رەئی و ئیجتیهاد     دائەنێن، لەبەر نەزانیی و عیناد
نصووص لائەدەن لە مەعنای مەفهووم     بە تەئویلی زۆر دوور و نامەفهووم
وا ئەکەن لەم دوو ئەسڵی بەقیمەت     نرخیان نەزانێ پیاوی بێ قیمەت

تەنانەت ئەوەند غەرقن لەم بارە     هەر بە راستەوخۆ غەڵەتیان دیارە
یا ئیفراط ئەکەن بەگوێرەی هەوەس     یا تەفریط ئەکەن بێ شەرم لە کەس
خۆزگە بە عیلم و بە چاوێکی ورد     سەیر و دەورێکی قورئانیان ئەکرد
لەگەڵ کۆمەڵێك حەدیسی صیحاح     تا دەسیان ئەکەوت طەریقی نەجاح
تا بەڵکو لە ڕێی لوتفی خوداوە     چاوەکەی دڵیان تۆزێ ئەکراوە
لە مەعنای کوێریی دڵی سینەیان     تێگەیبان لەگەڵ ئەو گشت قینەیان
تا لە دەس جەهلی موڕەککەب تەواو     دەرئەچوون، ئەبوون بە زانای تەواو
هەروەك ئەوانەی (ذُو الْجَنَاحَيْنْ)ن     دوورن لە هەڵە و واسیطەی بەینن
تەواو بەهێزن راسیخ و ئەمین     نە ئیفراط ئەکەن نە تەفریط لە دین
جێی سیقە و بڕوان بۆ حەللی موشکیل     لێك جودا ئەکەن حەق لەگەڵ باطیل
ئیرسی ئەنبیا رەوای ئەمانە     فەخری پێغەمبەر تەنیا بەمانە
بەڵام ئەوانەی بە خۆ ئەنازن     بە دڵ وێران و بە دەم دەمبازن
لە زانکۆی قورئان پێ نەگەیشتوون     وەك لە رمووزی تێ نەگەیشتوون
چونکە بێبەشن لە نووری تەوفیق     دەس ئەکەن بە تای سەفسەطە و تەلفیق
چی لەگەڵ فکری زەبوونی خۆیان     بسازێ ئەیکەن بە بەڵگەی خۆیان
بۆ ئەوەی لەنێو کۆمەڵێ عەوام     بنازێ بە خۆی بڵێ باش مەلام
جا ئەگەر کاکەم راستە مەلایە     نەفی وەسیلەی چۆن لا رەوایە!
یا ئەبێ بەڵگەی زۆر پتەو بێنێ     یا ئەبێ ئەمەم لێ بسەلمێنێ
لە خەلقی ئادەم واتە بولبەشەر     تا ئەگاتە سەر چاکترین بەشەر
بە فەرموودەی ئەو ئەبێ عەبەس بێ     نابێ کە هیچ کەس واسیطەی کەس بێ
ئایە بەعثەتی ئەنبیا و رەسووڵ     بۆ وەسیلەی خەڵك لەلات نین قبووڵ!
ئایە تۆ هەر خۆت خودای خۆت ناسیی     یا خودا هەر خۆی خۆی بە تۆ ناسیی

ئەگـــەر تــۆ ئــەڵێی وەســیلەم نــاوێ
راس ئەکەی خودا هــەر خــۆی حیســابە
خــۆ خــودا دەرســی (ئــادەم)ی دادا
خــۆ خــودا رزقــی بــۆ مەریــەم ئــەنارد
ئــەی ئێــوەی بەڕێــز بــۆ زانیــاریی
بــا وەك ئــادەم و خضــری بەختــەوەر
بۆ بە وەســیلەی مامۆســا و مەکتــەب
یا بۆ هەوڵ ئەدەن بــۆ پــارە و مــەعاش
خــۆ خــوا ئەفــەرموێ مــن رزق دەرم
دەی بــۆ بــۆ رزقــی دوو رۆژە ژینــت
بۆ لە سەد لاوە هەوڵ ئــەدەی بــۆ ژیــن
بــۆ لــە زاتــی حــەق ناپاڕێــیتەوە
بۆ! مەگــەر خــودای ئــادەم لەگــەڵ تــۆ
خــۆ ئەگــەر وابــی، نــەك هــەر نــەزانی
کەوابوو گشتمان بەندەی یــەك خــوداین
ئــــەوان پێشــــەوا و رابــــەری دیــــنن
ئــەوان رەســوول و مــەحبووبی خــودان
چــونکە ئێمــە زۆر لــە خــواوە دووریــن
کــــەوابوو ئــــەبێ لــــە نــــاخی دەروون
ئەگەر وا نەکــەین نــەك هــەر غەڵــەتین
چــونکە ئــەم شــێوە خــودای تــەوانا
بــڕێ بــەنرخ و بــەرز و خــاوەن ڕێــز

قــەیناکا منــیش ئــەڵێم پێــت نــاوێ
بــەڵام بیرکــەوە لــەم قســەت، بابــە
هــەروەك بــۆ خضــر لەگــەڵ مووســادا
لەوکاتــە بــەدەس زەکــەریای ســپارد
بــۆ داوا ناکــەن لــە زاتــی بــاریی!
لــە عیلمــی زاتــی خــوا بــن بــەهرەوەر
فێــر ئــەبن شــێوەی زانــین و ئــەدەب
ئەگەر راس ئەکــەن ئــاخر کــوڕی بــاش
مــن خــۆم کــەفیلی گشــت گیانلەبــەرم
وەســیلەت ئــەوێ، تۆبــیت و دینــت
دەس ئەبەی بۆ سەد وەسیلەی بێ‌تــین
بــۆ لــە هــی وەك خــۆت ئەلاڵێیتــەوە
یا خضــر و مەریــەم جودایــە لای تــۆ؟
کــافریش ئــەبی و ئــەهلی خوســڕانی
بــەڵام ئــەوان و ئێمــە لێــك جــوداین
ئــــەوان وەســــیلەن، راس و ئــــەمینن
بۆیــە لێرەشــدا لــە ئێمــە جــودان
بــەس بــە رواڵــەت ئــەهلی شــعوورین
شوێن ئەوان کەوین بەبێ چەند و چــوون
لــە ئــاخر پلــەی کــوفر و هەڵــەتین
هەر لە ئــەوەڵ رۆژ خــۆی وەهــای دانــا
بڕێکــی زانــای ژیــر و خــاوەن هێــز

بڕێکی نزم و نەزان و عەوام      بڕێکیش بۆ خۆی ئەڵێ من مەلام
بڕێکی خاوەن چەك و زۆردارە      بڕێ دەوڵەمەند، بڕێ هەژارە
بۆ دین و دنیا وایە و وا ئەبێ      دنیا گشت هەستێ نابێ وا نەبێ
بۆ تەنیا رۆژێ ژین بە موساوات      بە مەعنای تازە ناگەن بە ئاوات
چونکە موساوات بەم مەعنا تازە      کاتێ دێتەجێ بەپێی ئەندازە
هیچ کەس لە هیچ کەس زیاتری نەبێ      کەس لە کەس ژیانی چاتری نەبێ
هەروا کەس لە کەس بە روتبە و مەقام      بەرزتر نەبێ لەنێو خاص و عام
نە بە زاهیریی نە لە مەعنادا      گشتی لە یەك وەزع یەك موستەوادا
بژین ساڵ و مانگ بەڵکو رۆژ و شەو      وەکو یەك وابن لە بێداری و خەو
گشتی وەزیر و پاشا و ئەمیر بن      یا هەموو لات و گەدا و فەقیر بن
یا هەموو فەلا و شوان و کرێکار      یاخۆ تاجیر و ئەصنافی بازاڕ
فەرق و جیاوازیی لە هیچ شتێکا      نەمێنێ بۆ کەس لە هیچ بەشێکا
خۆ ئەمەش بێ شك نابێ و مەحاڵە      کەوابوو یاسای ئاوا بەتاڵە
ئێمە ئەپرسین لەو یاسانووسە      کە دایم شێتی یاساکەی رووسە
ئایە دیعایەی ئیشتیراکییان      راستە موساویی ئەژین پاکیان
ئایە هەیئەتی حاکمەی ئەوان      وەك گەلان ئەژین لە ناوچەی ئەوان
ئایە تاجیرێك لەگەڵ حەماڵێك      موساویی ئەژین وەك یەك لە ماڵێك!
دانیشتووانی کاخی کرملین      ئایە وەك فەلا و کرێکار ئەژین
مەگەر نابینن لەپاش مردنیان      تەنانەت خەرجی دەفن کردنیان
سەد لات و گەدای پێ ئەبێ بە ماڵ      تێر ئەکا هەزار ئینسانی رەجاڵ
دەی ئیشتیراکیی و موساوات کامە!      ئەگەر راس ئەکەی بفەرموو، مامە
خۆ لەوێش هەروەك سەرمایەداریی      بە روونیی دیارە زۆر و زۆرداریی

لێرەشدا هەرچەند دوور کەوتینەوە     لە ئەسڵی مەوزووع، بۆی ئەچینەوە
ئەنجا بڕێ تر هەر بە قال و قیل     ئەوەند مەغروورن ئەڵێن بووین بە فیل
وا ئەگەیێنن کە فەخری رازین     سەعد و شەریفن یا نەجمی رازین
ناڵێ نەزانم یا لائوبالیم     ئەڵێ یەکێکم وەکو غەزالیم
غەزلی غەزالیی گەوهەرە و یاقووت     کاکەم تانوپۆی ماڵی عەنکەبووت
نەمزانی ئەمەی چۆن بە دەمدا هات     ئەوەند مەغروور بوو بەزەم پێدا هات
قیاسی (مَعَ الْفَارِق)ی ئەمان     ئەبێ نەتیجەی وابێ بۆ ئەمان
بەڵێ نەزانا خۆی وا ئەزانێ     ئەبێ خۆی نرخ لەبۆ خۆی دانێ
نازانێ بە دڵ عالەمی ئەشباح     بۆ بوو بە لانەی عالەمی ئەرواح
کە رووح وەکو تەیر لەنێو لانەدا     تا وا لە تەنگیی ئەم هێلانەدا
زوڵماتی خەتای وەکو پەردەی رەش     مانیع ئەبێ بۆی، فەرقی سپی و رەش
ناکا وەکو کوێر فەرقی رۆژ و شەو     یا وەکو کەسێ چاوی بچێتە خەو
تا لانەی لەشی پڕ نەبێ لە نوور     ساف نەبێ وێنەی قەفەسەی بلوور
هەرکات مەیلی بوو لێی نەبێ دەرباز     نەدا لە شەقەی باڵی وەکو باز
نەبێ بە سیمورغ بەو قیافەوە     نەچێتە سەر قاف تا بە قافەوە
سەیرانێ نەکا بۆ دەریای موحیت     تاوێ بەدەوریا نەکا قیتەقیت
نەڕوا بە مەیلی خۆی بە هەوادا     وەك سەیری خەیاڵ بە ژوور سەمادا
سەرێ نەکێشێ بێرە و بەوێدا     نەزانێ ئێرە و ئەوێ چی تێدا
چۆن لەنێو قەفەس کەشف ئەبێ تەواو     ئەوەی پەنهانە یا وا لەبەرچاو
تا ئەو ئەسیری داوی لاشە بێ     قەت باوەڕ مەکە قەل بە واشە بێ
رووحی ئەمانە تازە مەحبووسە     گیرۆدەی داوی شتی مەحسووسە
بێجگە ئا لەوەی ئەیبینێ بە چاو     ئەویش کام بینین! نیوەو ناتەواو

دان بە حەقائیق نانێ تا ماوە     چونکە پێبەندە بەم دان و داوە
زوڵمەتی لەلا عەینی صەفایە     حاڵی ناحاڵیی بەڵێ هەر وایە
هەر بۆیە کاکەم دەرئەچێ لە خۆی     بەو قاڵ و قیلە فیز ئەکا بە خۆی
تا بڵێن ئەویش بە عیلمی تازە     بوو بە مامۆسای سەقافەی تازە
بە تانە و تەشەر لە هەرچوار مەزەب     دەمی (ذاکِرْ) بێ بە سووئی ئەدەب
تەنانەت لەگەڵ ئەنبیا و رەسوول     بێ ئەدەب ئەدوێن (فَیَا لَلْجَهُولْ)
من ئا بەمانە چۆن بڵێم زانی     کە چوونە ریزی سوپای نەزانیی
هەر لە راستیدا لە زانین دوورن     بەس بەناو مەلان، چرای بێ نوورن
هەر بۆیەش لەنێو هەمووی ئەم گەلە     غەیبەتیان بۆ خەڵك بۆتە شەوچەلە
کۆمەڵێ تریش لەو بەناو مەلا     بۆ پێغەمبەران وا ئەکەن ئەدا
ئەڵێن ئەوانیش وەك ئێمە وابوون     هەرچەند مەزهەری وەحیی خودا بوون
بەڵام ئەو وەحیەی کە ئەهات بۆیان     چونکە نازڵ بوو بە زمانی خۆیان
مەعنایان باشتر ئەزانی، ئەنا     یەکێك بوون ئەوان وەك ئێمەی مەلا
روتبەی ریسالەت بەو کەماڵەوە     حاڵی مامۆساش بەم خەیاڵەوە
خۆزگە ئەمزانی بە کامین قیاس     مامۆسا گەیشت بە (أَفْضَلُ النَّاسْ)
(نَعُوذُ بِاللّهْ) لەم بیر و رایە     بۆیە من ئەڵێم بەنێو مەلایە
خوا خۆی ئەزانێ بیستوومە لێیان     نەك بە خەیاڵ و ئیفتیرا پێیان
بۆیە زانای بەرز، ئوعجووبەی زەمان     دەریای علوومی حیکمەت و بەیان
فەخری عیلم و دین ئیمامی رازیی     سەرچاوەی ئەدەب، خودای لێ رازیی
لە سوورەی ئەعراف، تەفسیری کەبیر     بۆ عولەمای سووء وا ئەکا تەفسیر
وێنەی بەلعەمی بنی باعووران     بە دەوری هەوای نەفسا ئەسوڕان
بەلعەم یەکێ بوو لە دەورەی موسا     عابید و واریع وێنەی بەرسیسا

ئیسمی ئەعظەمی لە سینەدا بوو بۆیە چی ئەیوت دوعای رەوا بوو

بەلام قەومەکەی لە ئاین دوور بوون خاوەنی ماڵ و جاه و غروور بوون

کاتێ قەصدی کرد حەزرەتی کەلیم بڕواتە سەریان بە ئەمری قەدیم

بۆ دەعوەت کردن بۆ دینی تەورات رشتیان بەسەریا خەلات و بەرات

وتیان تۆ ئیسمی ئەعظەم ئەزانی دوعا قبووڵبووی قاپیی یەزدانی

ئەبێ دوعا کەی لە مووسای عیمران سەری لێ بشێوێ نەگاتە سەرمان

چونکە ئەگەر ئەو بوو بە نیشتەجێ ریاسەت لە دەس ئێمە دەرئەچێ

ئەویش دوعای کرد بە فریوی ئەوان سەریان لێ بشێوێ رێ نەبەن بەوان

دوعای قبووڵ بوو، سەریان لێ شێوا حەزرەتی مووساش پەنای برد بە خوا

عەرزی کرد یارەب بە تاوانی کێ لە ئێمە سەرمان لێ شێوا لەم جێ؟

فەرمووی بە دوعای بەلعەمی باعوور حەزرەتی مووساش فەرمووی یا غەفوور

وا منیش داوات لێ ئەکەم بە دڵ دەریای غەزەبت بۆ ئەو بێتە کوڵ

ئیسمی ئەعظەمی لێ بستێنەوە دوعاکەی بەسەردا بشکێنەوە

زمانی وەك سەگ لە دەم دەربێنە هەرواش ئیمانی لە دڵ بکرێنە

دوعای ئەم زاتەش قبووڵ بوو دەرحاڵ لە قاپیی خودای فەردی بێ زەواڵ

کافر بوو فەوردن ئیمانی نەما هەروەك زمانی لە دەم دەرکشا

لەبەر مەغرووریی ئەو نابەکامە نەیزانی رێگای هیدایەت کامە

(نَعُوذُ بِاللّٰه) لەو خەسارەتە لەو موعامەلە و لەو تیجارەتە

جا ئیمام فەخر ئەڵێ بێ تەردید تا لەم ئایەتە بۆ وەعظ و تەهدید

سەخت تر هەرگیز بۆ عولەمای دین نابینرێ لەنێو قورئانی موبین

لەپاش هیدایەت بە سووئی ئەدەب ببێتە جێگەی ئەوپەڕی غەزەب

ئیسائەی ئەدەب لە دەمدا خۆشە بۆ کەسێ مەستی هەوا و سەرخۆشە

دەمی دڵ مردوو وەك مەزەی هەنار پڕ ئەبێ لە ئاو، لێی ئەبێ بە ژار
هەرکەسێ لەگەڵ دۆستانی خودا بێ ئەدەب بدوێ، پەنا بەر خودا
حەدیسی قودسیی لەگەڵ ئەم پیاوە ئیعلانی شەڕی لەگەڵ لێداوە
تازە ئەو شەڕی من و تۆی ناوێ عاقیبەت شەڕە و چی کەی پێ ناوێ
ئەوانەی بەناو ماموٚستای دینن بڕێکیان یەکجار دڵ پڕ لە قینن
بێ ئەوەی هیچکام لەوانەی دیبێ یاخۆ ماوەیەك لەگەڵیا ژیبێ
دەس ئەکا بە تای بێ ئەدەبییدا لەگەڵ ئەولیا و لەگەڵ (نَبِيّ)دا
تەنیا بە باسی برا دینەکەی تێر نابێ لەپاش کۆچی ژینەکەی
تەکفیریش ئەکا بەبێ ترس و لەرز بە راسیی چۆتە سەر شاخێکی بەرز
لووتی غرووری ئەوەندە پۆزە بە دوو قیل و قال بەقەد یەك گۆزە
چونکە هەر لووتی خۆی ئەبینێ و بەس وەقفە نافەرموێ لە تەکفیری کەس
بێجگە لەوانەی وەکو ئەو هەڵەن بۆ خۆیان بەڵا و بۆ عالەم تەڵەن
گەنجی بێ ئاگا و عەوامی فەقیر وا رائەکێشن وەك مەڕ بە زنجیر
وا ئەسەلمێنن بەو نەزانانە کە ئەمڕۆ کاکەم فەردی زەمانە
خۆی بە موجتەهید دائەنێ بۆیان بۆ ئەوەی بیکەن بە گەورەی خۆیان
ئەفەرموێ تەقلید لەو چوار کەسە حەرامە، تەنیا قورئانت بەسە
بەڵام تەقلیدی خۆی ئەبێ بکرێ ئاخۆ چۆن ئەبێ لە شەرما نەمرێ!
با نەڵێم وەك کێ یا وەکو فلان بەڵام داخەکەم! داخن بۆ دڵان
منیش هەر بۆیە داخم گرانە هەست بە مەسئوولیی ناکەن ئەمانە
یا ئەگەر کەسێ وتی (يَا نَبِيّ) ئەڵێن وا مەڵێ، پێی کافر ئەبی
یا نەکەی ناوی کەسێ تر بەری ئەنا کافری و لە ئیسلام بەریی
هەرکەس تەوەسسول بکا بەمانە کوفرە لەلایان ئەو نەفامانە

بێ ئەوەی سڵ کەن لەم قەباحەتە  کە پێچەوانەی دەیان ئایەتە
حوکمی کوفر ئەدەن بەبێ چەند و چوون  بەسەر گەلاندا بۆ هەشت نۆ قڕوون
لە ئەهلی قیبلە و جومعە و جەماعەت  لە ئەهلی زیکر و ئەنواعی طاعەت
لە ئەهلی عیلم و فەزڵی زەمانە  کە هەریەکێکیان هەزار لەمانە
بە کوێرە کوێرە بەرد فڕێ ئەدەن  یا باشتر بڵێم بەرد گڕێ ئەدەن
ئاخۆ ئیسلامیی ئەمانە چی بێ!  هەرکەس وا نەبێ لە دین بەریی بێ
تەکفیری نۆ قەڕن لە باشترین خەلق  لەسەر چاکترین ڕێبازی بەرحەق
ئەبێ کێ بیکا ئەم جەسارەتە  دەم دا لە سوودی ئەم خەسارەتە
بێجگە لەوانەی لە راسیی دوورن  ئەسیری نەفسن، بە خۆ مەغروورن
بە دوو نامیلکەی پووچی سەر جادە  لە دوو منداڵی ساویلکە و سادە
کوڕ و کۆمەڵێ ئەکەن بە هاوبیر  بۆ لادان لە ڕێی زانایانی ژیر
کەچیی لە بابی قسە و گفتوگۆ  بێ ئەوەی هەست کەن بە راس و درۆ
یاخۆ بە بەڵگەی صەحیح و مەقبوول  بێنە سەر باسی نیقاشی مەعقوول
بەس تووڕەبوونە و قسەی بێ دەلیل  بۆ بابی جەدەل کاکی دڵ عەلیل
ئەمەش لە عورفی ئەهلی ئەدەبدا  دوورە لە باسی عیلم و ئەدەبدا
هەر ئەمە مەعنای تێشکانیی یە  بەڵگەی عەوامیی و هیچ نەزانیی یە
وا دەرئەکەوێ لە واتەی دەمیان  لە نووسراویان بە زۆر و کەمیان
کە تەوحید لەلای ئەم نەزانانە  تەکفیری نوخبەی موسڵمانانە
بۆ نموونە وەك غەوسی گەیلانیی  ئیبنول عەرەبیی و شێخی شەعرانیی
صاحەبی بوردە شێخی بەواسیر  خاوەنی عیلمی باطین و زاهیر
ئەڵێن بێگومان کوفری ئەمانە  بەلای ئێمەوە ئەوەند عەیانە
لە کوفری ئەبو جەهلی[٣٤] ئاخرشەڕ  زۆر گەورەترە و خراپە و بێ فەڕ

دەی وەرن ئێـــوە و دیـــن و خوداتـــان ئاوایـــە تەوحیـــد ئێـــوەش لـــەلاتان!
ئـــاخۆ بـــە کـــام دیـــن جـــائیزە و ڕەوا (فَیَـــا وَیْلَتَـــــی لأَهْـــلِ الْهَـــوَی)
مـــن کـــە لێـــرەدا بـــێ ئـــەدەب دوام بـــە زاهـــیر، بـــەڵام خولاصـــەی کـــەلام
تەنیا ڕووی قســـەم مـــەربووطـــە بـــەمان لـــە هـــەرکوێ وتم بـــەس بـــەنێو مـــەلان
چـــونکە ئـــەمانیش لـــە ڕێـــی فەســـادا پاڵیـــان دا بـــەلای ئـــەهلی عینـــادا
خەریکـــە یاســـای بـــەرزی ئیســـلامیی چـــرای ڕوونـــاکیی ڕێگـــای نـــەفامیی
پێشـــێل بـــێ بـــە دەس دوژمنانـــەوە یـــا بـــە دەس بـــەنێو تەوحیـــد زانـــەوە

## باسی ڕەگەزی ئەسڵیی گەلی کورد لەگەڵ برێ یاسای
## ئاینیی و ئەخلاقیی و شتی تر

لەپاش چـواردە قـەرن ئـەمڕۆ ئـەبینین دەسـتی خیانـەت ئەکێشـنە نێـو دیـن
جـــا بەتایبـــەتیی لـــە کوردســـتانا لـــە جێگـــای کـــۆڕی خواپەرســـتانا
کـە جێـی ئیـبراهیم (خَـلِیلُ اللهِ)یـە لـە گونـدی (کُـوثَـی) هاتـە دنیایـە
لە ناوچەی مووسڵ گوندێکە (کۆسا)[٣٥] (تَـأْرِیخُ الأُوَلْ) وای بـــەیان ئـــەکا
لـووطیش لێـرەدا پێـی نـا دنیـاود چـاوی بـۆ ژیـان لێـرە کـراوە
بـرازای خـەلیل، تاقانـەی هـاڕان هەردوکیان خەڵکی ئێـرە بـوون جـاران
ئایەی بیستوحەوت سوورەی عەنکەبووت لـە (جَلاَلَـیْن)و (جَمَـلْ)دا بـە جـووت
ئەفـەرموون کۆچـیان (مَعَ الإفتِـراقْ) لـە ناوەڕاسـتی (سَـوَادُ الْعِـرَاقْ)
بـۆ ئـەرزی شـام و فەلەسـتین فـەرموو واتە کوردسـتان جێـی ئـەوان بـوو زوو
بـەڵام مـن بـۆ خـۆم کۆسـام نـەدیوە بیسـتم لەوانـەی ئەوێـیان دیـوە
ئـەڵێن ئێسـتاکە نـاوی گـۆڕاوە هـەر بـەو بۆنـەوە نـاوی نـراوە

(ئیبراهیم خەلیل) ئەو شوێنە پاکە
بەلاّم بڕێ تر ئەڵێن ئەم ناوە
ئەمەش هەر قسەی دەماودەمیی بوو
یەعنی گۆڕانی کۆسا بەم ناوە
جا ئەگەر وابێ ئەی برای جەلیل
ئێستە ئەو گوندە بۆتە ناحییە
سەر بە (دهۆك)و قەزای (زاخۆ)یە
لە بەیضاویشدا سوورەی ئەنبیا
ئەفەرموێ هۆزی (بَنُو حَظِيرَه)
لە گوندی کۆسا بەستیان مەنجەنیق[٣٦]
بە قسەی بڕێ تر گوندێکە کۆسا
واتە سنووری (سَوَادُ الْعِرَاقْ)
ئەچوو، لەوەودوا تەسك کراوە
بە حوکمی مێژوو، شەهادەی تەئریخ
نە دۆس نە دوژمن بەم خاکە جوانە
چونکە یەك رەگەز، یەك خاك و ئاوە
بە هەر لایەکدا تۆ هەڵبڕی چاو
سنووری وەهمیی مەکەن بە پەرژین
هەر نەبێ بڵێن برامان برایی
واتە بۆ مافی کۆمەڵ برا بین
برێکیش ئەڵێن لە (سووسێ)ی ئەهواز
کە ئێستە بە (شووش) ئەو جێ مەشهوورە
کە هۆی شانازیی کوردانە، کاکە
بەناوی شەخصێك وا نێو نراوە
نەك بەڵگەی روون و خاترجەمیی بوو
ئەنا بۆ کۆسا شکم نەماوە
ئەمەش بزانە (ئیبراهیم خەلیل)
لەسەر سنووری ئەرزی تورکییە
پێش ئەویش ئێرە جێی من و تۆیە
باسی مەنجەنیق وا ئەدا ئەکا
کردیان بۆ نەمروود ئەو جۆرە بیرە
بۆ (خَلِيلُ اللهْ) بە وەجهی تەحقیق
لە نزیك (بابل) کە کورد بوون ئەوسا
تا نزیك بابل لە ئەرزی عیراق
تا ئەم سنوورە کە ئێستە ماوە
لە کورەی زەویی تا کورەی میرریخ
ناتوانێ نەڵێ خاکی کوردانە
بەشێکە و خودا بە ئێمەی داوە
خاکی بێگانەی نەکەوتۆتە ناو
با وەك برا بین، پێکەوەش بژین
بەلاّم بە زاهیر کیسەمان جیایی
بۆ سوودی فەردیی قەیناکا جیا بین
چاوی بە دنیا هەڵێنا بە ناز
بەلاّم لە عەقڵ و لە نەقڵیش دوورە

بە قسەی برێ تر لە نەسەب زانان
کورد لەگەڵ خەلیل ئامۆزا زازان

واتە هەردوکیان لە نەسلی سامن
بەرەی دوو بران، لە یەك نەمامن

بەڵام کورد بە دوو پشت ئەگەن بە سام
خەلیل بە هەشت پشت بێ قسە و کەلام

کورد و گورج هەردوو کوڕی ئێرانن
ئێرانیش کوڕی ئاشووره[٣٧] بزانن

ئاشوور کوڕی سام، سامیش کوڕی نووح
بۆ دین و دنیا ڕەهبەر و نەصووح

برێك لەوانەی کە نەسەب زانن[٣٨]
ئەڵێن بەرەی کورد گشت موسڵمانن

واتە تابیعی دینی (سَمَاوِي)ین
لە دیندا ئەڵێی سۆنە و مراوین

مەگەر بەشێکی کەمی لەمانە
چووبن بە هەڵە بەپێی زەمانە

بەڵام بەرەی گورج بە پێچەوانە
لەسەر کوفر چوون بەبێ بەهانە

تا دینی ئیسلام گەیشتە ئێران
کە بەو ناوەوە مەشهوورە ئێران

ئەنجا ئەوانیش وەکو کورد وێڕا
روویان لە یاسای کوفر وەرگێڕا

یەعنی بەشی زۆر دینی قبووڵ کرد
کەمێکیش هەروا بە کافریی مرد

ئەنجا بۆ خەلیل بڕۆین بەرەو ژوور
ئەگا بە تارەح، تارەح بە ناحوور

ناحوور بە شارۆخ، شارۆخ بە ئەرغۆ
ئەرغۆ بە فالەغ، باش بیزانە تۆ

ئەنجا لە فالەغ بە عابیر ئەگا
عابیر لە شالەخ هاتۆتە دنیا

شالەخیش کوڕی ئەرفەخشەدە و ئەم
کوڕی سامە خۆی، خاترت بێ جەم

سامیش کوڕی نووح (نَجِيُّ اللّٰه)یە
کە لەجێی ئادەم (صَفِيُّ اللّٰه)یە

واتە ئادەمی دووهەمە بۆمان
کە نەسلی دووهەم لە ئەو بەجێ مان

نووحیش بە خۆی و سەفینەی نەجات
کە تۆفان هەستا پڕی کرد وڵات

چی لەگەڵیا بوو لە نەسلی بەشەر
یاخۆ لە دوو دووی نەوعی گیانلەبەر

پاش گەڕانی زۆر لە بەرز و نەویی
لە چیای کوردستان نیشتە سەر زەویی

لە ساڵی تۆفی تەنوورەی تۆفان
بێشکەی[٣٩] دووەمی خاکی کوردستان

کەشتیی لەسەر ئاو گەڕا و خولاوە      تا لەسەر کێوی جوودیی وەستاوە
کە هاتە خوارێ بۆ بینای ژیان      بینای کرد لەوێ گوندی هەشتییان
بۆیە بە (هەشتیان) ئەم دێ لەو ناوە      مەشهوورە ئێستاش ئەو گوندە ماوە
چونکە هەشتا کەس لەو قەومە هاتن      لەگەڵیا، بۆیە ئەهلی نەجاتن
لەپاش ماوەیەك لەو جێگەی دڵگیر      لەوێش ڕۆیشتن بۆ شاری جزیر
ئێستاش مەرقەدی ئادەمی دووەم      هەر وا لە جزیر، خاترت بێ جەم
بوو بە جێگەی نووح ئەم ناوبەناوە      جا لەوێش بۆ لای مووسڵ گەڕاوە
تا جۆگە و چۆمی وەدەر خستەوە      باخ و درەختی وەبەر خستەوە
بە خۆی و سام و یافیث و بە حام      سێ ڕۆڵەی بەرز و بەهێز و بەفام
لەو دەغڵ و دان و میوەی درەختە      کە ماوە لێیان لەو ڕۆژە سەختە
سەرلەنوێ دەسیان کرد بە کشتوکاڵ      لە ئەرزی مەباح، لە تۆوی حەلاڵ
گەلانیش چین چین لەوان بەدواوە      بەرەو پێشکەوتن هاتن بەملاوە
بەعزێك بۆ دین و دنیا خەریك بوون      بڕێکیش لە دین تەواو تەریك بوون
تا ئالای بەرزی ئیسلامِ شەکاوە      سوپاس بۆ خودا گەییە ئەم ناوە
شوعلەی پەخشان بوو، گەیشتە لامان      بۆ گەلی کوردیش بوو بە چرامان
بۆیە هەر ئەبێ تا ڕۆژێ مابین      بۆ ئەم ڕەحمەتە مەمنوونی خوا بین
پشت بە پشت هەروا بەم چرایەوە      دین لە کوردستان ئەگەشایەوە
بۆ هەرکوێ ئەچووی پڕ بوو لە زانین      لە عیلمی زاهیر تا عیلمی باتین
پێویستی بە کەس نەبوو لەم ڕێدا      زۆر کەسیش بارگەی لێرە فڕێدا
لە فارس لە تورك، عەجەم تا عەرەب      لێرە فێر ئەبوون علووم و ئەدەب
ئێستە لەجیاتیی ئادابی دینیی      بۆتە پێڕەوگەی فەسادی دینیی
نە دین نە ئەخلاق نە یاسا ماوە      لە هەرچی بارە کەوتۆتە دواوە

خوایە تۆبیت و رووحەکەی خەلیل          ئا لەمە زیاتر نەمانکەی بە دیل
بە دەس ئەوانەی تۆ ناپەرستن          رێگای ئازادییش لە گەڵ ئەبەستن
دووبارە هەڵکەی کزەی شەماڵێ          رەگ و ریشەیان لە بن بماڵێ
با کەم گەلانی ماف و بەش خوراو          لە ژێر ستەمدا پێشێل بن تەواو
خۆ تۆ هەرچێکت مەیل بێ وابێ          کێ هەیە بڵێ نابێ ئاوا بێ
دەی سا بە کەرەم کورد و کوردستان          هەتا نەبۆتە خاکی کوفرستان
بگەی بە دادی بە باری رەحمەت          لابەی لەسەرمان تاوان و زەحمەت
چرای هودای خۆت رادێرە بۆمان          کەسێ دادپەروەر بنێرە بۆمان
خۆ ئەگەر ئێمەش نەفام و پەستین          سەرخۆشی بەزمی نەفسین و مەستین
لەبەر ئەوانەی موخلیصن چاکن          یاخۆ منالن بێگەرد و پاکن
دیسان بەزەییت بێتەوە پێمان          دەستی دوژمنان کۆتا کەی لێمان
تا هەرکوێ ئەڵێن خاکی ئیسلامە          دەری خەی لە ژێر ئەم بەلا عامە
بەڵکە ئەمجارەش هەڵێ بێتەوە          دین لە کوردستان زیندوو بێتەوە
بەرەی داهاتووش نەچەقێتە زەل          بێ دەرەتان و کردەوە و ئەمەل
دینی لە دەس چێ، دنیاشی نەبێ          بە واتەی خۆمان لە دوو جەژنە بێ
خودا تۆ نەیکەی، ئەگەین بەو رۆژە          ئەگەر هەمووشمان قڕ بین یەك رۆژە
جا ئێوەش برا و خوشکانی ئازیز          حەیفە هەر خوو دان بە دنیای ناچیز
ژیرانە هەرکەس لەبەر خۆیەوە          پاڵ بدا بەلای خودای خۆیەوە
بە بۆتەی تۆبە قاڵ کەوە لاشەت          تا لە دەس نەچووە ئەم ژینە باشەت
هەوڵ و تەقالای بەرهەمی چاکە          ئیشوکارت بێ لەم ئاو و خاکە
هەروەك بۆ دنیا ئەکۆشیی بە دڵ          برێکیش بۆ دین دڵت بێتە کوڵ
سوود و زیانت بزانە کامە          لە دوو رۆژ تەمەن چیت ئەوێ، مامە

هەر کاتێ توانیت چڵك و چەپەڵیی     لە خۆت داشۆری، نەکەی تەمەڵیی
ئەوکاتە جێگەی ئومێد و خێری     نە خۆت نە کۆمەڵ حەرام نەگێڕی
ئێمە هەموومان بە قورئان براین     دەبا کەم بڵێین لە یەکتر جیاین
دەبا وەك برا گشت یەکتر بگرین     پێکەوە بژین، پێکەوەش بمرین
دنیا نموونەی رۆژی جەزایە     مەزرەعەی بێ دین خەرمانی کایە
هەرکەس بیەوێ دڵسۆزی گەل بێ     ئەبێ بەم شێوە چاوەڕێی هەل بێ
حازر بێ سەری لە دار هەڵخرێ     وەباڵی خۆی و گەلیش هەڵگرێ
ئەبێ رێی خەبات بدۆزێتەوە     هەلووك لە هەوا بقۆزێتەوە
نابێ لەرێوە قۆڵی هەڵماڵێ     بۆ دوو رۆژ خەبات یاخۆ بۆ ساڵێ
بە چەند کەس حیزبێ بنێ پێکەوە     لە تەنگانەشدا خۆی بدزێتەوە
ناوێ پەیدا کا، بەڵام کامە ناو     سەری خۆی دەرکا و گەلیش خاتە داو
بەناوی شۆڕش بۆ گەل و وڵات     کۆمەڵە گورگێ بەرداتە وڵات
بچێتە هەندەران بۆ خولانەوە     گەلیش بە دەردی ئەو تلانەوە
کە تۆ نەتوانی ببی بە مەڵهەم     با زامی کۆنیش نەبێ بە وەرهەم
لێی گەڕێ لە گەل بپارێتەوە     با لەگەڵ هاومال بحاوێتەوە
کە تۆ حاڵەکەت پێ چاکتر نەبێ     با داشە هارەی لێ هارتر نەبێ
بە بەڵکەم بەڵکەم، بە ئەمجار ئەمجار     کەم بیخە قورگی ئەژدیهای نابار
گەلێ نەزانێ پشت بە چی بەستێ     کاکە بۆ خەبات چۆن ئەبێ هەستێ
هەر کاتێ توانیت، گەلت کرد بە یەك     ئەوسا بڵێ من خۆم دا لە مەحەك
ئەنا تا گەلت لە تۆ بەش بەش بێ     ئەبێ تا ماوە هەر چارەڕەش بێ
تۆش ئەگەر دەستت نەکەی بە چوار دەست     بە دەستێ چەپڵەت بۆ ناتەقێ قەت

***

## باسی دەمەتەقەی سیروان و ڕێبوارێك

لێرەدا شتێ هاتەوە بیرم    پەندی پێشینان پیاوانی ژیرم
ئەڵێن ڕێبوارێ چۆمێ هاتە ڕێی    بێ بوار هەڵی کرد دەلنگی دەرپێی
خۆی وتی بە خۆی کۆنە سیروانە    چۆمە حیزەکەی وڵاتی خۆمانە
هەروا لێی ئەدەم تا بەم پێڵاوە    گۆمیش بێ هیچە، لای من تەنکاوە
لەلایێ تریش ئەیڕوانی بۆ لای    ڕووحی نەمابوو لەبەر هاژە و بای
بەڵام هەر سوور بوو لەسەر لێدانی    هەرچەن بواریشی پێ نەئەزانی
جاریش بوو ئەیوت کەی ئەمە ڕێتە    مەگەر نازانی سیروانە شێتە!
هەروا بەو حاڵە لەوێ ئەخولاوە    پێی تێ ئەخست و ئەهاتە دواوە
یەکێ لەو پیرتر ئەهات لەو دوورە    وتی چی ئەکەی بەم خوار و ژوورە؟
قەدیمی ئەڵێن تا نەگەی بە بوار    قاچت هەڵمەکە مەڕۆ بەبێ بوار
نەکەی لێی نەدەی، ئێستە بەهارە    بۆ[٤٠] کەس لە گیانی ئازیز بێزارە!
سەبری لێ بگرە با کەم بێتەوە    خۆ ڕۆژ لە ساڵان نابڕێتەوە
بڕوانە بۆ هەل، بڕۆ بەرەو پێش    نەبادا گۆمێ گەورەت بێتە پێش
نە زۆری مەلە و نە پێت بێنێ    بتخاتە گێژ و بشتخنکێنێ
ئەویش کە زانی قسەی ئەو پیرە    ڕاستە و بە ڕاسیی پیاوێکی ژیرە
سیروانی جاران نییە لەو کاتە    بە عەینی ئەڵێی دیجلە و فوراتە
نەك هەر ئەم تەنیا بۆی لێ نادرێ    تەنانەت فیلیش بەرگەی ناگرێ
جا ئەمجار ڕێبوار کەوتە قسەی خۆش    بە نەرمە نەرمە، ژێرانە سرپۆش
ڕووی تێکرد وتی سیروان چی ئەکەی    کە لێشت نەدەم هێشتا هەر ئەمبەی؟
کە من دەنگ ناکەم تۆ هەر جەنگ ئەکەی    ڕێگای وشکیشم هەر لێ تەنگ ئەکەی

ئەگەر من لێشت نەیەمە پێشێ          ئێستا بەبێ هیچ هەر دڵت دێشێ؟
خۆ دنیا دایم هەر بەهار نابێ          کەم بهارێنە، رۆژێکیش دادێ
پایز و زستان پێکەوە هەستن          گژم و تەنکاوت لەیەك ببەستن
ئەوسا بە خۆم و کەر و خورجێنم          دێم بەسەر سکتا پشتت ئەشکێنم
فیز مەکە بە خۆت بەم شەپۆلانە          کە ئەمرۆ هەل و رۆژی چۆمانە
دنیا گۆنگەڵی زۆری گێڕاوە          زۆری وەك تۆم دی چۆڕی لێ بڕاوە
بیری رێبواری بێ هێز و تینت          ببێ لەم کاتە، هەڵنەسێ قینت
پیاوەتیی ئەمرۆ باشە کە زۆری          دڵ لە رێبواران نەکەی! نەگۆڕی
رێبواریش رۆژێ رۆژی دێتەوە          وەکو عەزیای زل بەدا پێتەوە
وا هەڵت لووشێ چۆڕت لێ بڕێ          دەستەوەکەرییت بۆ لەگەڵ نەکرێ
سیروانیش وتی من ئیشم بە تۆ          ئەگەر لێم نەدەی هیچ نیە، بڕۆ
هەتا نەمخەیتە شەپۆل و خوڕێن          من چیمە لە تۆ! لە دەشتی کرێن
کە تۆ بەرپەنگم نەدەی بە شەخەڵ          خوای ئەکرد خۆتت ئەخستە مەشخەڵ
دە تۆ بەرد و دار مەخە رێبازم          منیش لەگەڵتا هاوڕێم ئەسازم
من بۆ ئیشی خۆم ئەجووڵێم ئەڕۆم          شوێنی واش هەیە لێی ئەبم بە گۆم
هەرکەس بێ خۆیم تێ هەڵقوڵێنێ          گیانی شیرینی بە دیاریی دێنێ
چۆن ئەبێ هەرکەس هەستا لەرێوە          بەبێ پرس و را بمدا بە پێوە
وا گومان بەرێ جۆگەلە میزم          کۆنە سیروانی سەرشۆڕ و حیزم
لەمپەڕ بۆ ئەوپەڕ دڵنگی هەڵکا          لەمبەرەوبەریش جۆگەم لێ هەڵکا
تا هەڵنەچۆڕێم ئاوم لێ بگرن          گیانلەبەرانی ناویشم بمرن
هەرکەس گومانی وابێ لەگەڵما          هەتا من مابم قینی لە دڵما
سەد کەڕەت بڵێ من مەلەوانم          مەگەر نازانێ منیش سیروانم!

هەر کاتێ هێزم لە خۆم دا تەواو بۆ هەموو شوێنێ ئەبم بە لافاو
نە دەشت ئەمێنێ نە شار و نە دێ لرفە و هاژەی من لەبن گوێی نەیێ
تەنانەت قاز و سۆنە و مراویی هەرچی پێی بڵێن گیانداری ناویی
کە کەوتمە تاڤگە و شەپۆل لەسەردا سەری لێ ئەکەم بە هەژگ و بەردا
بڕستی ئەبڕم هەناسەی ئەچنم تا جارێکی تر نەڵێ من ئەمنم
پێشینان ئەڵێن نازانی چییە نە ئاو نە ئاگر ئەمانی نییە
خۆت مەخە داوی ئەم دوو بەڵایە دووردەپەرێزیت سوودی تێدایە
با مەلەوانی گۆم و دەریا بی یاخۆ دەروێشی غەوسی بەغدا بی
تۆ کە خۆت دانێی بە پیاوێکی ژیر نابێ ئەم پەندەت قەت بچێ لەبیر
ئەنجا ڕێبواریش وتی دەی باشە کەم بە خەیاڵی پڕ هاشەوپاشە
دنیا لە عالەم وەتەنگ هەڵبێنە چیتە! دەماخت تینوو بە خوێنە
ئەڵێی لە شوێنی زوحاکی زەمان دێیە دەر، تینووی بە مێشکی ئینسان
سەری لاوانی گەنج و بێ خەتا ئەبڕیی بۆ ماری سەر شانت، هەتا
چەند ڕۆژێ زیاتر تەمەن بەیتە سەر خواردەمەنیشت بێتە مێشکی سەر
قەت نەکەویە نێو کەند و کۆژەوە بیرێکت نەبێ بە دوارۆژەوە
پێیم وتی دنیا دەوران دەورانە واش ئەبێ بڵێن سیروان قڕانە
جگەرسووتاوێك لێت بێ بە کاوە لەتاوی ڕۆڵەی کە سەربڕاوە
کەوڵە پۆستەکەی بکا بە دارێ سەرلەبەیانیی هەتا ئێوارێ
ڕۆڵە کوژراوی دەشتی شارەزوور جەم بن لە دەورت لە خوار و لە ژوور
ڕامالن هەرچی وا لەناو سکتا دەردەکەی زوحاك ببەن بە دڵتا
نە تەنکاو نە گۆم، نە بەرد و دارت نە خۆت نە هاژەت، نە شوێنەوارت
نەیەڵن ناوت لە ڕۆژگارا تا کەم کوڕی خەڵك بەی بەدەم مارا

سیروانیش تۆزێ بیری کردەوە     هاشە و هوژەی خۆی لەبیر بردەوە
زانی کە قسەکەی زۆر ئەقڵ گیرە     دنیای بێ وەفا هەرچەن دڵگیرە
بەڵێ بەزۆریی زۆردار سوار ئەبێ     رۆژێ واش ئەبێ پیادە سوار ئەبێ
کەوابوو با من هەر لە ئێستاوە     هەرچەن قینیشم زۆر هەڵستاوە
لەگەڵ رێبوارا بسازێم چاکە     ئێمە عەبدی خواین، خوداش بێباکە
زۆرمان بیستووە لە خاوەن ناوان     وا لە بن هاتوون وەك موو لە چاوان
جا وتی باشە رێبواری نازیز     من بۆ ئێستە نا، بۆ فەسڵی پایز
ئەبین بە برا، بەڵام من کاکەم     من زووتر گەورە و خەڵکی ئەم خاکەم
ئەگەر تۆ ژێر بی بەشت پێ ئەدەم     بە مەرجێ نەڵێی من برا گەورەم
بۆ خۆت تێر ئەکەم بێ کێشە و گێرە     جارجار ئاویشم هەر پێ بدێرە
بۆ کشتوکاڵ و بەرهەمی ژینت     تۆش کەم بیرکەوە لە کۆنە قینت
ئەگەر بە رێکەوت سەفەر هاتە رێت     قەیناکا وەرە بەقەد جێگە پێیت
سەر داخە و بڕۆ بۆ هەرکوێ ئەچی     دەنگ ناکەم ئەگەر لە خۆت دەرنەچی
رێبواریش وتی ئەمەم بەلاوە     قبووڵە، کاکیی بە تۆ بڕاوە
ئەی نابێ منیش لەم ئاو و خاکە     بەشێکم ببێ وەك برا! کاکە
ناعیلاج برێك با پێ داکێشم     جاری وا ئەبێ کە خزم و خوێشم
دێنە لام ئەڵێن ئەی کوا بەشی تۆ     ئاوایە مانای برابەشیی تۆ!
سا ئەگەر وابێ مردنت چاکە     کە تۆ رازیی بووی بەم بستە خاکە
با رووم بێ منیش بڵێم براتم     هەر ئەبێ بڵێم خەڵکی وڵاتم
ئەگەر ئاوابێ، بەم نامەردییە     فەرقی تۆ لەگەڵ دوژمندا چییە!
سیروانیش وتی کەم بڵێ کەمە     جارێ دوو وتت، سێ خاترجەمە
پەندی پێشینان هەر یەکجار خۆشە     ئەڵێن زۆر وتن هەر قورئان خۆشە

وازم لێ بێنە وازت لێ دێنم	کەم بە بۆڵەبۆڵ بکەوە شوێنم
با لەوە زیاتر لەسەری نەڕۆین	باشە چیمان بوو پێکەوەی ئەخۆین
بەلام چیم پێدای شوکری خوداکە	بلّێ بەزیادبێ ماڵئاوا کاکە
ئاوایە حاڵی زۆردار و بێ زۆر	مەگەر هەڵگیرێ ئەم شەرعە بۆ گۆڕ
ئەنا کەی زۆردار خۆی دێتە پێشێ	بۆ حەق بەبێ زۆر ملی داکێشێ
جا چونکە خۆشم هەر وامئەزانی	ئەم جۆرە شەرعەم ڕەوا نەزانی
خۆم بۆ نەگیرا لەگەڵ ئەم و ئەو	وتم بەسیەتی با هەستین لە خەو
خۆ ئەگەر پێشی سیروانیش نەگرین	نابێ دانیشین تا ڕۆژێ ئەمرین
خەریك بین ئێمەش لەقەدەر خۆمان	لە کانیی و کارێز لە وردە چۆمان
بەپێی لێهاتن جۆگێك هەڵبەستین	ئەگەرچی زۆریش کەم هێز و دەستین
ئەوانیش خۆیان هەروا خەریك بوون	بەلام کەمێکیش کاڵ و فەریك بوون
دڵنیا نەبووم تەواو لە رایان	چونکە ناوی دین کەم بوو لەلایان
وتم قەیناکا دەنگ ناکەم جارێ	بزانم ئەم هەورەش چی لێ ئەبارێ
جا وتیان ئاشێ ئەنێین پێکەوە	هەتا گەل ماوە هەر بخولێتەوە
وەك ئاشی گەلان لەئیش نەکەوێ	بۆی ئەبەین هەرچەن تێچێنی بوێ
خۆ نیشتمانی خۆمان بەپێزە	لە خوا بە زیاد بێ زۆر حاسڵ خێزە
لە هەرکوێ ئاو بوو بە ئاوی جاریی	کە ئاویش نەبوو بە دێمەکاریی
ئێمەش ئەمەمان با لەبیر نەچێ	ئاو بە دەستی زۆر بەردو ژوور ئەچێ
ئەنجا خەریك بوون گشتی لە خۆشیی	بەگوێرەی توانا بۆی تێ ئەکۆشیی
کە دیتم خەبات سەری هەڵداوە	برینی کۆن و تازەم کولاوە
ئەترسام دیسان لەبەر دەم شڕیی	بانگ کەن: ئاشەوان ئاشەکەت کرپیی[٤١]
تێچێنیش نەما و ئاوەکەش وشکە	تاخۆ قرژانگە یا جرجە مشکە

دسیان پێ گەیاند لەو لابەلاوە    بێگومان بۆیە لە ئیش وەستاوە
کە چووم سەیرم کرد لەمسەر بۆ ئەوسەر    هەریەك لەلایێ سەریان هێنا دەر
یەکێکیان وتی من کە چل چنگم    بۆ ئاوی ژینت شێر و پڵنگم
ئەوی تر ئەیوت من کارێزکەنم    بیر و کارێزی وا هەڵئەکەنم
نەك تەنیا ئاوی ئاشت ئەڕێژم    بناغەی ماڵی ئاشیش ئەبێژم
هەمووی بەسەریەك دائەتەپێنم    ئەیکەم بە زەویی و داشی ئەچێنم
ئێرد کەی جێگەی ئاش و ئاشێڕە    بە کاروانی کەر بار بخەن لێرە
ئێمە چەند ساڵە بەم شوێنە فێرین    بەم ئاوە دەشت و مەزرا ئەدێرین
ئەیکەین بە باخ و باخچە و بە گوڵزار    بۆ هاتوچوونی هەوارگەی بەهار
لە ژێر زەویشدا لەغەم لێ ئەدەین    بۆ کاتی سەرما پەنای پێ ئەبەین
جاری واش هەیە بە ئاڵتوون ئەگەین    بە نەوتی رەش و سپی و روون ئەگەین
دەیان کانگەی تر وا لەو ژێرەدا    چۆن دێڵین ئێوە بێن تا بێرەدا
هەروا بۆ دەریاش لێرە و لەوێوە    ئەڕۆین تا گشتی ئەدەین بەپێوە
هەرچی بەسوود و بەکەڵکە لەوێش    دەری ئەهێنین بە مرخێش مرخێش
ئەیخەینە پاپۆڕ بۆ قەراخەوە    جا ئێوەش بمرن بۆی بە داخەوە
نەکەی ناوی خۆت بنێی ئاشەوان    جرجرت ئەکەم خراپتر لەوان
منیش زۆر سەرم سوڕما لەو باسە    وتم هەر سەبر و خۆگرتن خاسە
بە هەر زمانێ کە خۆم ئەمزانی    کەوتمە وتووێژ بە نەرمیی و جوانیی
وتم وا چاکە با بڵێم براین    ئێمەش دوژمنی ئاژاوە و هەراین
ئێمە هەموومان لقی یەك دارین    کۆنە هاوماڵی پار و پێرارین
با لە عەدڵ و داد بیرێ کەینەوە    سەرێ لە مافی مرۆڤ دەینەوە
ئێوە بە چوار پەل هەروا بە چل چەنگ    ئێمەش با بڵێین بە دوو دەست و چەنگ

نیوە لە نیوە و یەك بە هەشت بێدەنگ     هەرکەس بەشی خۆی، با نەیکەین بە جەنگ
هیچ نەبێ ئێمەش گیانلەبەرێکین     پێویست بە جێگە و دەشت و دەرێکین
زۆر نەبێ خۆ کەم پێویستە بۆ ژین     جا ئەگەر وابێ ئێمە چۆن بژین
وتیان ئەم کابرا یەکجار بێهۆشە     ئەڵێی نەیبیستووە (نێرە بێدۆشە)
بڕۆ داکەوە لاچۆ لەبەرچاو     ئەگەر سووڕێ دەین لە سووچی کڵاو
نازانی بە خۆت تووشی چی ئەبی     ئاوات ئەخوازی کە هەرگیز نەبی
حاڵییم بوو ئەڵێن گرۆی ئیبلیسین     حازر نین هەرگیز کە حەق ببیسین
وتم وا چاکە بێمەوە دواوە     چش کەم لەو ئاشە و لەو زەوییە و ئاوە
بۆ چارەسەری گەلی چارەڕەش     هەر براکەی خۆم بگرمە باوەش
برا هەرچۆن بێ هەر برا چاکە     گۆشتیشم بخوا ئێسکم لەت ناکا
ئەوان بەهەرحاڵ، کلکە نەوتینە     دیم لەوان زیاتر دڵ پڕ لە قینە
کۆڵان بە کۆڵان هەر بە چاو و راو     خەریکبوو رێگەم لێ بگرێ تەواو
بە موفتەبێژیی، شارە گەورەکەی     بۆ باردکەڵڵای ئاغا گەورەکەی
پڕ کرد لە قیڕە و لە هەرچیی و پەرچیی     خۆشم نەمزانی بۆچی! لەبەر چی
وەك ماری زامدار پێچ ئەدا لە خۆی     خۆ من زیانم قەت نەبوو لەبۆی
بێجگە چەند جارێ راسپێریی دەمیی     بە مام ریشۆڵەی شێت و پەرکەمی
ئەویش[٤٢] بە راسیی لەبەر دڵپاکیی     بۆ خۆی و گەل و وڵات و خاکی
کە پشتم هەڵکرد لێیان لەداخا     ئەترسام جن جن بمبەن بە زاخا
هەستام بە ناچار هاتم بەرەو ماڵ     سەری خۆم دەرکرد لە جاڕ و جەنجاڵ
بەڵام کام دەرچوون! بە سەد فەلاکەت     درۆت بۆ ناکەم بە گیانی کاکەت
کەچیی قرژانگ و جرج و کلکەکەی     بەربوونە گیانی شار و خەڵکەکەی
هەریەك بە رەنگ و دەنگێ تێوە چوون     ئەتوت جەجاڵن بە عالەم وەر بوون

لەپاش چەند رۆژێ بوو بە قاڵەقاڵ  تێکەڵ بوو تۆزی کەرسواران، چوارناڵ
وەکو هەوری رەش رووناکیی بڕاند  ئەم لە ئەو، ئەو لەم، لێکیان ئەمڕاند
عەبا بەکۆڵ و بەچکە تووڵە مار  هاتن لەسەردا سەر لینگە دەستارِ
بەناوی دین بوو تیپ و سوپایان  نە دین نە مەنتیق نەبوو لەلایان
شیعاریان ئەدا نە غەربیی و نە شەرق  هەڵخەڵەتێن و نەفام و ئەحمەق
بە زاهیر بۆ دین وەك دیزەی تەنوور  قولیان هەڵئەدا دەم بە لوورە لوور
ئەیانوت ئێمەین خاوەنی مەکتەب  دین نە هی کوردە و نە بەشی عەرەب
لەگەڵ ئەحزاب و گرۆی سیاسیی  هەموو چوون بە گژ ئیسلامی راسیی
بەشێکی زۆریش لە ساویلکە دڵ  ئەچوون بەردوپیر مەنزڵ بە مەنزڵ
بە هەر شێوەیەك بکرایە بۆیان  دریغیان نەبوو لە گیانی خۆیان
داخی کەس منی نەکوشت ئەو ساڵە  وەك برێ مەلای چەوت و بەتاڵە
ناوی مەلایان نابوو لە خۆیان  مێزەرە و عەبا بەس بوو لەبۆیان
مێشك شەڵەقاو، گۆڕابوو حاڵی  بە دەم چەنەباز، بە دڵ ناحاڵیی
نەیانئەزانی مانای ئەو دینە[٤٣]  درۆ و نیفاقە و حەسوودیی و قینە
چاکی کەوایان لێکرد بەلادا  تێکەڵ بوون لەگەڵ سوپای خەتادا
هەستی مەلایی و دین و کردەوە  هەموویان لەبیر خۆیان بردەوە
بۆ تەماداریی دەوری کۆماریی  هەریەك بەناوێ خۆی ئەکرد دیاریی
پشتگرتنی مەلا لە ئەهلی فەساد  کەی بەمە ئەڵێن (سَبِيلُ الرَّشَادْ)!
مەلا بە راسیی ئەگەر مەلا بێ  ئەبێ لاگیری دینی خودا بێ
نەك دینێ خەڵك بینێ پێکەوە  کۆمەڵێ نەزان لێی کۆبێتەوە
ئەبێ دین لەگەڵ درۆ و خەرافات  بە مەعنای واقیع لەیەك جیاکات
هەزار و چوارسەد ساڵی تەواوە  ئەم دینە بە هۆی مەلاوە ماوە

بەڵام کام مەلا! بە دین دامەزراو        وەك بەحر وابێ، نەك جۆگەی قوڕاو
نە بۆ جاه و ماڵ، نە بە ترس و لەرز        نە بۆ سەرۆکیی و نە مەقامی بەرز
بە هیچ نەگۆڕێ، دڵی لیڵ نەبێ        بەهەڵەش نەچێ، شێت و وێڵ نەبێ
ئەگەر خەڵك هەمووی بکشێتە دواوە        ئەو زیاتر پاڵدا بەلای خوداوە
ئەنجا واریسی ئەنبیایە ئەو        ئەنجا ماقوولی لای خودایە ئەو
ئەنجا شانازیی ئەکا پێغەمبەر        بەو بزورگانە لە سارای مەحشەر
ئەنا حەدیسی فەخری کائینات        ناویان بە مەلای قەڵب و سووء ئەبات
ئەگەر زیانیان هەر بۆ خۆیان بێ        وەك زێڕی قەڵب، ڕێزت بۆیان بێ
چونکە پێغەمبەر ئەفەرموێ: ئەمان        وەکو هێڵەگ وان لەبۆ موسڵمان
ڕای ئەگەیێنن چی باشە بۆ خەڵك        بۆ خۆشی وێنەی هێڵەگە و کەپەك
کەوابوو ڕێزی لای موسڵمانان        پێویستە چونکە لە دیندا زانان
خۆ ئەگەر قەڵب و زیان گەیێن بوون        نیسبەت بە مەزهەب تانە وەشێن بوون
واتە لە ئەسڵی دین و بڕواوە        دەسیان تێوەدا لە ڕووی هەواوە
ئەمانە مەلای سووء و چرووکن        بە تەرازووی دین بێ‌نرخ و سووکن
خەڵکیش ئەبێ زوو لێیان دوورکەوێ        هەرکەس بە ڕاسیی خودای خۆی ئەوێ
چونکە ئەمانە هەر بەناو مەلان        ئەنا بە ڕاسیی بۆ عالەم بەڵان
چونکە ئەمانە ئەسیرن بە دەس        بیروڕای غەڵەت بەگوێرەی هەوەس
ئەمانە مەلای ئاخر زەمانن        هەر خۆ پەسەند و خۆ بە زل زانن
بەناو واریسی (أَحْسَنُ السَّلَفْ)        (لاَ رَيْبَ فِيهِمْ هُمْ بِئْسَ الْخَلَفْ)
دڵیان کرمۆڵە و بە زوبان وریان        بەهەڵەدا چوون، ئەبوا بگریان
دڵ کە کرمۆڵ بوو لاشەش کرمۆڵە        تانوپۆی فکریش پووچ و شڕۆڵە
قسەی زانایان زۆر ڕێك و ڕاسە        ئەوەندە ڕاسە بێ قسە و باسە

ئەڵێن گۆشت گەنیی بە خوێ چاك ئەبێ — ئەی کە خوێ گەنیی بە چی چاك ئەبێ !
هاوار بۆ گەلێك خوێکەی بۆگەن بێ — ئەبێ لەو کاتە نرخی خوێ چەند بێ
منیش کە زانیم بەو دەنگوباسە — قاچاغە لایان چی قسەی راسە
حاڵییم بوو تەواو کە هۆی ئەم بۆیە — وەك زبڵ و زاڵە و ژێری پشکۆیە
وتم بەم ناوە عالەم جەم ئەکەن — بەلام خەیاڵی تەختی جەم ئەکەن
ئەم های و هوویە بۆ تەخت و تاجە — بۆیە بازارتان گەرم و رەواجە
ئەنا کێ هەیە لەمڕۆدا وا کا — بۆ دینی راسیی چەقرەسەما کا
ئەمجارە هەڵسام بەرەو نیشتمان — مەڵبەندی باوا و ماوای گشتمان
ئەوانەی وتیان دەمڕاسی هۆزن — یا بۆ گەلی کورد راس و دڵسۆزن
پێیم وتن کاکە ئیتر ئەم هەلە — بۆ بیر و راوێژ چاکترین هەلە
بە بەربلاویی دەمیان تێوەدا — کەچیی دەرگایان لە دین پێوەدا
هەرچەن زۆرم وت ئەمان کەمیان بیست — ئەتوانم بڵێم یەك بە دە یا بیست
ئەوەی کە باسی نەکرایە دین بوو — بڕێکیان زۆریش قینیان لە دین بوو
هەریەك بۆ لایەك سازی لێ ئەدا — ئەگەییشت بە دین بازی لێ ئەدا
بەردی تەرازووی هەمووم هەڵسەنگاند — هێلکەی گشتیانم بە ددان شکاند
دەرکەوت بەردەکەی ئەمانیش سووکە — هێلکەی ئەوانیش پیس و چرووکە
نە تەرازووی ئەم سوود ئەگەیێنێ — نە هێلکەی ئەوان جوجکە هەڵدێنێ
ئەوەی مەبەست بوو لەمانیش نەبوو — خەمڕەوێنێکی دڵانیش نەبوو
بە نائومێدیی گەڕامە دواوە — چەن رۆژێ ڕەحەت پاڵم لێداوە
خۆم وتم بە خۆم سەر ئەنێمەوە — با منیش تاوێ بحەسێمەوە
تا کەی خوار و ژوور بەم کەل و ملە — تا کەی لە بەختی گەل بکەم گلە
گلەی ئەم گەلە دێتەوە سەر خۆی — کە رەنج ئەکێشێ و نایەتە بەر بۆی

چونکە هەر لەگەڵ کۆسپی هاتە بەر    دەستی لە کراسی زوو دێنێتە دەر
یاخۆ هەرکامێ دەستی خۆی ناسیی    زۆر زوو تێك ئەچێ مێشك و حەواسی
زوو شەق لە کاسە و سفرە و نان ئەدا    دەس لە یاسای گەل لە قورئان ئەدا
راستە کە ئەڵێن گەر ئەجەلی هات    بزن رێك ئەچێ تویشووی شوان ئەخوات
هەر ئەمە بۆ خۆی تەفرەقە دێنێ    گەل بە خورپەوە دائەچڵەکێنێ
تەفرەقەش هەرگیز کەس لێی نەدی سوود    بێجگە بێگانە و دوژمن و حەسوود
بۆیە رەنجی کورد خەزنەیە بۆ دژ    ئەو بەهێز ئەکا و خۆی ئەدا بە کوژ
جا گەلێ ئاوا پشتی لە دین بێ    تەنیا مەبەستی دوو رۆژە ژین بێ
نرخێکی بۆ دین لا دەس نەکەوێ    بۆچییمە ئەگەر ئەمرۆ سەرکەوێ
دنیای بەبێ دین بۆ کافر چاکە    کە ئەو لە رۆژی جەزا بێباکە
وا گومان ئەبا کە مرد تەواوە    باسی دوای مردن خەیاڵی خاوە
ئەو تا هەوڵ دا بۆ دنیا کەمە    گەداش بێ شایە و خەیاڵی جەمە
بەڵام کە مردیش بێ شك و گومان    جێگەی دۆزەخە ئەو لەپاش ئەمان
هەرکەس باوەڕی ببێ یا نەبێ    وەعدەی خودایە و بێ شك دێتەجێ
جا تۆ هەر بڵێ ئەو رۆژ و ساتە    قسەی مەلایە و هەر هاتەهاتە
برام ئەم فکرە هی شەرق و غەربە    دۆزەخ و بەهەشت حاسڵی زەربە
هەرکەس بە هەر جۆر تەرح و زەربی کا    بە چاك یا خراپ بە جێی خۆی ئەگا
تا تۆ دوژمنی دینت بێ پەنات    ناگەی بە ئاوات لە رێگەی خەبات
پشت بەستن بە خوا و دەست نانە نێو دەست    رەمزی ئیسلامە ئەتکا بە سەربەست
رەجات لێ ئەکەم، بە خەیاڵی خاو    دەسخەرۆ مەبە هاورێی ناتەواو
ئادەی بڵێ پێم کاکی خەباتگێڕ    ماندوونەناسی دەر و دەشت و لێڕ
هەڵگری ئاڵای شەکاوەی کوردیی    شێری نێو بێشە و مەیدانی مەردیی

چیت کەمە لە خەڵك بۆ سەربەخۆیی      بێجگە تەفرەقە و منیی و تۆتۆیی
چیتە لە دوژمن بێگانەی نەناس      خەڵکی هەر لا بێ، لە چەپ یا لە راس
چەپ کە هەر چەپە و راسیش بە راسیی      دوورە لە رێگەی دڵسۆزیی و راسیی
ئەتکەن بە وەزنەی سیاسەتبازیی      هەرجارە یەکیان ئەبن بە قازیی
تەماکار مەبە بەو قەزاوەتە      لاچێ لەم ناوە ئەم عەداوەتە
چونکە ئەمانە ئاگر خۆش ئەکەن      تا سوودی گەلان بۆ خۆیان ببەن
تا تۆ خۆت نەکەی بە حەرپەی ئەوان      نەچیە سەر فکرە و رێبازی ئەوان
دەستی یارمەتیی نادەن بە دەستت      مەجالت نادەن تۆ بەپێی هەستت
بجووڵێیتەوە تا سەر ئەکەوی      کتوپڕ سەرت پێ ئەکەن نەویی
ئەڵێن سیاسەت ئێستە گۆڕاوە      ئێمە ناچارین بچینە دواوە
بۆیە پیاوی ژیر نابێ کە دوو جار      هەر لە کونێکەوە دەستی بخوا مار
مار هەر ئەو مارە و کونیش عەینی کون      ئیتر چۆن پەنا ئەبەی بە دوژمن
ئەگەر مام قسەت بۆ ئەکەم کاکە      بە وردیی لەلای قەصاب و گاکە
هیچ نەبێ بیکە بە دەرسێ بۆ خۆت      بۆ سەر لەوحەی ژین بەختەوەری خۆت
بڵێ ئەمانە پەندن بۆ بەشەر      تا خۆی نەخاتە گێژاوی خەتەر
چونکە ئەمانە هەمووی هەرایە      بازاڕی رەشە و ناوی سەودایە
تا بیر لە مێژووی گەلان کەیتەوە      باشتر ئەم قسەم ئەچێتە دڵتەوە
خوصووص گەلی کورد بە درێژی مێژوو      هەر چارەڕەشی دەستی ئەمان بوو
ئیتر تا بەکەی! بۆچی شوێنکەوتن      بە سەد تەجرەبەش دەس هەڵنەگرتن
ئەو گۆمە گێژەی کە کوردی تێکەوت      ئاویشی لێ بوو بە ئاگر و نەوت
سووتا هەڵقرچا لاشەی سەدان کەس      کێ دیویە ئینسان ببێ بە قەقنەس
کەسیش نەپرسێ بۆچی وات لێهات      گوناهت چی بوو! کامە بوو خەتات

کامە بوو جەورت کامە زۆرداریییت تاوانت چی بوو کامە بوو لاریییت
بێجگە ئا لەوەی کە بڵێن کوردین پێشێلکراوی دەستی نامەردین
لە هەزار لاوە بەر هێرش ئەدرێن لەت لەت کراون خەریکن ئەخورێن
نابێ دەنگیش کا کە چی بەسەر هات کێ لێی بوو بە هۆی ئاژاوەی وڵات

**سەرنجێك بۆ چارەڕەشیی گەل لەگەڵ بەشی زۆری هۆیەکانی**
**کە بریتین لە ناکۆکیی ناوخۆیی و جیاوازیی فکریی**

من وا ئەزانم زوربەی ئەمانە هۆی چەند موشکیلەی گەورە و گرانە
یەکەم ناکۆکیی بەپێی ئیختیلاف لە بیروڕادا بێ درۆ و گەزاف
هەرکەس بەگوێرەی هەست و لێزانین یا لە نەزانیی و خۆ بە زل زانین
ئەکەوێتە شوێن خەیاڵاتەوە جوابی کەسی تر هەر ناداتەوە
تاقمێ ئەڵێ من دیموکراسییم خاوەنی بیر و یاسای ئەساسییم
هەر خۆمم تەنیا رۆڵەی هەڵکەوتووم لە بەزم و رەزمی دنیا سەردەرچووم
یەکێ بەناوی پارتی دیموکرات لافی ئاغایی و میریی لێ ئەدات
ئەڵێ هەموو کەس بچێتە دواوە هەر من شارەزام لەو بەیت و باوە
یەکێ تر ئەڵێ من کە کۆمەڵەم بۆ دوژمنی گەل تەنیا خۆم تەڵەم
بۆ چینی هەژار زەحمەت ئەکێشم رەگی بێدادیی لە بن ئەکێشم
یەکێ بەناوی حیزبی ئیسلامیی بۆم بڵاو ئەکا پەرتووکەی نامیی
بە ژەهری بکوژ ئاو ئەدا خەیاڵ تێك ئەدا زەینی ساویلکە و منداڵ
تەنیا بە وشەی ئیسلامە لافی ئیسلامیش لەگەڵ ئەودا مونافیی
چونکە پەناگای بەناو ئیسلامە ئیتر ئیسلامیی بۆ ئەم ئیسلامە!

ئەبێ بێجگە ناو، ماناکەی چی بێ     کە ئەم شوێنکەوتووی هەرچی وپەرچی بێ
یەکێ بەناوی یەکیەتیی گەلان     ئەڵێ با بمرن فلاّن و فلاّن
تا هەموو لایەك نەکەم بە یەك لا     گوێ نادەم بە قسەی نە شێخ نە مەلا
یەکێ وەهابیی یەکێ ئیخوانە     ئەڵێ تەنیا من یاسام قورئانە
هەر منم بە راس ئەهلی تەوحیدم     بۆ خوداناسین فەردی وەحیدم
باقیی موشریکن یا بتپەرستن     لە ئیسلام دوورن تەواو بێ هەستن
یەکێ تر ئەڵێ من کە رووحانییم     لەسەر رێباز و حوکمی قورئانییم
قانوون و شەرعی خودام بەدەستە     ئەبێ بڕووخێن ئەو دارودەستە
چونکە هەر خۆمم موفتیی زەمانم     نابێ کەس دەرچێ لە ژێر فەرمانم
یەکێ تر ئەڵێ نەخێر ئەمانە     هەمووی درۆیە و گەل فریودانە
تەنیا خۆم نەبێ، کەلامی خودا     کەس نەیزانیوە قەسەم بەو خودا
هەرکەس لەحاستم سەر بجووڵێنێ     ئەبێ لەناوچێ و ناوی نەمێنێ
حەدیس و شەرع و تەفسیری سەلەف     بە هیچ دەرئەکا کاکەی ناخەلەف
لەبەر دەم شرپیی خۆی نەکرد زەوت     کەچیی حیسابی ئەویش دەرکەوت
ئەیویست شتێ تر بەناوی ئیسلام     دروست کا و دەوری بدەن خاص و عام
سوپاس بۆ خودا دەنگی نەداوە     خەنەی فاسیدی رەنگی نەداوە
یەکێ بەناوی سۆفیی یا دەروێش     خۆی نیشان ئەدا دەم دێنێتە پێش
بە جەزبە و حاڵ و صەیحە و هەیاهوو     وا ئیشعار ئەکا لە عەرشیش سەر چوو
لە فەوقی سەما و فەلەك سەرکەوت     واتە لە باڵی جیبریل بەرکەوت
مەقامی نەشئەی سەیری سیفاتی     تەی کرد و بە دەم گەیشت بە زاتی
دەرچوو لە فەنا چوو بۆ لای بەقا     ئەڵێ نایل بووم بە فەیزی لیقا
ئیتر ماسیوای بەلاوە کایە     وەعزی مامۆسای بەلاوە بایە

بەلام خەیاڵە و ناوی ناوە حاڵ     خاوەن حاڵ دوورە لە فیز و فیشاڵ
یەکێ تر ئەڵێ بەم شان و پەستە     کلیلی خەزنەی خودام بەدەستە
بۆ عەفوی خەتا و کردەوەی خراب     لە رۆژی جەزا و حیساب و کیتاب
مەترسە و مەڵێ خاوەن تەقسیرم     هەر ئەوەت بەسە منت دەسگیرم
رزگارت ئەکەم لە سارای مەحشەر     ئەتبەم بۆ بەهەشت بەبێ دەردی سەر
بەلام تۆ بیخە بۆتەی ئیمتیحان     یا بیخە ناو تای تەرازوو و قەپان
باشتر لە مەحەك بۆت دەرئەکەوێ     لەو فڕوفێڵە کاکەم چی ئەوێ
ئەنجا یەکێ تر تەبیعیی و دەهریی     بە راسیی ئەبێ ئینسان بۆی بگریی
چونکە لایداوە لە رێگەی راسیی     کە خوای نەناسی کامەیە راسی!
تا تۆ تەبیعەت تەگبیرکەرت بێ     هەڵت سووڕێنێ و تاجی سەرت بێ
یا بڵێی وەزعی گۆڕانی زەمان     ئەخاتە خۆشیی یا چاڵی خەمان
ئەبێ هەر بە دەس تەبیعەت و دەهر     بناڵی بۆ خۆت بە تالاوی زەهر
ئەبێ لە دنیا حاڵت هەر وابێ     بۆ ئەولاش هەزار سەلات لێ رابێ
یەکێ تر ئەڵێ مارکس لینینیم     ئەوی تر ئەڵێ مائۆیی چینیم
ناو لە دین ئەنێ کۆنەپەرستیی     لەبەر نەفامیی و قەریحەی پەستی
ئەڵێ دین ئێمەی خستۆتە دواوە     بۆیە لای ئێمە باوی نەماوە
ئەوا فەرزم کرد وایە و تەواوە     خۆ تۆ زوو دەستت لە دین بەرداوە
ئەی بۆ رۆژبەڕۆژ دواکەوتووتری     لەنێو گەلیشدا بێ قیمەت تری
دینت لە دەس خۆت دەرکرد بەبێ هیچ     کەچیی تا ئێستەش نەگەیوی بە هیچ
بە هەر ناوێ بێ دوور کەوتن لە دین     (ذلِكَ هُوَ الْخُسْرَانُ الْمُبِينُ)
لایێ گرۆی راس لێ ئەدا لە چەپ     لایێ گرۆی چەپ لەپ ئەدا لە لەپ
لەناو ئەو گشتە سەرم سوڕماوە     نازانم روو کەم من بە کام لاوە

لایێ تر زامی دڵەی زەبوونم — بڵێسەی گڕ و ئاهی دەروونم
لافاو و تافی هەم و غەم لایێ — زیر و[٤٤] بەمی دەف، مەی و نەی لایێ
لایێ پرشنگی جیلوەی نازاران — ها کە لە دەس چووم هانا هەی یاران
دواکەوتووم لە ڕێی وەسڵی یارانم — شەرمەندەی بەزمی بادەخوارانم
لایێ خەجاڵەتبار و سەربارە — ئازای ئەندامم وەك گەستەی مارە
سەر کز و ملکەچ دانیشتووم بۆ خۆم — زووخاوی زامی مەینەتان ئەخۆم
ئەناڵم بە ڕۆژ، بە شەو شینمە — شین و واوەیلای کزیی دینمە
ماتەم دایگرتووم، غەرقی خەیاڵم — بۆ فەریادڕەسێ هاوار بەماڵم
خەریکم تەواو بم بە دێوانە — بۆ بێ خاوەنیی ئەم دینە جوانە
ئاخر هەر کەسێ ئینصاف بنوێنێ — چاوێ بە دینا بە باش بخشێنێ
بە عەقڵی سەلیم بێ کینە و غەرەز — بە دەروونی پاك، خاڵیی لە مەرەز
بیدا لە مەحەك یا بۆتەی هەستی — چۆن بە دین ئەڵێ کۆنەپەرستیی!
هەرچەن زێڕی قاڵ بێ پەڵە و تەڵەك — کەسێ زێڕناس بێ نایدا لە مەحەك
چونکە تەجرەبەی ڕۆژ بە نیوەڕۆژ — وەك ئەمە وایە بە شەو بڵێی ڕۆژ
یا بڵێم حاڵی حاڵی خەففاشە — بۆیە تاریکیی بەلاوە باشە
ئەگەرنا ئەبێ کێ بڵێ بە دین — هۆی دواکەوتنە و کەموکوڕیی ژین
ئەو کەسەی دینی بە خەڵك ڕاگەیاند — بەیداخی دینی لە مەککە چەقاند
بە زاهیر نە باب نە دایك نە کەس — پەناگای نەبوو بێجگە خودا و بەس
لەناو ئەو هەموو ملهوڕەی دڵڕەق — کە یەك لەیەکتر نەفام و ئەحمەق
ئەتوانم بڵێم کە هەر ئەبو جەهل — ناوی زڕابوو بە پیس و نائەهل
ئەنا یەك بەیەك ئەوانی تریش — (إِبْنُ الْجَهْلْ) بوون، لەو خراپتریش
بێجگە لەوانەی بوون بە صەحابە — مێژوو ناوی نان بە (أُسْدُ الْغَابَه)

ئەو زاتە بەرزە کە خۆی تەنیا بوو		چونکە مەبەستی یاسای خودا بوو
لە خولق و خووی ئەو، کردەوەی بەرزی		دڵی ملهوڕان وەك بیی تەلەرزیی
بە هێزی ئیمان بە دینی پیرۆز		کەللەی ئەوانی تێکەڵ کرد بە تۆز
لە شەرق هەتا غەرب جنووب تا شیمال		بڕێکی بە سوڵح بڕێ تر قیتال
ئاڵای ئیسلامی تیا شەکاوە		چرای ئیمانی تیا گەشاوە
کێ دیویە یاسای ئاوا پڕ کەماڵ		ماوەی هەزار و چوارسەد و چوار ساڵ
لە ناوەڕاستی کورەی زەوییدا		زاڵ ببێ بەسەر بەرز و نەوییدا
بیشمێنێ هەتا دنیا دنیایە		(یَا بُشْرَى لَنَا وَنِعْمَ الْغَايَه)
نەتدیوە یاسای ئەو خاوەن جاهە		زوربەی ئەندامی مەجلیسی لاهە
بڕیاریان داوە بۆ یاسای تازە		لا نەدەن هیچکام ئا لەو ڕێبازە
گشتی بە یەك دەنگ لەو بڕوایەدان		بۆ نەزمی[٤٥] هەموو زەمان و مەکان
بۆ مافی هەموو بەرەی ئادەمیی		باشتر لە یاسای دین و بەرهەمی
ناگونجێ هەرگیز کە گرۆی بەشەر		ڕزگارکا لە دەس کەند و کۆسپ و شەڕ
بەو نەبێ سیلمی عالەمیی و جیهان		پێك نایە بێ شك بۆ نەوعی ئینسان
هەر قانوونێ تر خاترت جەم بێ		مادام خاڵێکی لەم دینە کەم بێ
ناگا بە دادی عالەم بە گشتیی		بۆ مافی ڕەوای ورد و درشتی
چونکە دانەریان یا کیتابییە		یا لامەزهەبە و وێنەی بابییە[٤٦]
یاخۆ مەجووسە و هیند و بووزییە		موزدەکیی و بوودا و مائوو ڕووسییە
ئەگەر کیتابیین قانوونی ئەوان		هەر بۆ گەلێکە نەك هەمووی گەلان
ئەویش بێگومان هەموو کاتیی بوون		بۆیە یەك لەدوو یەك نەسخ ئەبوون
ئەنجا ئەوانەش کە لامەزهەبیین		بە ڕاسیی یەکجار نەفام و غەبیین
قانوونی فیکریی و یاسای بەڕبەڕیی		کۆمەڵێکی کەم ئەویش سەرسەریی

چاوی گەلانی پێ ئەنووقێنن — تا خۆیان بەسەر دا ئەسەپێنن
جا پاش ماوەیەك ئەبنە دیکتاتۆر — ماف و خوێنی خەڵك قووت ئەدەن بەزۆر
هەروا ئەندامی لیژنەی سەرۆك تاس — لەپاش ماوەیەك قسە و دەنگوباس
وتیان ئەبێ کێ لە رووی جیهانا — یەکەم قائید بێ لە گشت زەمانا
بیروڕای گشتی هاتە سەر ئەمە — تەنیا (مُحَمَّدْ) فەردی یەکەمە
چونکە هەر ئەمرێ لە خوا بۆی ئەهات — تەبلیغی ئەکرد بە خەڵکی وڵات
بەر لە هەموو کەس خۆی بە کردەوە — ئەیبرد بەڕێوە بە قسە و کردەوە
ئەنجا تەنفیزی بەسەر خزم و خوێش — دا ئەکرد بەبێ فەرق و پاش و پێش
جا ئەمری ئەدا بەسەر یارانی — بیبەن بەڕێوە بە رێکیی و جوانیی
هەر ئیشێ بە خۆی بکرایە، بە کەس — نەیئەکرد، تەنیا خۆی ئەیکرد بە دەس
تەنانەت رۆژی غەزا و جیهادی — خۆی پێش قەدەم بوو بەوپەڕی شادیی
ئەمریشی ئەکرد هەموو کەس وا بێ — بەڵێ سەرۆکیی ئەبێ ئاوا بێ
بۆیە فەرد فەردی ئەصحاب و یاری — هەموویان وێنەی رەفیقی غاری
بە گیان و ماڵ و رووحی شیرینیان — خۆیان فیدا کرد لە رێگەی دینیان
هەروا ئەوانەش کە یاری ئەو بوون — نوختە بە نوختە بە رێی ئەودا چوون
دەی ئەبێ کێ بێ بەو شێوە جوانە — بەو خولقە بەرزە و بەو کردەوانە
بتوانێ بڵێ منیش ئاوامە — ئەگەر شك ئەبەن کامەیە! مامە
نەك هەر وەکو ئەو، وەك یارەکانی — پەنجەی بۆ کێشە ئەگەر ئەتوانی
تازە مەحاڵە دایکی زەمانە — هەڵخا یەکێ تر وێنەی ئەمانە
کەوابوو برا بەڕێزەکەی خۆم — راسم لێ بزانە سوێندت بۆ ئەخۆم
رێگەی نەجاتی گەل و نیشتمان — وەحدەتی دینە و گەلی نیشتمان
بێجگە لەم دووە، چی بەیت و باوە — هەمووی بە یەك دەنگ بیخەینە لاوە

ئەوەی تۆ ئەڵێی کۆنە و خەرافات — هۆی ئیختیلافە و گەل نادا نەجات
بێ شك بزانە تاوانی خۆتە — دوو هەزار کەڕەت بیخەیتە بۆتە
ئوصوولی دین و عەقیدە و باوەڕ — بێ ئیختیلافە، تۆ بتبێ باوەڕ
خیلافێکی کەم کە تۆ ئەیبینی — لە فرووعدایە نەك ئەسڵی دینی
ئەویش ڕەحمەتە بۆ حاڵی ئوممەت — هەروەك فەرموویە حەدیسی حەزرەت
چونکە لە ڕوانگەی حەدیس و ئایەت — ئەو ئیختیلافە ئەکا ریوایەت
نەك لە عەقڵی رووت دوور لە ئیستینبات — هەروا سەربەخۆ حوکمی عالەم کات
چونکە عەقڵێ خۆی بەشێ بێ لە تۆ — فەرقی خراپە و چاکە لەبۆ تۆ
چۆن ئەکا بۆ تۆی بێ ئاگا لە حاڵ — دوور لە حەقیقەت شوێنکەوتووی خەیاڵ
سا تۆ بڵێی من خوا خەلقی کردووم — یا هەر تەبیعەت پەروەردەی کردووم
مەعلووم ئەکا تۆ بێ صانیع نەبووی — حەتمەن یەکێ تر بەخێوی کردووی
هەرکامێ بڵێی تۆ لەم دووانە — ناتەواویی تۆی تێدا عەیانە
کە تۆ خۆت وابی، عەقڵت واترە — چونکە بەشی زۆر لە کەم زیاترە
ئەگەر بڕیارت وابێ تەبیعەت — تۆی هێنایەدیی هەر بە حەقیقەت
ئەبێ بیشفەرمووی هەرچی بێتە ڕێت — خەڵاتی ئەوە و ئەو ئەیبەخشێ پێت
بەخشندەی ئاواش ئەبێ تەواو بێ — ئاگای لە وەزعی عالەم تەواو بێ
ئایە بە عەقڵت تەبیعەت چۆنە — سوور و سپی و ڕەش تازە یا کۆنە
جیسمە یا عەرەز یا جەوهەر لەلات — یا قووەی وەهمیی بێ ڕەنگ و ثوبات!
ئەنجا پێم بڵێ زات و صیفاتی — عیلم و ئیرادە و سەمع و حەیاتی
کامە قودرەت و چاو و کەلامی — کامە حیکمەت و عەدڵ و نیزامی
مەوهوومی ئاوا هیچ و بێ مەعنیی — عالەم بەم شێوە چۆن دێنێتەدیی
وەهمی رووت نەبێ ئەبێ ئەو چی بێ! — عەیبە بۆ زانا لەدووی شەقیی بێ

ئەو هەموو شاخ و دەشت و چیایە
ئەو هەموو دار و بەرد و گیایە

ئەو هەموو جینن و ئینس و فریشتە
ئەو هەموو دەنگ و رەنگ و رەوشتە

ئەو گشت حەیوانە لە بەحر و لە بەڕ
مردن و ژین و رزقی جانەوەر

هەروا تێفکرە لەم (كَمْ)و (كَيْف)ە
دەوری چوار فەسڵەی ساڵان بێ وەقفە

خەزانی پایز، سەرمای زستانان
گوڵزاری بەهار، هەوای کوێستانان

یا گەرمیی هاوین لەو رێگە دوورە
بە عەینی ئەڵێی گڕی تەنوورە

خۆ رۆژ هەر رۆژە هەرگیز ناگۆڕێ
ئەی بۆ بە چوار فەسڵ هەوا ئەگۆڕێ

داهاتی زستان بەفر و بارانە
بەرهەمی هاوین خەڵە و خەرمانە

پایز بە وێنەی پیاوی داماوە
بەهار بە سەد رەنگ بە گوڵ خەملاوە

هەوای نەشئە بەخش کاتی بەیانیی
جریوە و لەهجە و دەنگی تەیرانی

بڕوانە دەریا و شتی سەرسامی
یا ترشیی و تاڵیی یا سوێریی تامی

دەوامی چۆم و رانەوەستانی
رژانە دەریای لەگەڵ گشت کانیی

ئەگەر بە حوکمی عەقڵ با حاڵی
ئەبوا نەمابا عەرز بە خاڵیی

هەمووی پڕ ببا لە ئاوی چۆمان
دنیا سەراسەر ببا بە تۆفان

کەچیی وا ئەبێ لە گۆشە و کەنار
زۆریش کەم ئەکا بە ساڵ جاریەجار

هەروا لە شێوەی نەشونمای خەڵق
لە جوان و ناحەز، لە ژیر و ئەحمەق

لە نوطق و قسەی فەصیح بەیانان
لە دەرك و هۆشی بێ گوێ و زمانان

لە پیر و لە گەنج، کۆرپە و منداڵان
جەماڵی بێگەرد خۆش خەت و خاڵان

حوسنی یووسفی خورشید میساڵان
یا دڵڕفێنیی شیرین غەزالان

بەرزیی قامەت و باڵای نەمامان
زولف و ئەگریجەی روومەت شەمامان

عەشقی دەروونی سینە بوریانان
فرمێسکی سووری دەردی هیجرانان

هەریەك بە یادی فەرڕوخ لیقایێ
هەریەك لەتاوی شیرین لەیلایێ

سەریان نا بەلای گڵکۆی تازەوە     بەو هەموو داخ و نیاز و رازەوە
یا فەرقی بەینی (إنَاثْ)و (ذُکُورْ)     لە نەوعی ئینسان، حەیوان و طیوور
ئەم بۆ بوو بە مێ! ئەو بە نێر دەرچوو     ئەمیان خاوەن ریش ئەو ساف و بێ موو
بەعزێکی بە سك ئەچێ بەرێوە     برێ بە باڵ و برێ بەپێوە
بەعزێ لە هێلکە سەر دێنێتە دەر     بەعزێ لە نوطفە ئەگا بە سەمەر
برێ (تَوأَمَیْنْ) واتە دووانە     یا تاکە تاکەن بەو شێوە جوانە
لە یەك نێر و مێ دێنە دنیایە     کەچی وێنەیان لەیەك جیایە
نە رەنگ و نە دەنگ نە عەقڵ و ئەخلاق     لەیەکتر ناچن، مەر بە ئیتتیفاق
خۆ هەردوو لە یەك سروشت و تۆمن     لە یەك نێر و مێ، ماسیی یەك گۆمن
ئەگەر تەبیعەت خەلقی کردایەن     ئەبوا هەموویان لەیەك بچوایەن
یا هەموو نێر و یا هەموو مێ بان     یا هەموو نەزۆك نە نێر نە مێ بان
هەروا گژ و گیا و درەختی بەریی     هەریەك بە تەرزێ هەڵئەبڕێ سەری
بەعزێ لەسەر رەگ، برێ تر بە تۆم     زیندوو ئەبنەوە بەبێ وەرد و شۆم
برێکیان کاتی پایز وشك ئەبن     برێ زستانیش هەر سەر سەوز ئەبن
زیندووبوونەوەی ئینسانیش وایە     وەك شین بوونەوەی ئەو رەگە گیایە
ئەوانەی چاکن وەك سەر سەوز وانە     ئەوەی خراپن ئەڕزن ئەوانە
ئەم قسەی ئێستا بۆت ئەکەم بەیان     دەلیلە لەسەر عەزاب بێگومان
بیکە بە دەلیل بۆ زیندووبوونت     کەم بڕۆ لەشوێن فیکرەی زەبوونت
کاتێ لە (بالك)[٤٧] کە من فەقێ بووم     لەخزمەت دەریای عیلمی ئەو دێ بووم
مەشهوورە ناوی (بَاقِرُ الْعُلُومْ)     زانای بێ وێنە لە عیلمی رسووم
لە عیلمی مەعناش هەروا بەهێز بوو     لەلای خاص و عام بە راس بەرێز بوو
بەحرێ بوو لە عیلم؛ ناوی مەلا بوو     بە هەموو مانا بۆ دین چرا بوو

من نەمدی وێنەی لەم ژیانەدا — وەك نەمبیست هاوتای لەم زەمانەدا
عەینی ئەو ساڵە من لە پێنجوێن بووم — کە بەهار داهات جا بۆ ئەوێ چووم
فەرمووی پیاوێ مرد لە چلەی زستانا — فەرقی نەبوو دەشت لەگەڵ کوێستانا
لەبەر بەفری زۆر یا سەردیی هەوا — ئەتوت زەمهەریر هاتۆتە دنیا
کە گۆڕیان بۆ کەند بە سەد موشەققەت — لەبەر بۆران و کڕێوە و زەحمەت
کەچیی دەرکەوت لەو گۆڕە کۆنە — حاڵی دووپشك و ئێسقانێك چۆنە
دووپشك کە ئەدا بەو ئێسقانەوە — ئێسقان دێتە یەك بە دوولانەوە
تا وەکو پەنجەی قونجاوی لێدێ — ئەنجا دووپشك لا ئەچێ لەوێ
ئەچێ بۆ ئەوسەر ئەدا پێیەوە — ئێسکەکە دیسان ئەقونجێتەوە
کە خەڵك ئەبینن ئەو حاڵە سەیرە — عەزابی ئێسقان لەناو ئەو قەبرە
ئەبینن کە وا ئەوەی دیارییە — دووپشك ئەو شێوە ئیشوکارییە
خەبەر ئەنێرن بۆ لای مامۆستا — تەکلیفمان چییە بەم حاڵە ئێستا ؟
وا عالەم هەمووی رەق ئەبێتەوە — دووپشکیش لەکۆڵ ئەو نابێتەوە
فەرمووی جا منیش لەگەڵ فەقێکان — هەڵسایین رۆیشتین بۆ سەر گۆڕەکان
کە چووین هەموومان بە چاوی خۆمان — چاومان پێکەوت مەعلووم بوو بۆمان
کە ئەم حاڵەتە عەزابی خوایە — بەڵام لەملاوەش یەکجار سەرمایە
وتم قەیناکا خاکەناز بێنن — با مەنموریش بێ هەر دەری بێنن
بیبەن لە چۆمی دەرزیان[٤٨] تووڕی دەن — مەیتەکە بێنن ئازا دەفنی کەن
چونکە بەم سەرما ئێمەش مەعزوورین — چاوەڕێی عەفوی خودای غەفوورین
فەرمووی هەرچۆن بوو بە دوو خاکەناز — رفاندیان بە غار، جاریش بوو بە باز
دوو سێ کیلۆمەتر دوور خرایەوە — جا کابرای هەڵگر خۆی گەڕایەوە
بەڵام وەڵڵاهی لەپێش ئەو پیاوە — بۆ عەزابی ئێسك دووپشك گەڕاوە

هات و خۆی خستە ناو قەبرەکەوە     دای لە هەردوو سەر بە ئێسکەکەوە
ئێسکی بێچارە ئەنوشتایەوە     کە بەری ئەدا رائەکشایەوە
وتم دووپشکیش تازە مەعزوورە     بێ شك لە خواوە ئەویش مەئموورە
ئەنجا بە ناچار قەبریان داپۆشا     جا بۆ قەبرێ تر خەڵك تێکۆشا
ئەگەر ئەندامیش هەمووی داڕزێ     ئەو ئێسکە مەعلووم هەرگیز ناڕزێ
بە شەرع مەشهوورە بە (عَجْبُ الذَّنَبْ)     وەك رەگی گیاکان لات نەبێ عەجەب
جا هەر لەسەر ئەو وەك رەگی گیاکە     زیندوومان ئەکەن لەژێر ئەو خاکە
هەروا شتێ تر بۆ نەڕزینی چاك(٤٩)     لە دێکەی خۆمان وەبیرم دێ چاك
کە باپیری خۆم مەلای ئەو دێ بوو     لە عەینی کاتا ئەویش لەوێ بوو
ویستیان مزگەوتێ کۆن بڕووخێنن     هەر لە بناغەوە باشتر بیهێنن
خەڵکەکە هەمووی وابوو بڕیاری     کە جۆگێك بێنن بۆ قوڕەکاریی
هەروا خەریك بوون بە جۆگە کێشان     کەچیی دەرکەوت سەرێك لەپێشان
ملی بە شمشێر پەڕیبوو لەوێ     بەبێ لەش وێنەی شەوچرا لەوێ
بەڵام مەعلووم بوو سەری ئافرەت بوو     قژی درێژ بوو، دەموچاو بێ موو
مووی قژی ئەتوت شانە کراوە     تەنیا تاڵێکی لێ لا نەبراوە
وا دەرئەکەوت کە زۆر رووسوور بێ     وەك گوڵ کە تۆزێ ئاوی لێ دوور بێ
مایل بە سیسیی ئەیدایە بەرچاو     عالەم سەرسام بوو لە جوانیی تەواو
کەس نەیئەزانی مێژووی ئەو سەرە     هی کام زەمانە یا هی کام شەڕە
بەڵام وا دیار بوو سەری شەهید بوو     بۆیە وا جوان و شۆخ و نەجیب بوو
وێنەی ئەمانە بە زۆر بیسراوە     تەئریخ و مێژوو شەهادەی داوە
ئەمانە هەمووی مانای قورئانە     وا چاکە ئیمان بێنی بەمانە
با کە بوویەوە بە خۆت وەك ئەلئان     گیر نەخۆی، ئەوسا بێسوودە گریان

بۆ خودا هیچ شت بە دوور مەزانە … بیدە بەر مەودای بیری ژیرانە

بەبێ تەرجیحی زاتێکی قەدیر … خاوەنی عیلم و حەکیم و خەبیر

سەمیع و بینا بە گشت شت ئاگا … لە هەرچی روو دا لە ئەم دنیادا

چۆن دێتە سارای مولکی بوونەوە … بەو هەموو وەزعی گۆناوگوونەوە[٥٠]

ئەو هەموو ئەشیا بەو حەقیقەتە … ئەفەرمووی بڵێم هی تەبیعەتە!

هەرکەسێ ئەمە فیکر و بیریە … جەهلی مورەککەب داوێنگیریە

واتە نازانێ کە نەیزانیوە … هەر بۆیەش خەتای بە چاك زانیوە

جا تا تۆ بە دەس تەبیعەت گیری … ناتوانم بڵێم پیاوێکی ژیری

سا تۆ حەزکەی یا حەز نەکەی بەمە … بە راسی بزانی یا گاڵتە و گەمە

تا تۆ عەقڵی رووت بخەیتە کایە … لەکیست ئەچێ سوود و سەرمایە

عەقڵ بەجێی خۆی، بەڵام تەبیعەت … لات ئەدا لە رێی راسیی و حەقیقەت

هەستی ئینسانییت لە دەس دەرئەچێ … قسەی ئەوانەت باش لێ دێتەجێ

کە ئەڵێن ئینسان ئەسڵی سروشتی … مەیموونە، بەڵام وێنە و رەوشتی

بە درێژیی مێژوو، چەرخی زەمانە … گۆڕاوە و ئەمڕۆ ناوی ئینسانە

روشد و تەکامول وای پێکردووە … ئاوا لە شێوەی مەیموون دەرچووە

واتە لە ئەسڵا وجوود و هەستییت[٥١] … مەیموونە بۆیەش ئێستە وا پەستیت

دڵت نەڕەنجێ! دەماغت وشکە … فیکردت قیاسی مەشك لە مشکە

هەر ئەچێتەوە سەر ئەو ئەساسە … بۆیە گیرۆدەی بەو دەنگوباسە

بۆیە پەی نابەی بە صانیعی خۆت … هەر بە تەبیعەت قانیع ئەکەی خۆت

ئا بەمە ئەڵێن وەرتەی[٥٢] غەباوەت … کەم هێزیی عەقڵ و چاڵی شەقاوەت

نەتزانی رێگای سەعادەت کامە … تا گیرۆدە بووی بەو داوە، مامە

ماوەی ژیانت سەرفی دنیا کرد … کەچیی رێت بۆ لای رێگەی راس نەبرد

نه دینت دەس کەوت نه پایـه و مـەقام		بیرێکت نـەکرد، ئـیتر بـۆ کـەی فـام!
دینت بە کۆسـپی رێـی خـەبات نوانـد		بـۆ گـەلت، بۆیـە هـەڵت جرینگانـد

**ئایە لە راستیدا دواکەوتن و بە ماف نەگەیشتنی گەل تاوانی مەلایە؟**
**جا ئەگەر وایە ئەی بۆ ئەوانەی پشتیان لە دین هەڵکردووە و**
**تـانەش لە مەلا ئەدەن ئەو مافـە رەوایەیان بـۆ گەل**
**بەدی نەهێناوە، قەیناکا دەبا کورِ تیرئەندازبێ‌و**
**چاوی باوکی کوێرکا**

ئادەی وا مـەلا بـە دیـن دوا کـەوتوون		بە فەرموودەی تۆ کۆسپی رێگەت بوون
ســوودێکی نــەبوو بــۆ وڵاتەکــەی		چــەکی هەڵنــەگرت بـۆ خەباتەکــەی
خـۆ نەچـۆ ریـزی وەك تـۆی رۆشـنبیر		نەیـدا بەکوشـتن لـە منـاڵ تـا پـیر
نەیدا بە تـاڵان موڵـك و مـاڵی کـەس		بـە دەس پاسـدار و ژانـدار و حـەرەس
بـە تـانگ و تـۆپ و فرۆکـەی دوژمـن		مــاڵی وڵاتــی نــەهێنا لــە بــن
شـەڕ و ئـاژاوەی بـۆ کـەس نـەناوە		هــەرگیز زیــانی لــە گــەل نــەداوە
قەسـری شـارانی نـەدا بـە رووخـان		بەرهــەمی لادێـی نـەدا بـە سـووتان
بــەناوی مــافی گــەلی قوربەســەر		نەیبرد کچی کەس سەنگەر بە سەنگەر
هــەتکی نامووســی رەوا نــەزانی		بـۆ گـەل هەرچـێکی بـە چـاکە زانـی
هـەر بـە فـەقیریی و نـانی قەناعـەت		بـێ خـۆ سـەپاندن، بـەبێ وەقاحـەت
هەر لەگەڵ گەلدا بە رێکیی و جوانیی		بەوپــەڕی ســۆزی دەروون و گیــانی
ئـەوەی بـۆ گـەلی بـە پێویسـت زانـی		وچـانی نـەدا تـا ئـەو جـێ تـوانی
ئەو فەرمانی خوای بـە گـەل راگەیانـد		خەڵکی بـە سـوودی قیامـەت گەیانـد

بەگوێرەی هەست و هێز و توانای خزمەتی بە گەل واجب بوو لەلای
بۆ سوودی کۆمەڵ بێ پارە و منەت ماوەی ژیانی خۆی خستە زەحمەت
خۆ ئەویش وەك تۆ هەر کوڕی خەڵکە زیاتر لە گشت کەس بەسوود و کەڵکە
گەل رائەکێشێ بەرەو سەعادەت بۆ خولقی شیرین هەم بۆ شەرافەت
بۆ مافی رەوای دین و دنیاکەی بۆ پارێزگاریی شەرم و حەیاکەی
واتە بۆ یاسای باوك و باپیری هەر تێئەکۆشێ بە هەستی ژیری
بەڵام هەر چونکە ئەو لەگەڵ دینە بۆیە مەبغووزە و هەر جێگەی قینە
هەر بەوەی ناوی بە مەلا ئەبەن لە هەزار لاوە تانەی لێ ئەدەن
هەر چونکە ئەڵێ خودا بناسن جا هەوڵیش بدەن بۆ نەوت و ئاسن
مەلا لە سەد لا دێ راوێژ ئەکا ئازا یەکێ تر لێی کاوێژ ئەکا
وەهای ئەجاوێ ئەیکا بە پەڵخوڕ ئەنجا ئەیخاتە نێو پێخوستی قوڕ
نایەڵێ مەلا بڕوا لەسەری تا دەری ئەخا لە پلەی خەتەری
ئەوسا هەوساری بداتە دەس ئەو جا هەتا ماوە ئاغاییش بۆ ئەو
ئەنا هەر مەلا ئەچێتە پێشەوە بە سەد ترس و لەرز زام و ئێشەوە
بەڵام تا ویستی هەموو پێکەوە گەل راپەڕێنن هەستن پێکەوە
بە یەکدەنگ بڕۆن قوژبن بە قوژبن سەنگەری ولات چۆڵ کەن لە دوژمن
بۆ ئەوەی هەموو لە رێگەی خەبات بچێژن تامی شەربەتی نەجات
ئازا لەولاوە کۆمەڵێکی رووت نەخوێنەوار و برسیی و لاتولووت
یا لە قوتابیی و کرێکاری شار یا لە بەتاڵە و سەرپەتیی بازاڕ
بێ ئەوەی هەستی مەسئوولییەت کەن یا تۆزێ شەرم لە خەڵك و گەل کەن
ئەڕۆن لە دەستی مەلای دەردێنن پشتی مەلاش و گەلیش ئەشکێنن
چونکە بڕێکیان ئەبن بە عەمیل بۆ پارە و تەماع خۆ ئەکەن بەدیل

بڕێ تر ئەڵێن بە خۆم ئەکەوێ
لیباسی جاشیی و جەردەیی شەوێ

بڕێ ئەمێنن بەبێ حاڵ و باڵ
زۆری پێ ناچێ ئەڵێن ئاش بەتاڵ

ئەگەر بیشپرسی کاکە بۆ وا بوو
ئەڵێن بێدەنگ‌بە خەتای مەلا بوو

یا ئەڵێن خەتای ئاین و دینە
هەر دین بۆ ئێمە هۆی تاڵیی ژینە

هەی هاوار هەی داد چۆن ئەبێ وابێ
یەکێ تر وابێ و خەتای مەلا بێ

کەچیی خۆ ئەوەیش هاتۆتە کایە
ئێستە هەر ڕەنجی شێخ و مەلایە

بە هەوڵی ئەوان خەڵك بێدار بوو
بەوان ناوی گەل لە مێژوو دیار بوو

ئێستاش بێگومان بەبێ مەلا و دین
بەو مافە ناگەن لێتان بێ یەقین

مەگەر نازانن نیزامی گشتیی
پێویستی هەیە بە بوونی گشتی

تا هەریەك هەستێ بەپێی عەقڵ و فام
بۆ گەل تێکۆشێ برای خاوەن فام

ئەنجا پیاوێکی ژێر بەدەستەڵات
پێویستە دایم بۆ نەزمی وڵات

جا لە هەرکام بێ لە بەرە و تیرە
شەرت نیە کەسێ بێ خاوەن عەشیرە

هەر ئەوەی بەسە هاونیشتمان بێ
دژی دین نەبێ و دڵ فرەوان بێ

واتە بە ڕاسیی پیاوێ بێ چ پیاو!
بۆ دین و دنیا هەڵکەوتوو تەواو

جا ئەگەر خۆشی دینی بێ‌قسوور
ئەبرد بەڕێوە (نُورٌ عَلَى نُورْ)

ئەنا هەر دژی دین نەبێ بەسە
بۆ سەرکۆماریی ئەشێ ئەو کەسە

هەر کەڵکی بۆ گەل بە هەموو بارێ
ببێ؛ نەك گوندێ یاخۆ بۆ شارێ

یاخۆ بۆ ماڵ و منداڵەکەی خۆی
بێخەم بێ لە تۆ کە تۆ چی ئەخۆی

کە حاڵی ئاوا پێچەوانە بوو
دژی ئەم دینە و یاسا جوانە بوو

ئەوا خۆی پەتی خەباتی پساند
هەر خۆسەپێنە و بە چاك خۆی نواند

ئیسلام بۆ هەیئەی حاکمەی وڵات
ئاوا دەستوورمان پێ نیشان ئەدات

خوا بە (أُولُوا الأَمْرْ) کە ناوی بردوون
بەم شێوە جوانە ئەمری پێکردوون

تا ئەوان بە حەق حوکمی گەلان کەن  فەرزە هەموو کەس ئیتاعەیان کەن
جا پیاوی ئاوا هەرچی بێ لەلام  مەلا، رۆشنبیر، فەلای خاوەن فام
لە دڵی کۆمەڵدا رەگی مەحەببەت  دائەکوتێ بۆ خۆی بێ زۆر و زەحمەت
هەر بە کردەوە و شێوەی دڵسۆزیی  خۆی بەنرخ ئەکا لای گەل و هۆزی
فەرموودەی حەزرەت فەخری ئینس و جان  پیاوی پیاوانە وا ئەکا بەیان
بە کردەوەی چاك ئازا و مەردانە  راکێشێ دڵی خزم و بێگانە
قەت چاوی نەبێ لەوەی هەر بە دەم  عالەم لە دەوری جەم بن وەکو شەم
چونکە مەسئوولن ئەگەر وا نەبن  کۆمەڵ لە دەوریان زوو بڵاو ئەبن
جا هەرکەس هات و ئاوای لە خۆی کرد  گۆی مەردایەتیی لە مەیدان دەرکرد
مەلاش دائەنێ بە پیاوێکی ژیر  سا ئەو فەلا بێ یاخۆ رۆشنبیر
رێزی لێ ئەگرێ بۆ ماوەی ژینی  بە شەرتی راسیی و پاکیی و ئەمینیی
بیروڕای مەلا بۆ گەلان وایە  چونکە واریسی دینی خودایە
ناتوانێ لەگەڵ ئەم جۆرە پیاوە  راس نەبێ و ببێ بە هۆی ئاژاوە
بەڵام وەك وتمان بدرێ لە مەحەك  نەك خۆسەپێن بێ بە زۆرداریی و چەك
حوکمی وڵات و گەل بخاتە دەس  بەبێ پرس و را، نەپرسێ لە کەس
سا ئەگەر وابێ وا خێرم بڕی  ناوی ئەویشم لە مێژوو سڕی
ئەبێ کەسێ بێ بە را و تەگبیر  بجوولێتەوە وەك مامۆسای ژیر
بەپێی عەقیدە و هەست و هۆشی گەل  تەنانەت لەگەڵ دەستەی کوێر و شەل
بزانێ حاڵی فەلا و کرێکار  بێخەبەر نەبێ لە ئەهلی بازاڕ
لە ئاڵتوون فرۆش یاخۆ زەڕینگەی  بازرگان، عەتار، تا بە ئاسنگەر
بەققاڵ و قەسساب، پینەچیی بەڕێز  کاکی کورتان دۆز، حەماڵی بەهێز
شوان و گاوانیش بۆ پروپاتاڵ  پێویستە هەروەك پیاوی خاوەن ماڵ

هەروا مامۆسای دینیی و فنوونیی          بۆ نیزامی گەل زەروورە بوونی
ئەویش بۆ گەلێ بە توولی قروون          دین لەگەڵ ئەعزای بووبێ بە مەعجوون
نابێ تۆ بیدەی تەشوێ لە ریشەی          بیروباوەڕی دینیی و هەمیشەی
چونکە ئەو پیاوە ئەگەر وا نەبێ          ناگا بە ئاوات خۆی تێدا ئەچێ
زۆری پێ ناچێ هەر بە چاو و راو          رێگای رزگاریی ئەبەسرێ تەواو
نە هێزی ئەژنۆ نە رێی هەڵاتن          چونکە دوژمنی[٤٣] خەڵکی وڵاتن
هەر ئەو کەسانەی جەمن لە دەوری          دووری لێ ئەگرن، ئەشکێنن قەدری
گیر ئەخۆی بە دەس بێکەسییت کاکە          کەوابوو راسیی لەگەڵ گەل چاکە
خۆت خە دڵی خەڵك ئەگەر ئەتوانی          ئەگەرنا گورگ و داوای شوانیی!
زۆرم دی ئێستاش هەر زۆر ئەبینم          لەجیاتی شادیی بوون بە هۆی شینم
بوون بە ملۆزم، شێرپەنجەی خوێنم          بەڵام نامەوێ ناوی کەس بێنم
چونکە لە خۆمە و بەرد لە خۆم ئەدەم          بۆیە وا ئەڵێم بەشکە کارێ کەم
خۆیان لە خۆیان بێزێ کەنەوە          ئاوڕ لە حاڵی میللەت دەنەوە
دەروونی خۆیان خاوێن راگرن          باری زوڵم و زۆر لە گەل داگرن
بزانن ئەم گەلە چی لێ قەوماوە          چی بەسەر هات و چەندە داماوە
بەم شێوە کە ئەم ئەچەوسێتەوە          کافر بەزەیی پێدا دێتەوە
هەرکەس بە راسیی خزمەت بە گەل کا          ئەبێ ئارەزووی خۆی لەسەر دەرکا
زۆر نەکا لە کەس کە شوێنی کەوێ          زۆر بێنێ بۆ خۆی لەگەڵ گەل کەوێ
واتە ویستی گەل بکا بە هەدەف          نەك وەستان لەبەردەستی بە سەف سەف
کەچیی لەولاوەش زیاتر لە جاران          پێشێل بێ ماف و بەشی هەژاران
لەلایێ تریش لەسەر عەقیدە          لەسەر رەوشتی بەرز و حەمیدە
بچێ بە گژیا و دڵی بشکێنێ          بە تانە لە دین هەر واز نەهێنێ

تا لە ئاکامدا ئەیکا بە دوژمن     لەگەڵ خۆی، ئەویش بۆ سوودی دوژمن
لەگەڵ ئەمەشدا نەڵێ وا مەڵێ     چی ئەو بفەرموێ ئەم بڵێ بەڵێ
ئایە کەس هەیە لەم جیهانەدا     یەکێ مەبدەئی وەبەر تانە دا
هەر مەبدەئێ بێ صەحیح یا غەڵەت     راست و بێ غەش بێ یا درۆ و هەڵەت
دەنگ نەکا و بڵێ تۆش مەبەستی خۆت     دەربڕە و بڕۆ لەگەڵ هەستی خۆت
حاشا کەسی وا قەت دەس ناکەوێ     ئەگەر تۆ قسەی بە راستیت ئەوێ
چونکە هەر حیزبێ نرا پێکەوە     لەسەر ئەساسێك ئەسووڕێتەوە
سا ئەساسی دین یا فیکرەی بەشەر     یاسای عەدالەت یا شێوەی تەتەر
کۆمەڵێ دەوری لێ ئەدەن بە دڵ     بۆ سەپاندنی ئەکۆشن بە کوڵ
بە هەرچی هێزە پێی ئەدەن پەرە     سەف بە سەف پشتی ئەگرن بە سەرە
تەقالا ئەدەن کە کەس نەمێنێ     سەر بۆ ئەو یاسا دانەنەوێنێ
چونکە هەموویان هەست ئەکەن بەمە     خەڵکی تر هەڵەن، رێگەی راس ئەمە
جا ئەگەر کەسێ تانەدا لێیان     یاخۆ زیانی کەمێ بێ بۆیان
بەپێی توانا دژی ئەوەستن     لە پشت پیلەوە دەستی ئەبەستن
تەنانەت ئەگەر تۆبەی لێ نەکرد     بە پێچەوانەی ئەوان قسەی کرد
بەوپەڕی سزا سزاشی ئەدەن     لەپاش ماودیەك لەناوی ئەبەن
بێ ئەوەی هەستی کەمێ مەسئوولیی     بکەن لە خۆیان یاخۆ مەلوولیی
رێگە دەن بە دڵ بەم کردەوانە     بەو هەموو سزا و بەو خوێن رژانە
یاخۆ بەزەیی بە دایکی رزیو     یا بە منداڵی بێ باوك و هەتیو
خوێنی کوڕی خەڵك حەڵاڵ ئەزانن     تەنیا هەر بەوەی دژی ئەوانن
لەگەڵ ئەوەشدا فیکرەی بەشەرین     بەڵکو بڕێکیان لە بەشەر بەرین
ئەوان کە خۆیان بەسەر دژاندا     ئاوا بڕیار دەن لە خوێن رژاندا

بەزدییان بە کەس دا نەییێتەوە دژیان لە دەسیان نەحەسێتەوە
تەنیا هەر بەوەش لەگەڵیان نەبن بۆیان ئەڕوانن بە چاوی دوژمن
بێ ئەوەی بڵێن خۆ لە خۆمانن قەیناکا ئەگەر کوڕی دۆمانن
ئەی بۆ ئەم حەقە قەت بە کەس نادەن بۆ بەپێی ئینصاف قەزاوەت ناکەن
نابێ کەس بڵێ دۆکەیان ترشە یا نانەکەیان قەراخی برشە[٤٤]
سەرم سوڕماوە لێیان بە راسیی ئاواش دەم ئەدەن لە دیموکراسیی
بەڵگەی بێ درۆ لەسەر ئەمانە حاڵی ئەحزابی ئەمڕۆکەمانە
ئەویش کە ئێستا ئەم کوردستانە بۆ کورد بە دەستی کورد گۆڕستانە
جا مادام ئەوان کە خۆیان وابن چۆن ئەبێ دژی دینی خودا بن
چاوەڕوانیش بن کەس نەڵێ بەوان کە پێت خوار دانا و شیرەکەت رژان
یا نەڵێ پشتی چاوت برۆیە بەم حەقیقەتەش ئەڵێن درۆیە
بە تایبەت مەلا بە زەعمی ئەوان نابێ قەت بدا لە زەوقی ئەوان
لەگەڵ قسەی کرد پێی ئەڵێن کۆنە بێ ئەوەی هەست کەن کە کۆنە چۆنە
بەکارهێنانی ئەم کۆنە کۆنە لەلای ناحاڵیی هەنگوین و رۆنە
بەڵام وا لەناو پێستی سەگایە گڵاوە و هەمووی دەرد و بەڵایە
نەك هەر ئەمەش بێ کە پاکیی نایە هەتکی ناموس و شەرم و حەیایە
دوژمنانی دین خستیانە سەر دەم بۆ فریودانی پیاوی کەمتەرخەم
ئەمانەن میکرۆب لەنێو بەشەردا لای کەسێ تۆزێ عەقڵی لە سەردا
ئەگەر مام کەمێ لێرە بەدواوە قسەت بۆ ئەکەم لەو بەیت و باوە
کە بۆچی هەستی گەل ئەشەمزێنن[٤٥] هەرکەس مەلا بێ بۆ ئەیبوغزێنن!
خۆ مەلا هیچی نەووت سەربەخۆ قەت پەنای نەبرد بە یاسای درۆ
خۆ نەکەوتە شوێن فیکرەی بڕێ کەس کەسی هان نەدا بۆ باری هەوەس

خۆ مەلا دژی شەرەف نەوەستا   هەر بەوەی کەمێ ئارەزووی هەستا
خۆ مەلا نەیوت لەگەڵ کەس دژم   هەرکەس دژم بێ ئازا ئەیکوژم
خۆ مەلا کەسی لە حەق لا نەدا   قوڕی بە ماڵی هیچ کەسدا نەدا
مەلا بەس ئەڵێ جوانترین ئەساس   دینی ئیسلامە بۆ نیزامی راس
چونکە بەرنامەی کەلامی مەجید   لەگەڵ بیروڕای نوقصانی عەبید
نیسبەتیان روونە بۆ خاوەن فامان   قانوونی وەضعیی و یاسای خودامان
مەلاش هەر ئەمە سیلاحی دەستی   تەنیا دینە و بەس هەست و مەبەستی
دینیش بە مەعنای یاسای خودایە   نەك هەڵقوڵیوی ورگی مەلایە
گەلیش هەر بۆیە ئەکەونە شوێنی   نەك بۆ سیاسە و شتی نهێنیی
چونکە گەلی کورد بە توولی مێژوو   لەگەڵ دین رەگ و خوێنی تێکەڵ بوو
هەویری ئەعزای جەوهەری رووحی   دین بۆتە مایەی شادیی و فتووحی
دین لەگەڵ فیکر و مێشك و سروشتی   لەگەڵ خولق و خووی شێلراوە گشتی
بە هۆی دینە گەل ئەکا شانازیی   بۆ دین بە خوێنی خۆی ئەکا بازیی
بۆ خەباتی دین خوێن ئەکا خەڵات   بە هێزی گەل و نەجاتی وڵات
جا بۆیە هەرکەس بە گژ دیندا چێ   گەلی کورد هەرگیز لە بیری ناچێ
بەپێی توانا لارە مل نابێ   بۆ کەسێ دژی یاسای خودا بێ
ئەگەر هەر نەبێ دوور ئەبێتەوە   لەوەی دژی دین ئەوەستێتەوە
هەرکەس بیهەوێ کۆمەڵ بە گشتیی   لایەنگیری بێ و بەرنەدا پشتی
بەبێ تەفرەقە و برا جیایی   هەڵچن لە دوژمن بۆ رێی رەهایی
با بە دینەوە بەرەوپێش بڕۆن   هەروا بۆ دنیاش خەمی گەل بخۆن
پشت لە ژێر باری دوژمن کۆم نەکەن   تا جارێکی تر پەنا بەو نەبەن
پشت و پەنا بەس بە خوا ببەستن   دەس لە دەستی یەك راپەڕن، هەستن

نەترسن لە کەس وەك پیاوی دلێر     بۆ ناوخۆ مەرِ بن، بۆ دژان وەك شێر
وەك قەڵای پۆڵا نەجووڵێن بە کەس     کە جووڵان بۆ دژ بن بە هەرەس
بێ شك هەر گەلێ خودای لە پشت بێ     هەر سەر ئەکەوێ با چەکی مشت بێ
کەوابوو برای کوردی زەحمەتکێش     هەنگاو هەڵبڕە و برۆ بەرەو پێش
بۆ دین و دنیا بتبێ فەراسەت     لە دین وەربگرە یاسا و سیاسەت
نەکەی بۆ گەیین بە ئاواتەکەت     بۆ پەرەپێدان بە خەباتەکەت
بڵێی ئەم دینە میکرۆبی رێمە     یا خوداناسین کۆسپی بەرپێمە
ئەم جۆرە فیکرە نەك هەر غەڵەتە     لاڕێ گرتنی چەپ و هەڵەتە
لێت ئەبێ بە هۆی بێهێزییت یەقین     لەمەودوا شادییت لێ ئەبێ بە شین
قەڵای پۆڵایین ئەو کاتە پێکدێ     بۆ کاکی مەسئوول لەگەڵ گەل رێکبێ
کە وای نەزانێ خەیاڵی خاوە     یا خەیاڵی خاو بنێتە لاوە
چونکە هەوێنی عەدل و ئەمانەت     سەرچاوەی یاسای دینە و دیانەت
هەروا موساوات یا ئیشتیراکیی     لە دین وەریانگرت بێگانە پاکی
بەڵام نازانی حیلەی ئەمانە     وێنەی گوریسن لەنێو هەمانە
گەڕان بە دینا بە گوێرەی هەوەس     بێ شەرم لە خوا بێ ترس لە کەس
ئەوەی بۆ خۆیان بە سوودیان زانی     لێیان هەڵبژارد بێ تەفرەدانی
چونکە تێگەیبوون لە گرۆی ئیسلام     سەر بۆ یاسای کەس بێجگە لە ئیسلام
دانانەوێنێ و تەسلیمی نابێ     ئەگەر بیرورای هەزار زانا بێ
ئەنجا لەوەولا وەك رێوییی بە فێڵ     کردیانە تێکەڵ لەگەڵ فڕوفێڵ
لەگەڵ ئەخلاقی نزم و بێ شەرمیی     لەگەڵ هەوای نەفس بەوپەڕی گەرمیی
جا نێویان لێنا بە یاسای تازە     خوێندیان بە بالای بە سەد ئاوازە
دەهۆڵیان کوتا زورنایان بۆ ژەند     تا لەبەرچاوی خەڵکیان کرد پەسەند

زیاتر بەم شێوە داویان نایەوە
تا چەن گەل بە هۆی ئەوان توایەوە

بەلام پیلانی ئەو خوو پەستانە
بەبێ ئاکام بوو لەم کوردستانە

ئێستا بە ئاوات نەگەیون تەواو
مەگەر بۆ برێك هەرزەی خەلەتاو

رەجایە بەمان کورد نەتوێتەوە
تا رۆژ لە مەغریب ئەگەرێتەوە

ئێستاش بێگومان ئەوەی پەسەندە
هی دینە، باقیی پروپاگەندە

چونکە هێنەری ئەم دینە جوانە
راگەیێنەری حوکمی قورئانە

لە رۆژ روونترە ناو و نیشانی
سەد هەزار کەرەت گیانم قوربانی

زاتێکە ناوی مەشهووری عامە
ئیمدادی رووحیی، شیفای گشت زامە

حەبیبی خودای تاك و تەنیایە
ناوی موحەممەد (خَیْرُ الْوَرَی)یە

سوپاسالاری فەوجی ئەنبیا
مەقامێ خاصە و خودا بەوی دا

دایکی نیشتمان، زەویی بە گشتیی
بەوەی لە سکیا و بەوەی لە پشتی

بەوەش لەمەولا بێتە رووی زەمین
رۆلەی بێوێنەی ئاوا بەتەمکین

ئاوا خاوەنی عەقل و سیاسەت
ئاوا مەنبەعی دەرك و فەراسەت

رابەری ئاوا بەرز و زانا و چاك
دلسۆزی ئاوا بەرەحم و دلپاك

ئاوا رووخۆش و عەدالەت پەروەر
ئاوا رێنموون بۆ گرۆی بەشەر

ئاوا حەکیم و رەئووف و ئەمین
ئاوا بەهیممەت بەئەدەب مەتین

ئاوا میهرەبان بۆ چینی هەژار
خەمخۆر بۆ بەشی بێوە و هەتیوبار

نەیدیوە هەرگیز ئەو بە خۆیەوە
ئەگەر بە سەد ئاو رووی بشۆیەوە

فەقیر و میسکین رووت و بێنەوا
هەتیوی بێ باب موحتاج و گەدا

غەریبی بێکەس بێ ماوا و پەنا
لەلای ئەو ئەبوو حاجەتیان رەوا

شاهان سەرداران سەرۆك قەبایل
ملهورانی دەهر فیرعەون شەمایل

گەدا و دەولەمەند زانا و نەزانا
سەری خزمەتیان لەپێی ئەو دانا

علـوومی پیشـە و سیاسـەت و دیـن     پاشماوەی خامـەی ئـەون بـە یـەقین
کام خامە! خامەی سەر لەوحەی سینە     کام سینە! سینەی بێ جەفا و کینە
رازاوەی خامـەی صـوتعی رەببـانیی     نەك نەخشی خامەی کۆنە نەی مانیی
سیڕڕی حەقیقەت لە سینەی پەنهان     سەرچاوەی فەیزی بەرودوای جیهان
ئوسـتادی ئـەزەل دەرسـی داداوە     چۆن ئەبێ وەك ئەو بە رووی دنیاوە
فەیلەسـووفانی دەوری زەمانـە     دان ئەنێن بەوەی فەردی زەمانە
جا ئەگەر بشلێن (رَسُولُ اللهِ)شە     بۆ دین و دنیا حالەتیان باشە
بەلام بێباوەڕ لەپاش ژینەوە     گیر ئەخۆن بە دەس ئەو زانینەوە
چونکە هەر بە هۆی ئەو زانینەوە     چوون لەشوێن ماددە و بەشی ژینەوە
تا بە فێربوونی سەنعەت و پیشە     پشتیان لە دین کرد بۆ تا هەمیشە
بۆ دوو فڕۆکە و سەیارە و پاپۆڕ     یا بۆ کارەبا و مەکینە و ماتۆڕ
من نالێم کە دەس لە سەنعەت کێشن     ئەلێم بۆ سەنعەت کە زۆر لەپێشن
با لەگەڵ دین بێ ئەم تەطەووره     بۆ بۆ بەشی دین بەر ئەدەن ورە!
جا ئەوان ئەگەر ئەهلی تەمیزن     کەی سەنعەت و دین زیدد و نەقیزن!
کەی دنیا لەگەڵ دین مونافییە     وا گومان بردن هۆی نەفامییە
چونکە گەر وابا ئەبوو سولەیمان     دوورترین کەس با لە دینی یەزدان
چونکە ئەو مولکەی خوا بەوی دابوو     بە کەس نادرێ و بە کەس نەدرابوو
لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەریش بوو     خاوەن فڕۆکەی قالیی و بەڕیش بوو
ئەم وەخت بۆ ئەم وەخت[٥٦] دوومانگ ئەڕۆیشت     بۆ هەر کوێ خۆی و سوپای ئەڕۆیشت
تەیر و درندە و جنۆکە و ئینسان     هەمووی موطیع بوون لێشی ئەترسان
سەراسەر دنیا کەوتە ژێر دەستی     کەچیی هەر بە دین بەهێز بوو دەستی
بەقەد سەری موو لای نەدا لە دین     بۆ دنیاش کەسی پێ ناگا یەقین

هەروا قودرەت و موڵکی ئەسکەندەر — کە بەعزێ ئەڵێن بوو بە پێغەمبەر
بە سی و پێنج ساڵ تەمەنی جوانیی — زۆری بۆ کورەی سەر زەویی هانیی
گرتی لە مەشریق تا مەغریب زەمین — کەچیی بەو حاڵەش یەکەم بوو بۆ دین
کەوابوو ئایین لەگەڵ تەقوادا — قەت مونافیی نین لەگەڵ دنیادا
کاتێ مونافیین کە خاوەن دنیا — دەس بەردا لە دین بۆ جیفەی دنیا
ئەڵێن نەزانیی عەیبە بۆ بەشەر — کەس رازیی نابێ بە ئەو مەگەر کەر
چونکە عیلم خۆی وەسفی خودایە — عیلمی دنیا و دین لە دەس ئەودایە
ئیتر چۆن ئەڵێم تۆ شت مەزانە — ئەڵێم تۆ لە دین مەگرە بەهانە
تێفکرە مانای فەرموودەی حەزرەت — با لەسەر دڵت نەبێ بە حەسرەت
(أُطْلُبُوا الْعِلْمَ وَلَوْ بِالصِّينِ) — ئەگەر خاوەنی هەستی بەتینی
ئەبێ بزانی کە ئەم زانینە — شامیلی عیلمی دنیا و دینە
با تۆ بە یاسای خودا و پێغەمبەر — برۆی بۆ کوردەی موشتەری و قەمەر
نەك بە رێبازی (موزدەك)و (مانیی) — یاخۆ (مارکس)و (لینین)ی بیانیی[٤٧]
جا کە تۆ پەنا هەر بە غەیر ئەبەی — شیعار بەنێوی غەیری کورد ئەدەی
حەیفە! تۆ کە خۆت بە کورد ئەزانی — ئەگەر قیمەتی کوردیی بزانی
خۆت بێ نرخ کەی لەشوێن ئەمانە — بەڵێ ئەمانە ناویان ئینسانە
هەرچەند برێ کەس لە رووی نەزانیی — ئەو دوو شەخسەیان بە ژیر ئەزانی
بەڵام لە دیندا بێ دەس و چەك بوون — کۆنەفرۆشی دەوری موزدەك بوون
موزدەکیش هەروا لەبەر نەزانیی — کەوتە شوێن فیکرەی خەبیسی مانیی
هەردوو موددەعیی پێغەمبەریی بوون — بەڵام لە یاسای خودا بەریی بوون
خەڵکیان دەعوەت کرد بۆ ئیشتیراکیی — بۆ ماڵ و نامووس، پیاو و ژن پاکی
وتیان کە ئێمە حوڕڕ و ئازادین — بۆ لە عەیش و نۆش وا نامورادین

بۆ ئەبێ تاوا مەحدوود بین لە ژین ‌ سنووری دینمان لێ کەن بە پەرژین
ژن و پیاو ئەبێ بۆ باری هەوەس ‌ سەربەخۆ بژین بێ پرس بە کەس
مانیی بە تێکەڵ لە دینی یەهوود ‌ مەسیحیی و مەجووس وەری ئەگرت سوود
هەروا لە عیلمی فەلسەفەی یۆنان ‌ چی بە چاك زانی لەبۆ فریودان
لێی هەڵبژاردن بەناوی ئەرژەنگ ‌ کردی بە دین و بە یاسا و فەرهەنگ
ئەرژەنگ کتێب و نەخشی مانیی بوو ‌ خاریج لە قووەی غەیری مانیی بوو
هەم لە نووسین و هەم لە نەخشینی ‌ لە ئەو سەرسام بوون نەققاشی چینیی
سیحرێك بوو لە ژێر ناوی ئەرژەنگدا ‌ رووکێش بوو بەسەر کرمۆڵیی و ژەنگدا
هەرچەن بە زاهیر رازاوەوە بوو ‌ کوفر لە ژێریا شاراوەوە بوو
بەو خەت و نوختە و سیحری قەڵەمی ‌ دەرچوو لە سنوور خامەکەی دەمی
وتی موعجیزەم خەتی ئەرژەنگە ‌ مەجالی عالەم لێرەدا تەنگە
ئەنجا مارکس و لینینی دڵرەق ‌ بە مانیی و موزدەك دەسیان چۆ تەبەق
فیکرەی ئەوانیان زیندوو کردەوە ‌ گرەوی جەهلیان لەوان بردەوە
یەك لەیەك پیستر بۆ گرۆی بەشەر ‌ سەد هەزار خۆزگە نەبان بە بەشەر
کەوابوو ئەمان کۆنەپەرستن ‌ تا بڵێی نەزم و نەزان و پەستن
ئەی ئەگەر کەسێ شوێن ئەمان کەوێ ‌ بێجگە بێ دینیی ئەبێ چی بوێ
پەردەی قەساوەت دڵی داپۆشین ‌ ژەهری خۆکوژیی کوفری پێ نۆشین
لەپاش ماوەیەك رەنجێ کە دایان ‌ بەرهەمی فیکرەی پووچ و خەتایان
هیچی نامێنێ بەسەر دنیاوە ‌ گشتی ئەچێتە ماڵی فەناوە
تازە بەوان چی مەعشووقەی دنیا ‌ یەکێ تر وەك ئەو دێ بۆ خۆی ئەیبا
ئەو بە داخەوە سەر ئەنێتەوە ‌ کەسێ تر لە جێی ئەو ئەخولێتەوە
مەر خوا بزانێ چی ئەبێ جەزای ‌ چی بەسەر دێنن، چۆن ئەدەن سزای

جا با هەر بڵێ مارکس لینینیم | سەرخۆشی بەزم و بادەی بێ دینیم
جا مەلا ئەڵێ با تۆ وا نەبی | با تۆ گیرۆدەی ئەو بەڵا نەبی
با کورد نەچێتە ریزی ئەوانە | ئەوسا بێسوودە نەدامەت! گیانە
وەختێ خەباتت خێر ئەداتەوە | لە سەرچاوەی دین ئاو بخواتەوە
بەبێ دین هەموو گەلی کورد شا بێ | پێنج و دوو رۆژە، حەریفی نابێ
کاتێ بەر ئەخوا کورد لە باخی ژین | کە ژینی بۆ دین بکا بە پەرژین

## ئاوڕدانەوەیەك لە کردەوە و مێژووی گەلان بەر لەوەی تیشکی
## ئاینی پیرۆزی ئیسلام بکشێ بەسەر جیهاندا

ئەوانەی[٤٨] لە دین تێ نەگەیشتوون | خۆ بە بێ دینیش پێ نەگەیشتوون
دەبا بێن تاوێ لەگەڵ مەلادا | هەرچی یاسایە و وا لە دنیادا
بیخەنە نێو تای تەرازووی ژیریی | لێی بکۆڵنەوە بە رۆشنبیریی
بەبێ رێگەدان بە ئارەزووی نەفس | بێ لایەنگیریی لە بیروڕای کەس
بەس بە مەبەستی کەشفی حەقیقەت | لە بەینی یاسای خەڵك و شەریعەت
چاوێ بخشێنن بەم قورئانەدا | لەگەڵ گشت یاسای ئەم جیهانەدا
بزانن کامیان بە گوێرەی قیاس | چەوتە و کامەیان بە بێگومان راس
بە عەقڵی سەلیم ئەوەی فامی بێ | ناکەوێتە شك کە راس کامی بێ
ئیعتیراف ئەکا بەوەی کە قورئان | راسە، ئەوی تر چەوتن بە قورئان
چونکە زیاد لەوەی فیکرەی من و تۆن | ئەچنەوە دەوری جەهالەتی کۆن
بڕێ لەوانە ئەخەینە بەرچاو | تا بەر لە ئیسلام حاڵیی بن تەواو
لە هەرکوێوە تۆ دەستی پێ ئەکەی | بڕوا بە راسیی ئەم قسەم ئەکەی

ئەوانەی ئەمڕۆ پێی ئەڵێن تازە  بەیت و بالۆرە و ئاهەنگ و سازە
یا سەر و مل و قاچ و قولی رووت  یا شین و گابۆڕ لە دەوری مردووت
کاتێ کە تەرمی مردوو هەڵئەگرن  هەموو ئامادەی چوونی سەر قەبرن
قژ رنینەوەی دەوری مردووشۆر  سێ رۆژەی مردوو، هەڵبەستنی گۆڕ
یا کۆبوونەوەی ژنان لە مالآن  بەناوی پرسەی دراوسێ مالآن
هەروا جلی رەش لەگەڵ قوڕپێوان  نینۆکی درێژ، سووریی سەر لێوان
خۆ خۆشکردنی کچ وەکو کوڕان  یا پێچەوانە و لە شاران گەڕان
تەنانەت کچێك لەگەڵ چەن زەلام  هەموو بێگانە و لەیەکتر حەرام
تا بە هەر جۆرێ دڵخوازە لایان  رابوێرن شەرم نەبێ لەلایان
جلی ماکسیی تەنگ و تەنوورە  کە زۆر لە یاسای کەرامەت دوورە
چوونی مەکتەبی کچان بەو شێوە  کە لای هەموو کەس شەرم و دزێوە
ئەویش بەو هەموو لەنجە و لارەوە  بەو بۆن و بۆیە و ردنگی شارەوە
بەو هەموو ناز و غەمزەی دڵتەزێن  بە تیری مژۆڵك نیشانە شکێن
هۆشی خاوەن هۆش ئەبەن بە تالآن  سەلبی حاڵ ئەکەن لە خاوەن حالآن
هەروا تەوزیفی ژن و پیاو بە رێز  شان بە شانی یەك لەسەر کورسیی و مێز
یاخۆ لە نادی و حەفلە و مەسیرە  ئاخۆم کێ بڵێ خوایان لەبیرە
بەناوی ماف و ئازادیی ژنان  بەشداریی بوونیان لە ئەرکی ژیان
بەبێ تەفاوەت لە بەحر و لە بەڕ  نێر و مێ تێکەڵ وەکو بزن و مەڕ
تەنانەت چەکیش هەڵگرتن بۆ شەڕ  لەگەڵ سوپادا سەنگەر بە سەنگەر
پەرژینی دوور بێ لە رووی براکەی  ئەبێ چی لێ بێ شەرم و حەیاکەی!
بە رۆژ دائیرە و بازاڕ ئەکەن پڕ  شەو کە چوونەوە ماڵی سارد و سڕ
پیاویش نەوێرێ بڵێ بۆ وایە  چونکە ئازادیی و مافی درایە

بەبۆنەی مەعاش بێباکە دادەم          ئەڵێ خۆم ئەژیم گوێ بە کەس نادەم
هەرکەس رازییە ئاوا بەم جۆرە          ئەمنا هەوراز و ئاوی سارد زۆرە
مەڵها و سینەما و مەسبەح و قومار          چوونی سەیرانگای هاوین و بەهار
هەموو سەرخۆشی ئارەق و هەوەس          بێ ئەوەی تۆزێ شەرم کەن لە کەس
فیلمی سینەما و شریتی ڤیدۆ          چاکترین بەڵگەن بۆ راست و درۆ
دەوری جەهالەت واتە بێ دینیی          دەورێکی یەکجار گرنگی بینی
بۆ باری هەوەس بۆ ستەم بۆ زۆر          هەر بە زیندوویی کچ ئەخرایە گۆڕ
هەرکەس کچی با عاری لێ ئەهات          بۆ کوڕ مزگێنیی ئەدا لە خەڵات
خاوەن دەسەڵات فەقیری ئەخوارد          تەنیا خزمەتچیی و کەسی خۆی ئەبوارد
باقیی ئەسیر بوون بە دەستی پیسی          بەس رێگریی بوو شوغڵی رەئیسیی
بوویوو بە یاسا بۆ ستەمکاران          بۆ خوێنمژینی لات و هەژاران
تەعەددای ماڵیی و نامووس و شەرەف          گرنگ بوو لایان وەك شتی مەتحەف
تەنانەت ژنیان ئەدا بە کرێ          بە نامووسی خۆی پارە وەرگرێ
ئەرکی ژیان و بەڕێچوونی ماڵ          بەشی ژنان بوو لە رێگەی بەتاڵ
هەر ژنێ ئەگەر هەتا ئێوارە          خەرجی ماڵەکەی بەو جۆرە پارە
پەیدا نەکردبا شەو ئەمایەوە          تا دەمەو بەیان ئەسووڕایەوە
چوونەوەی ماڵی لێ حەرام ئەبوو          لە بن دیواران ئەهات و ئەچوو
تا بۆی دەس ئەدا چەن کەس بە پارە          خۆی پێ دابین کەن هەتا ئێوارە
ئەنجا ئەچووە ماڵی وێرانی          خۆی بەو حاڵەوە سەربەرز ئەزانی
بڕێکیش هەروا بە سەربەخۆیی          بێ زۆر لێکردن بێ من و تۆیی
فەرقی بۆ نەبوو بێ پارە ئەیکرد          رۆژی چەن کەرەت حەیای خۆی ئەبرد
ئەوسا بەو شێوە نامووس ئەدۆڕا          ئێستە بە یاسا ناوەکەی گۆڕا

هەروا شتی تر زۆرە لەم بارە
بە زمانی قەڵەم ناکرێ ژمارد

بەرهەمی یاسای تازە ئەمانەن
مافی ئافرەت و یاسا بەهانەن

ئەگەر بە ئینصاف بیر کەن لەمانە
ئەزانن هەوای نەفس و شەیتانە

ئەم کردەوانە نە مافن نە بەش
دەك بە قوڕداچن لەنێو چاڵی هەش

هەرکامیان دژی ئەم دینە جوانەن
کۆنەفرۆشی هی ئەو زەمانەن

خەریکن بۆیەی پێدا بساون
تۆزێ بە رەنگی تازەی بناون[49]

شاخ و باڵێکی پێوە بلکێنن
بە گوێی گەلاندا وا راگەیێنن

بەم ئاڵوگۆڕە پێشکەوتوون لە ژین
بۆیە گوێ نادەن بە بەرنامەی دین

بەڵام بە راسیی دەوری جەهالەت
دەوری سەخافەی کۆنە و رەزالەت

لەپاش چواردە قەرن رزین و گەنین
ناوی لێ ئەنێن ئازادیی لە ژین

ئاوایە فێڵی ئەو حیلەبازە
کۆنە ئەفرۆشن بە نرخی تازە

دەی وەرن ئینصاف بدەن بە خۆتان
ئەمانە لاتان شەرم نین بۆتان!

ئێوە یاسای دین ئەنێنە لاوە
ئایە ویژدانیش باوی نەماوە

هەرکەسێ مەعنای ئینسان بزانێ
لەگەڵ حەیوانا فەرقی بۆ دانێ

هەست بکا بەودی ئەو فەرقە چۆنە
ئەزانێ تازەی ئەمانە کۆنە

ئەمانە نرخیان بۆ بەشەر نەهێشت
ئەمانە تامیان لە حورمەت نەچێشت

خۆیان لە حەیوان زۆر نزمتر بوون
بۆیە لە حەیوان بێ شەرمتر بوون

شئوونی قەومیی و هۆز و فەردییەت
رێزی ئەدیب و زانا و شەخسییەت

نەمابوو ناوی لە رۆژگارا
خولق و خووی بەشەر چووبوو بە دارا

دەورێکی دایم پڕ لە جەفا بوو
ئەودی نەمابوو رەحم و سەفا بوو

بێدەس[60] لە شێوەی ژیان بێزار بوو
ساڵ بە ساڵ دایم خۆزگەی بە پار بوو

ئینسان ئیسمێ بوو بەبێ موسەمما
عەینەن بە وێنەی وجوودی عەنقا

دین کە هات وەك ڕۆژ پرشنگی وەشاند بەرنامەی حەیا و حورمەتی نواند
مەعنای ئینسان و شێوەی ڕێبازی بە ڕووحی تازەی پڕ لە شانازیی
لەگەڵ نرخی خۆی بە ئینسان داوە بیساطی جەور و جەفای پێچاوە
عەدل و ئینصافی کرد بە جێگەدار ڕووخا بناغەی قەڵای ستەمکار
هێزی ئیسلامیی چوو بە گژیانا ئەوپەڕی ڕێزی بۆ بەشەر دانا
تاریکیی جەهل و نەفامیی لابرد شەویشی وەك ڕۆژ بە چڵچرا کرد
هەرکەس ئەرکی خۆی لەبۆ کرد دیاریی عالەم ڕزگار بوو لە شەرمەساریی
پیاو بە وێنەی شێر بە شیر و تیری ژن دەرچوو لە ژێر باری ئەسیریی
بۆ کاتی پێویست ئەویش بەشدار بوو بەڵام لەو کاتەش ئەرکی دیار بوو
شەرم و شکۆی ئەو لە ڕیزی صەفدا وەکو دوڕ وابوو لەنێو صەدەفدا
پارێزگاریی لەو ئەرکی گشتیی بوو ڕێزی لە یاسای دین سروشتیی بوو
نەك هەر وەکو پیاو بەڵکو سەد ئەوەند نەبادا ڕۆژێ ببینێ گەزەند
مەگەر لە چەن شت بڵێین وەك میرات کە ئافرەت بەقەد نیوەی پیاو ئەبات
ئەویش بە زاهیر وا دەرئەکەوێ ئەنا بۆ دوارۆژ زیادی ئەکەوێ
چونکە تا کچە و وا لە ماڵەوە ناخەوێ بۆ ژین بە خەیاڵەوە
ئەنجا هەر لەگەڵ هاتە سەر مارە فەوردن ئەو ئەبێ بە خاوەن پارە
خصووص کە ئەمڕۆ زیاد لە نرخی خۆی حەقی مارەیی مەعلووم ئەکەن بۆی
ئەمجار لەگەڵ شووش بەشدارە لە ژین ئەو گوڵی ماڵە و پیاوەکەش پەرژین
هەر لەسەر حازر ئەخوا و ئەخەوێ بێ ئەوەی فلسێ سەرف کا لەوێ
هێشتا نازیشی لەسەر چاوییە خۆی خاوەن ماڵی ماڵی پیاوییە
لە شتێ تریشا کەمترە لە پیاو ئەویش لەبارەی هەستی ناتەواو
چونکە هەتا دین ڕێز ئەدا بە ئەو ئەو خۆی نزم ئەکا بە ڕۆژ و بە شەو

ئەگەر وا نەبا ئەبوو وا نەبا    عەبا لەسەر رووی شەرەف لا نەبا
ئەگەر مام کەمێ لەم بارەش ئەدوێم    دەرس وەرگرە لەوەی پێت ئەڵێم
دە فەرموو بڵێ چی ترت کەمە    بڵێم دین لەگەڵ ژن کەمتەرخەمە
بۆ بەزەت نایێ بە حاڵی برات    ئەرکی سەرشانی و قەرزاری وڵات
زیاد لەوەش کۆشێ مناڵی هەتیو    بەبێ سەرپەرشت بێ پەنا و پەسیو
ئەچێتە ئەستۆی لە ئەرکی ژینا    هەروەك مەسئوولە لە یاسای دینا
دەی برا ئەگەر لەبەر دین نەبا    ئەبوا لە بەشدا دە ئەوەندە با
هەروا ئەگەر فەرق لە شتێ ترایە    نە خەتای دینە نە هی مەلایە
یەعنی پیاو بە نێر خولقا سروشتی    ژن بە شێوەی مێ دروست بوو گشتی
سا تۆ تەبیعەت ئەکەی بە هۆی بوون    یا دەهری بێ‌میهر یا خودای بێچوون!
ئەوانەی ئەڵێن دەهر و تەبیعەت    ئێمەیان هێنا دیی بە حەقیقەت
چونکە ئەو بەدیهێنەرەی ئەوان    وای دروست کردوون بە زەعمی ئەمان
ئەبێ رازییش بن بە شێوەی گشتیی    بە چۆنیی وەزعی حاڵی سروشتیی
ئەوانەش خۆیان بە عەبد ئەزانن    واتە کیتابیین یا موسڵمانن
باوەڕیان وایە هەرچی مەوجوودە    بەرهەمی صونعی خودای مەعبوودە
ئەزانن هەرچی وا لە دنیادا    دەرناچێ لە ژێر دەستی قەزادا
رەزاش بە قەزا واجبە لایان    تانە لە قەزا کوفرە لەلایان
ئەگەر وا نەبن دوورن لە تەسلیم    کوفرە یا نیفاق (جَزَاهُمْ جَحِيمْ)
بەڵام کیتابییش بەوەی کە خۆیان    باوەڕیان پێیە و مەنهەجە بۆیان
وەك یاسای تەورات یا حوکمی ئینجیل    بەس بەمان رازیین ئەیکەن بە دەلیل
کاتێ کە حوکمی قورئان ئەبیسن    دژی ئەوەستن ئەڵێی ئیبلیسن
نارازیین بەوەی دینی تازە هات    قورئان بۆ حەزرەت هێنرا بە خەڵات

نەسخی کرد هەموو ئەدیانی پێشوو    بۆیە بە کوفریان حوکم ئەکا مێژوو
ئەڵێن کە خۆمان خاوەن کیتابین    تازە بە دینی کەس رەزا نابین
بۆ ئەبێ دینی ئێمە بگۆڕێ    لەجێی ئەم یەکێ تر بێتە گۆڕێ
بە (بۆ! بۆ!)ی غەڵەت لە رێ ترازان    لەگەڵ ئەو یاسا مەنسووخە سازان
ئەمانیش هەروەك تەبیعیی و دەهریین    ئەبێ تا ئەبەد بۆ خۆیان بگرین
بوون بە نێر و مێش داخڵ قەزایە    وەك نەسخی ئەدیان ئەمری خودایە
نابێ کەس بڵێ ئەی بۆچی وابوو    حاڵی ژن و پیاو لەیەکتر جیا بوو
بۆ ئەوان بە نێر ئێمە بە مێ بووین    خۆ هەموو لە یەك پیاو و ژنێ بووین
بۆ ئەبێ ئێمە دانیشین لە ماڵ    وەکو حەپسیی بین بێ ئاگا لە حاڵ
بۆ ئەبێ وەك پیاو ژین نەبەینە سەر    لەسەر زەوییدا تا کورەی قەمەر
چونکە ئەم (بۆ بۆ!) بۆ ئەداتەوە    بۆی نارەزایی تۆ ئەداتەوە
ئەنجا خۆ بە (بۆ!)ش قەزا ناگۆڕێ    قەڵەم چی نووسی وا دێتە گۆڕێ
لەگەڵ قەزادا بێسوودە بۆڵە    ئەگەر ئەم دنیا بدەن لە تۆڵە
کەوابوو برا و خوشکانی عەزیز    ئەگەر بەشدارن لە دەرك و تەمیز
باشترین رێگە تەسلیمە و رەزا    بە هەر شێوەیەك بێتەجێ قەزا
بۆ! بۆ! خەیاڵی نەفس و شەیتانە    یا هۆی رەفیقی بەنێو ئینسانە
داد و بێدادی مەلا بۆ تۆیە    بەڵکو نەکەونە شوێن ئەو (بۆ! بۆ!)یە
تانە لە مەلا تەشەر لە دینە    بۆیە دژ بە ئەو کوڵی رەنگینە
مەلا بە میکرۆب مەزانن بۆ گەل    با مەلاش نەڵێ بەردێك و سەد قەل
ئەم دەنگوباسە بەسەر مەلاوە    تەنیا هەر لەنێو گەلی کورد باوە
باقیی میللەتان بۆ رەهبەریی دین    بەپێی عەقیدە و باوەڕی بەتین
رێز ئەگرن تەواو لە مەلای خۆیان    هەرچەند مەلاکەش بەلا بێ بۆیان

بۆیـه سـەرکەوتوون سـەربەخۆ تـەژین
ڕێـز و ئیحـترام دانـەنێن بـۆ دیـن
چـونکه دیـن یـانی قـانوونی خـودا
نـازڵ بـێ بـه وەحـی بـۆ سـەر ئـەنبیا
بـەپێی زرووفـی زەمـان و مـەکان
یاسای دین و ژیـن بـه گـەڵ دا نیشـان
ریشـەی فەسـادی دەوری جەهالـەت
بکێشـێ لـه بـن لاچـێ ڕەزالـەت
هـەوڵ و تـەقالات نەچـێ بـه هـەدەر
بەرهـەمی ژینـت نـەبێ بـه زەرەر
(حَبْلُ الْمَتِين)ی ڕێگـەی هـودا بـێ
(عُـرْوَةُ الْوُثْـقَى)ی ڕۆژی جـەزا بـێ
سـا مەنسـووخ بووبـێ یـا نـەگۆڕابێ
واتـه ئـاینی هـەتا هـەتا بـێ
جـا بۆیـه ئـەبێ دیـن موحتـەرەم بـێ
هی کورد یا عەرەب یا هی عەجـەم بـێ
بـەڵام داخەکـەم دیـن بـه یـەکجاریی
خەریکـه بارکـا لـه کـوردەواریی
واتـه ئـەهلی دیـن عولـەمای ئەکبـەر
وجوودیـان بۆتـه کیبریتـی ئەحمـەر
زانایـانی دیـن خـاوەن عیلم و فـەزل
نـەماون، مەگـەر (قَلِيـل)و (أَقَـلْ)
ئەم جیلەش ئەگەر کۆچـی دوایـی کـەن
گەلی کورد مەگەر دیـن گـەدایی کـەن
چـونکه مەدرەسـەی فـەقێش نـەماوە
تـا جێـی ئومێـد بـێ بـۆ لەمـەولاوە
ئەمان بوون بـه دەم بـه قەڵـەم، کاکـه
پاراسـتیان تـەواو ئـەم دینـه پاکـه
کەم یـا زۆر ئـەمان وێنـەی چرا بـوون
بۆ گـەلی بێکـەس نـووری هـودا بـوون
لـه ژێـر سـایەی دیـن هـەروا لـەجێوە
نیزامـی دنیـاش ئەچـوو بـەرێوە
نـه ئـاژاوە و شـەڕ نـه دەربـەدەریی
نـه براکـوژیی بـوو نـه قوربەسـەریی
نه هەتکی نامووس نه تەوهین بـه دیـن
نـه یاسـا شـکان، لاچـوونی پـەرژین
نه یاسای رووسیی نه شێوەی فـەرەنگ
نه مۆدی غەربیی و نه تەنوورەی تەنگ
ئەمانـه لێـره نـەك بـاوی نـەبوو
بـەڵکو لـه ئەسـڵا هـەر نـاوی نـەبوو
ئێسـته کـه ئـایین زۆری[٦١] نـەماوە
دنیـاش هـەر ئەچـێ بـەرەو دواوە
هەڵخەڵـەتاوان لادران لـه دیـن
وا نیشان ئەدەن پێشـکەوتوون لـه ژیـن

کەچیی هەرلایەك کە بۆی ئەڕوانی بۆتە ئاژاوە و شەڕی نەفسانیی
کوشتن بەپێی فیل دەرچوو لە سنوور دەماغی گەلان پڕ بوو لە غروور
ئەوەی خەڵك ئەکوژێ بێ دەلیل ئەیکا ئەوەش ئەکوژرێ بێ بەدیل ئەڕوا
ئەوسا پیاوکوژیی شاز و نادر بوو بۆیە ئەو دەورە گەلێ چاتر بوو
بەپێی حەدیسی (خَیْرُ الْمُرْسَلِینْ) ئەهلی عەزابن کە دوورن لە دین
ئەتوانم بڵێم بۆتە هەرج و مەرج چونکە بەبێ هیچ خۆیان ئەکەن گەوج
نە بەرپرس هەستی مەسئوولیی ئەکا نە ژێردەستەکەش گوێ بە ئەو ئەدا
ئەوسا لە دێیەك یەکێ ئاغا بوو بۆ جەور و ستەم حوکم فەرما بوو
هەرچەن بۆ حاڵی خۆیان خراپ بوون بۆ حاڵی گەل و دیانەت چاك بوون
سا لەبەر خودا یا لەبەر خۆیان ڕێزی ئەهلی دین ئیرسیی بوو بۆیان
ئەگەر زوڵمێکیش چووبا لە کەسێ لەنێو هاومال و دەر و دراوسێ
حاکم لە دێیەك تەنیا یەکێ بوو جەریمەی خەتا بەرخێ شەکێ بوو
کەم رێ ئەکەووت بگاتە ئاژاوە ئاو بە ئاگرا ئەکرا و ئەکوژاوە
ئێستە هەرکەسە بۆ خۆی بەگێکە کە چەکیشی بوو وا بەگ لگێکە
هەرکەس کە قینی هەستا لە هەرکەس تەق لە بن دەستە بێ ترس لە کەس
گەلێ کە وابێ حاڵی وڵاتی نەزم و تەرتیبی لێ ئەبێ قاتیی
ئاوا مەحاڵە بێ بە سەربەخۆ تا مابێ ئەبێ بڵێ ڕۆڵەڕۆ
ئاگر بە تۆزێ ئاو ئەکوژێتەوە ئاگری غروور ناکوژێتەوە
ئەمەش بێگومان خوێنەوارەکان بە هۆی مەکتەبی لادێ و شارەکان
لەبەر سەقافەی ناتەواویان تەفرەقەی فیکریی کەوتە ناویان
لە چوار ماڵی کورد خزم و برازا سنووری ئەحزاب لە سەد ترازا
بێ ئەوەی هیچکام گوێ بگرن لەیەك هەموو یەك بگرن یاسا کەن بە یەك

لەجیاتی سوڵح و سەفا و فەراسەت ئاگر و ئاسن بە هۆی سیاسەت
حوکم ئەکا تەواو بەسەر بەشەردا جەهل و نەزانیی دنیای بە شەڕدا
بە هۆی ئەمان بوو عالەم بوو بە دژ برایان لەگەڵ برا دا بە کوژ
تا براکوژیی گەیشتە کێوان بەهاری شادیی بوو بە قوڕپێوان
کەس نەما دڵی پڕ نەبێ لە زام لە دەستی نەچێ لاوی نەونەمام
دەشت و دەر و کێو گشت پڕ بوو لە تەم وڵاتی داگرت هەوری ڕەشی خەم
کام تەم! تەپ و دووی جەرگ بڕاوان بە خوێنی ڕۆڵەی بێ سووچ و تاوان
کە بەس بۆ مافی گەل هەڵخەڵەتا بێجگە تا لەمە قەت نەیبوو خەتا
کەچیی نەیزانی ژێرەکەی بۆشە ڕێبازی خەبات چەوت و نەخۆشە
ئەگەر وا نەبێ بۆ ئەبێ وابێ برا دوژمنی خزم و برا بێ
لەم چوار ماڵەدا بەنێوی خەبات بۆ گەلی هەژار شەڕ گرتی وڵات
کوورەی غرووری هەوەسیان دەماند تا خۆیان بەسەر هەژارا سەپاند
بەڵام نەك سوودی لێ نەگرت هەژار نان و ئاویشی بوو بە ژەهری مار
شاخ و داخەکەی بە گوڵ ڕەنگاوی دەر و دەشتەکەی دێم و بەراوی
باخ و ڕەزی مێو مێشەی چناری ئاوی کارێز و جۆگەی بەهاری
جێ بارگە و بنەی کاتی هەواری باخچە و دێبەری حەوش و حەساری
ماڵە قوڕینەی پشتاوپشتەکەی قسنی[٦٢] گۆڕەکەی مردووی گشتەکەی
ڕەنجی چەن ساڵەی باب و باپیری کەوتە ژێر دەستی سوپاکەی میریی
بوو بە کوند هەرکوێ کە وا ڕێی تێکەوت تەنانەت سڵی نەکرد لە مزگەوت
داریشی نەهێشت بەسەر بەردەوە بوو بە شین لەگەڵ داخ و دەردەوە
هەموو دەربەدەر بێ ماڵ و حاڵن تا وابن ئەبێ هەر پێی بناڵن
کەچیی لە بەزمی خۆشیان ناکەون خەریکی چەپڵە و هەڵپەڕکێی شەون

بەڵێ سەقافەی نیوە و ناتەواو     هەر ئەبێ ئاوا گەل بخاتە داو
خۆشی هەر تاوێ سەرکا بە کونێ     هەر رۆژێ پەنا با بە دوژمنێ
مووچە بەنێوی فەلا و کرێکار     وەرگرێ و لێشی ببێ بە سەربار
جا لەگەڵ ئەمەش سووچ و[٦٣] خەتای خۆی     بە هەر زمانێ کە مومکین بێ بۆی
ئەینێتە مل دین یا مەلای فەقیر     چونکە خۆی لە دین بێزارە و نەفیر
مەلا بەس ئەرکی خۆی بەجێ دێنێ     بۆ ئەوەی کە گەل بەجێ نەمێنێ
لە پەنای دیندا ژینیش باتە سەر     سا نیشتەجێ بێ یاخۆ دەربەدەر
کە دنیاکەی چوو لەپێناوی تۆ     با لە دینیشدا نەبێ رەنجەڕۆ
بەڵام تۆ فەرموو کاکی رۆشنبیر     خاوەن دکتۆرا فەیلەسووفی ژیر
سەرکردەی خەبات بە هیچ بە خۆ ناز     بۆ رێی رزگاریی بە خەیاڵ گیانباز
سیاسەتمەدار بۆ نەجاتی گەل     کەششافی کورەی مەریخ و زوحەل
مەلەوان لەنێو گێژی دەریادا     یا لەسەر هەوا و کەشتیی فەزادا
بزانم چی بوو بەرهەمی جوانت     بۆ خۆت و گەل و بۆ نیشتمانت
غەیری ئاژاوەی دەوری سیاسیی     کە لەبەر پیسیی ناکرێ باسی
دەك ماڵت ئاوا بۆ رۆشنبیرییت     بۆ هەست و فام و ئیددیعای ژیرییت
جا کە تۆ هاتی ئێمەت دا بە قڕ     چ تۆ بماخۆی چ گورگی دەم شڕ
فەرقی تۆ ئەبێ کامە بێ بۆ من     کە من تیا چووم، چ تۆ چ دوژمن
ئیتر من بە چی دڵ بە تۆ خۆش کەم     جەوری چەن ساڵەی دژ فەرامۆش کەم
تۆ ئەگەر تەماع هەڵی نەناوی     بۆ گەل هەوڵ ئەدەی گلێنەی چاوی
مەیکە بە کارێ غەزەب ببارێ     بە ئاهوناڵەی پیر و هەژارێ
قەیناکا بۆ خۆت هەرچی کە هەی هەی     با لە کردەوەت عالەم نەڵێ وەی
دەس لە دین مەدە و لە دین پەرستان     شەرەف پارێزبە لە نادروستان

ئەگەر یەکیەتیی بۆ دین گرانە — یەکیەتیی میللیی ئەرکی هەموانە
با کاربەدەستت زانا و ئەدیب بن — خاوەنی حیلم و سەبر و شەکیب بن
بە دادی هەژار ستەم لێکراو — رابگەن تەڕدەست دڵخۆشبێ تەواو
با گەلی ماندوو و مردوو و چەوساوە — بڵێ پێت ئۆخەی ماندووم حەساوە
چونکە هەر ئینسان مەعناکەی وایە — هەر فیکرێکت بێ تۆ لەم دنیایە
نابینی ئێستاش ناوی نەوشیروان — با کافریش بوو لە دین هیچ نەزان
بە چاکە ئەبرێ ون نابێ ناوی — لەبەر ئینسانیی و عەدلی تەواوی
کەوابوو ئەگەر خودا دەستی دای — رۆژێ لە رۆژان رێی مەبەستی دای
ئاواتی خۆت و گەلت بەجێ هات — لەبیرت نەچێ پێشێلی وڵات
تا تۆ بە حورمەت لەگەڵ گەل بژی — چرای وڵاتی و تاریکیی دژی
تا تۆ رێز بگری لە یاسای خودا — بێگومان خوداش دەستی تۆ ئەدا
کەوابوو مەچۆ بە گژ مەلادا — یا بە گژ دین و نەهجی خودادا
بەناوی کۆسپی رێی سەربەخۆیی — چونکە کۆسپی رێت منی‌یە و تۆتۆیی
بەش بەشی گەلت نایەڵێ بڕۆی — تا تۆش نانێکی بە دزی خۆت بخۆی
ئا ئەم کۆسپەیە تۆی خستە دواوە — بیرکەوە لەکوێ و چیت لێ قەوماوە
بزانە کێ وەك مار دای بە دەستەوە — کێ رێی خەباتی لە گەل بەستەوە
کێ بە تیغی قین دای لە دەماغت — کێ زاڵ بوو بەسەر فیکرەی نەساغت
کێ دان و داوی بۆ دانایەوە — بە طوولی مێژوو تیایا مایەوە
کێیە ئاوایە ئەو ئیشوکاری — سا بە راستەوخۆ یا نادیاریی
ئەو کەسە دژتە با مەعلووم بێ لێت — هەر رۆژە کۆسپێ ئەخاتە بەرپێت
نەك دین و مەلای کوردی دواکەوتووم — برا باشەکەی بەهەڵەداچووم
تۆ کە خۆت نیتە دەرکی ئەمانە — مەلاش بە کۆسپی خەبات مەزانە

خۆ مەلاش وەك تۆ هەر كوڕی كوردە   بۆ لەبەرچاوی تۆ بۆتە جەردە
ئاخر بێجگە دین گوناهی كامە   بۆتە نیشانەی تیری مەلامە
مەلا بە زاهیر مەسئوولە، كاكە   ئەوەی نەیبینێ لەوا بێباكە
ئەركی ئەو ئەمرە بە چاكە كردن   دووریی لە ئیشی خراپە كردن
ئەگەر نەبینێ برێ شت بە چاو   روناكتر لە رۆژ بە رۆژی هەتاو
كە هۆی سەرشۆڕیین بۆ گەل و كۆمەڵ   چی داوە لەسەر كەڵە هەرزی كەڵ!
بەڵام ئەوانەی كە نووكی قەڵەم   شەرم ئەكا ناویان ببا پڕ بە دەم
ناكرێ چاوی لێ بنووقێنێ   ئەگەر چێوی شەرم سەری بشكێنێ
چونكە ئەترسێ پەردی بستێنێ   گەلی كورد ئیتر رێزی نەمێنێ
بە هۆی ئازادیی واتە ژینی حوڕ   ئاو لە ئاوەڕۆ دەركەن كچ و كوڕ
هەركەس سەرنج دا لە برێ قوتابیی   تف ئەكا لە خۆی لەعنەت لە بابی
زیاتر هۆی ئەمەش تەرزی خوێندنە   قوتابیی كوڕە و مامۆستا ژنە
یا پێچەوانەی ئەم حاڵە باوە   بۆیە شەرمی كچ لە كوڕ نەماوە
دەرسی تێكەڵیی جامیعە و مەكتەب   دوورن لە دین و لە یاسای ئەدەب
بەم شێوە ئاوا چاو لە دژ كردن   مامۆستای بەرێز دواڕۆژی مردن
چی ئەدا جوابی قوتابیی لەوێ   ژیریی و زانایی ئەی بۆ كەی ئەبێ
نازانێ مەگەر كە ئەم بەرپرسە   بۆ ئەم تاوانە لەو جێگەی ترسە
كەسێ بوو بە هۆی چاكە یا خراب   (فَطُوبَى لَهُ، وَبِئْسَ الْمَنَابُ)
خۆت و ویژدانت تێكەڵیی ئاوا   یاسای شەرق نین یا هی رۆژئاوا!
ئەوان كە دەسیان لەولا بڕاوە   پەردەی حەیایان لێرە دڕاوە
قەیناكا بۆیان ئەم حاڵە زشتە   چونكە ئەم دنیا بۆیان بەهەشتە
مامۆستا زانكۆ جێگەی خەباتە   جێی روناكبیریی و خێری وڵاتە

جێگەی ئەخلاقی بەرز و شیرینە — بەڵام هەوێنی بە یاسای دینە
بۆ پشتتت هەڵکرد لەو دینە جوانە — سەقافەی تازەت کرد بە بەهانە
چی خۆت حەزت کرد سڵت لێ نەکرد — چی خودا فەرمووی دەستت بۆ نەبرد
بۆچی سەقافە وایە ماناکەی؟ — تەرکی بەندەگیی و دینی خودا کەی
ئەگەر لە یاسای تازە وا حاڵیی — دەیارە لە یاسای راسیی ناحاڵیی
خوا حەز لە یاسای بەم شێوە ناکا — مۆڵەتت ئەدا ئیهماڵت ناکا
رۆژێ هەر ئەبێ تۆ بەم رێبازە — گیر بخۆی بە دەس سەقافەی تازە
دین مەنعت ناکا لە شادیی و خۆشیی — دین ئەڵێ دایم ئەبێ تێکۆشی
خوا ئەمر ئەفەرموێ پێمان سەرکەوین — بۆ هەموو ئیشێ لە دژ بەرکەوین
دژت هەرکەس بێ ئەتۆش دژی بە — بەڵام تۆ دژی براکوژیی بە
نەبادا دوژمن دڵی بگۆڕێ — بۆ چەوسانەوەی گەل بێتە گۆڕێ
با تۆش بۆ دیفاع بتوانی هەستی — رێگەی زوڵم و زۆر لە دژ ببەستی
لەبیرت نەچێ رەنجی چەن ساڵە — با چی تر نەڵێن وا ئاش بەتاڵە
فرسەتە هەڵە خودا داویە پێت — با کۆسپی مەینەت نەخرێتە بەرپێت
شوکری خودا کەن بەبێ حیلە و غەش — ئاڵای سەربەستیی بگرنە باوەش
ئەنجا ئەوانەی مەسئوولی خەڵکن — بۆ سەرپەرشتیی چاك و بەکەڵکن
خاوەن وەزیفە تا سەرۆکی گەل — ئەبێ بڕوانن بۆ دەرفەت و هەل
ئێمەی گەلی کورد بە یاسای خودا — راهاتووین، وەرن بۆ خاتری خودا
بە پێچەوانەی ئایەت و حەدیس — یاسا دامەنێن بەناوی تەدریس
خوێندن بۆ زانین، زانینیش بۆ دین — با بۆ هەردووکیان پێکەوە بژین
تێکەڵیی کوڕ و کچان بە کۆمەڵ — خیلافی دینە و شەرمە بۆ کۆمەڵ
لای ئێوە خوێندن بۆ کاتی لاویی — دەس نادا مەگەر بە تێکەڵاویی!

ئەوانەی خاوەن هەست و بەهۆشن	بۆ سەربەرزیی گەل دڵ بەپەرۆشن
ئەزانن بە دین بەجێ نامێنن	دوور لەنێو تۆتۆی صەدەف دەردێنن
مشتومالّی زەین بە دینە، کاکە	کە ڕەینت روون بوو بەرهەمیش چاکە
رێ مەدەن دەخیل بە هەلپەرستان	بە خائین بە گەل هەم بە کوردستان
تەنانەت خائین بە نەفسی خۆشی	بۆ عەمیلیی دژ، بە خۆفرۆشیی
ئێمەش کە هاتووین وەك گەلان ئەڕۆین	دەی با بڕێکیش خەمی دین بخۆین
با ژینت لەگەڵ دینت بە ڕەحمەت	بچێ بەڕێوە بە عەقڵ و حیکمەت
چونکە دوارۆژی ژینت لەڕێیە	دینیش زەخیرە و توێشووی ئەوێیە
نابینی کەسێ بڕوا بۆ سەفەر	ناکەوێتە رێ بێ زادی سەفەر
تا بیرت بە لای ئەم رێگاوە بێ	سەربەرزی لێرە یا لەولاوە بێ
تەنیا بۆ دنیا هەوڵ و تەقالات	ناگا بە دادت بێ شك بە لەولات
با نەفعت عام بێ لێرە یا لەوێ	ئەگەر تۆ خۆشیی هەردوو لات ئەوێ
کەی ئەوە یاسای باب و باپیری	کوردە! خۆ تۆ خۆت مامۆستای، ژیری
خاوەنی مێژووی هەزاران قەڕنی	بۆ یاسای مێژووت لە خۆت دائەڕنیی!
تا کەی چاو لە دژ یا لە بێگانە	دژ بۆ ئیشی خۆی ئیشی پێمانە
یاسا شکێنیی شەرم ئەشکێنێ	سەرشۆڕت ئەکا قەدرت نامێنێ
سوور و سپیی بێ یا ڕەش وەکو قیر	هەریەك بە ڕەنگێ دێ ئەتخاتە گیر
هەر زانی کەمێ زیان ئەگا بە ئەو	رۆژی ئاواتت لێ ئەکا بە شەو
کەم پشت بە دوژمن ببەستە، کاکە	خوێنی کورد بۆ دژ مەڕژێنە چاکە
چی ناوی جیاجیا لە خۆتان ناوە	یاریی پێ ئەکەن لەم ناوە ناوە
بەناوی سیاسەت بۆ رێگەی خەبات	نەجاتت نادا، بە گیانی برات
پشت بەستە بە خوا و بە رۆڵەی ژیرت	کارەساتی گەل نەچێ لەبیرت

وەك زۆڵە كوردی چرووك و دڵ ڕەش ئەم چوار ماڵەمان مەكەن بە بەش بەش
ڕۆژێكە ڕۆژی شێرە كوڕانە گاڵە و هەرا كەن دوژمن قڕانە
ئەبینین بە چاو هەر لە دوورەوە دوژمن كەوتۆتە لوورە لوورەوە
با كوڕ ئەركی خۆی بزانێ كامە كچیش لە ڕێی خۆی لا نەدا، مامە
ئەگەر وا نەكەن، بە تێكەڵ بژین ئاخۆ كەی هەوای شەرەف هەڵمژین!

## كورتە باسێك لە حەقیقەتی ئەدەب و زانیاریی، بۆئەوەی بزانین كە لە ڕاستیدا ئەدەب و زانین مەعنایان چیە و لە كوێوە هاتوون

دیسان لێرەدا شتێ تر ماوە لەگەڵ ئەدیب و ئەدەب لەم ناوە
لەگەڵ مێژوونووس بە شێوەی گشتیی بۆ بە عەقڵی گەل ئەنازن گشتی!
واتە بە جیاواز لە ئادابی دین ئەدەب دائەنێن بۆ گەلان لە ژین
هەركەس هی گەلی خۆی لا پەسەندە بێ ئەوەی هەست كا كە بۆ پەسەندە
ئەو ئەڵێ عەقڵی گەلی من چاكە ئەم ئەڵێ نەخێر هی ئێمە، كاكە
هەوڵ ئەدەن هەموو بە شیعر و ئەدەب بۆ بەڕێزبوونی نەتەوە و نەسەب
سەیریش ئەوەیە ئەو مێژوونووسە یا ئەو ئەدیبەی كە ئەدەب نووسە
بەس بە ڕەوشت و خولق و خووی گەلان وا پیشان ئەدەن پێشكەوتوون ئەوان
هەركەس لایەنی گەلی خۆی ئەگرێ بەهێزی ئەكا هەتا بۆی بكرێ
ئەشڵێ گەلی من بە (قَطْعُ النَّظَرْ) لە یاسای دینی خودا و پێغەمبەر
گەیوە بەو پلە و مەقام و پایە بێ ئەوەی بڵێن فەزڵی خودایە
بێ ئەوەی بڵێن كۆمەڵی بەشەر هەموو ئەولادی ئادەم نین مەگەر!
ئادەمیش لە گڵ نەهاتە وجوود! بە ئەمری خودای خالیقی وەدوود

ئەویش بەرلەوەی گیان کەن بە بەریا    پەردەی نەزانیی لابەن لە سەریا
گەلان لە کوێ بوون عەقڵ کامە بوو!    پەندی پێشینان لە کام نامە بوو
ئایا کەس هەبوو بەناوی تیرە    یا بە نەتەوە و هۆز و عەشیرە
ئایا ئەدیب و یاسا لە کوێ بوون    کۆن بوون ئەمانە یا هەموو نوێ بوون!
ئایا لە سارای عەدەمدا نەبوون    هەر لە یەك پلە و پایەدا نەبوون
تا کاتێ ئادەم گیان چوو بە بەریا    تاجی نوبووەت نرا بە سەریا
بە لوتفی خودای فەردی بێ هەمتا    لە پەراسووی ئەو حەووا بوو پەیدا
ئەنجا دەروازەی عەدەم لەولاوە    لەسەر کۆمەڵی بەشەر کراوە
کەوابوو لقی یەك دارن هەموو    چ نەسلی تازە و چ نەسلانی زوو
هەموو هەر رۆڵەی یەك دایك و بابن    بە خوشك و برای یەکتر حیسابن
ئادەمیش لەپاش (عَلَّمَ الأَسْمَا)    دەرکی کرد لەفز و حرووف و مەعنا
یەعنی لە بەحری عیلمی خوداوە    خرا نێو دڵی ئەو هەموو ناوە
واتە دانەری پیت و وشەی عام    بۆ فەهمی مەعنا و تەرکیبی کەلام
حەزرەتی زاتی پەروەردگارە    هەزار زمانی بەپێی ژمارە
یا سێسەد و سی لەگەڵ چوار زمان    بەگوێرەی خیلاف بۆ حەصری زمان
بە ئادەم فێرکرد خالیقی مەننان    بەس بە ئیرادە و ئەمری (کُنْ فَکَانْ)
واتە بە عیلمی (لَدُنِّي)و وەهبیی    نەك وەکو فەهمی علوومی کەسبیی
نە دەرس نە مەکتەب نەبوو لەو جێدا    قەڵەم یا دەفتەر کەی بوو لەوێدا!
ئوستادی ئەزەل فەردی تەوانا    لەسەر لاپەڕەی دڵی ئەو زانا
ئەبتی کرد هەرچی لوغەت لە عالەم    دا هەیە لەنێو ضەمیری ئادەم
بەڵام کام ضەمیر! وەك ئاوێنەی ساف    جەزبی هەمووی کرد بێ وەقفە و خیلاف
جا لەگەڵ ئەمەش بوو بە پێغەمبەر    رێبازی ژینی بە دین گرتەبەر

نەك هەر زانینی لە دین دوور نەخست     بەڵکە زانینی بۆ کرد بە پێرست
بۆ ئەوەی لە رووی زانین و ئەدەب     ئیطاعەی خودای خۆی کا بە ئەدەب
کەوابوو دین و ژیان و زانین     ئیرسییە بۆمان ئەگەر بزانین
چونکە زانایی و ئەدیبیی و یاسا     لەو بەجێ ماون هەر لە ئەساسا
هەروا پشت بەپشت بەرە بە بەرە     زانایی لەگەڵ دین گرتی پەرە
سەد و بیست و چوار هەزار پێغەمبەر     هاتوون بە تەرتیب بۆ گرۆی بەشەر
هەموو لە ئەسڵی دین و زانیندا     لەسەر رێی ئادەم رۆین لە ژیندا
کەوابوو هەرکەس دین و زانایی     لەیەك جیا کا بۆ رێی رەهایی
بێگومان ئیرسی خۆی لە دەس داوە     لە ئادەم نییە و ئادەمی ناوە
جا کەسێ بە خۆی بڵێ ئینسانم     ئادەمیزادم حەقیقەتزانم
ئادەمیزادیی کاتێ تەواوە     شێوەی ئادەمیی مابێ بەلاوە
مەگەر نازانێ هەر کوڕێ ئازا[٦٤]     لە رێبازەکەی باوکی ترازا
کردی بە کارێ باوکەکەی تۆرا     رەحمی باوکیەتیی لەگەڵیا گۆڕا
خۆ کە هیچ نەبێ بێ بەریی ئەکا     لەو میراتەوە کە لەو پێی ئەگا
بۆیە خوا فەرمووی بە نووح: کوڕەکەت     (لَيْسَ مِنْ أَهْلِكْ) خۆت مەکە شەکەت
چونکە ئەو لە تۆ لایدا لە دیندا     واوەیلا بۆ ئەو لەکاتی ژیندا
ئاکامی هەڵەی ئا ئەو نەفامە     غەرقی تۆفانە و مەشهووری عامە
بەڵام ئەوانەی لەگەڵ ئەو کەوتن     بە کەشتیی نەجات لە غەرق دەرکەوتن
بۆ دین و دنیا بوون بە بەختەوەر     بوون بە بنچینەی نەتەوەی بەشەر
کەوابوو برام سەرەڕۆ مەبن     با ئێوەش وەك ئەو رەنجەڕۆ نەبن
واتە بە زانین مەنازن بێ دین     ئێوە لە کەنعان[٦٥] موحتەرەمتر نین
ئەویش بە عەقڵی ناتەواوی خۆی     کە شاخی بەرزی دی بە چاوی خۆی

وتـی مـن ئـەڕۆم بـۆ لوتکـەی چیا    ئـیتر چـۆن لـەوێ ئـاو بـە مـن ئـەگا
کەچیی نـەیقامی کـە ئـەو تۆفانـە    بـە پێچـەوانەی عـەقڵی ئەوانـە
هەتا بـەو دەردە ڕۆیـی کـە پێـی چـوو    لەگـەڵ ملـهوڕان ئـەویش غـەرق بـوو
داخـە لـە دڵمـا ددم لـە ئـەدەب دان    بێ ئەوەی ئـەدەب بـە راس کـەن بـەیان
بـە شـتێك ئـەنازن بـەناوی ئـەدەب    (فَیَـا لَلْعَجَـبْ، مِـنْ أیْـنَ الأَدَبْ!)
وا نیشان ئـەدەن کـە جیـان لـە عالـەم    بەڵکو پێش‌کەوتوون لە حەووا و ئـادەم
لەگـەڵ ئەوەشـدا لـە ئـەدەب دوورن    سەد جار ئـەدیب بـن پـڕ لـە قسـوورن
چـونکە کـەم وایـە ئـەو ئەدیبانـە    کـە ئـەرکیان بـەرزیی یاسـای گەلانـە
بـڕۆن بـزانن ئـەدەب لـە کـوێ هـات    لە کام کۆمەڵ و لە کـام کـات و سـات
بۆ ئەوەی دەرچن گشـت لـە دوو دڵیـی    بـزانن ئـەدەب لـە کـوێ هـەڵقوڵی
کـەی ئـەدیب ئـەبێ حـاڵی ئاوابـێ    تـەزانێ ئـەدەب رووی لـە کـام لا بـێ
تەنانـەت ئەگـەر بخشـێنین چـاوێ    بـە نووسـراویان رەحمـەتی نـاوێ
بەر لـە هـەموو شـت رێ بـەوە ئەبـەن    کە بەعزێ ئەدیب هـەوڵی چـی ئـەدەن
هەوڵ ئەدەن یاسـا و زانسـت و ئـەدەب    لە دین جیا کـەن بـۆ کـورد و عـەرەب
هـەروا بـۆ بـاقیی نەتـەوە و تـیرە    تـا بڵـێن کاکـەم پیـاوێکی ژێـرە
خـۆی و نەتـەوەی بێبـاکن لـە دیـن    بە ژیریی خـۆیان بـەشدارن لـە ژیـن
جـا وەك وتم پێـت زۆر لـە هەڵـەدان    چ دین چ زانست هەر عـەطـای خـودان
یەعنی ئەو بەشەش بـە راسـت زانینـە    گومانـت نـەبێ هـەر سـەر بـە دینـە
چی بەشی چاکە و خولق و خووی جوانـە    لـە پیـاوانی دیـن گـەیوە بەمانـە
ئـەنا بەرهـەمی زانسـت بـەبێ دیـن    چ زوو چ ئـەمڕۆ مـەعلوومن کـە چـین
هی زوو بەشی زۆر مەعلوومن کە چین    مێـژوونووسی زۆر لە هی زوو دویـن[٦٦]
بـەڵام ئەوانـەی تـازە بابـەتن    بڕێکیـان تـەواو جێگـەی حەسـرەتن

بۆ نموونە با میسالێك بێنم
راستیی ئەم قسەت پێ بسەلمێنم
بۆ تەلەفزیۆن بڕوانە تەواو
بەرنامەی خاصی منالان بەناو
کە چۆن شعووریان ئەبەن بە تالان
بەناوی دەوردی یاریی منالان
بە شاخ و باڵ و کلك و گوێی درێژ
بە دەیان شێوە و شکلی گوێدرێژ
لەجیاتی ئەدەب فێرکردن بەوان
دەوری حەیوانیی ئەگێڕن بەوان
هەستی ئینسانیی وا لێ ئەدزن
سەرەڕۆتر بێ لە بەچکەی بزن
پێی ئەسەلمێنن کە ئاوا چاکە
تەبعەن منالیش بێگەرد و پاکە
زوو باوەڕ ئەکا بە مامۆستاکەی
بە چاولێکەریی لەگەڵ هاوتاکەی
بە خەیاڵ ئەڵێ فێری هونەر بووم
قەیناکا ئەگەر تاوێکیش کەر بووم
قەیناکا کلکم درێژ یا کول بێ
مادام مامۆستا ئەمەی بە دڵ بێ
چونکە ئەو لە من باشتر ئەزانێ
ئەبێ بە گوێی کەم هەرچیم بۆ دانێ
ئەو دڵسۆزە بۆم لە باوك زیاتر
دەی بۆ ئەمری ئەو چۆن نەبم حازر
تەنانەت ئەگەر لێشم دا بە تووڵ
ئەمری بەسەر چاو رەوایە و قبووڵ
هەروا شتی تر لە بەرنامەیان
لەم بارە زۆرە و ناکرێ بەیان
ئەو کە منالە و نافامێ بەمە
ئاخۆ مامۆستاش هەر عەقڵی کەمە !
قەیناکا بڵێین کە ئەم بۆ پارە
یا هەر نەفامە و خیانەتکارە
نازانێ نرخی ئینسانیی چەندە
بۆیە ئەو شێوەی لەلا پەسەندە
کە خۆی لە مەنطیق دەستی بڕاوە
وا ئەکا بەمان بە سەد خەتاوە
بە هەر ناوێ بێ بۆ ئەو بەهەرحاڵ
موهیم پارەیە حەرام یا حەلاڵ
بەلام چۆن ئەبێ باوکی ئەمانە
وا کەمتەرخەم بن لەگەڵ ئەمانە
گۆشەکەی جەرگی بسپێرێ بەوان
لەجیاتی ئینسان بیکەن بە حەیوان
سەرم سوڕماوە لەو رەحم و دڵە
وا دەرئەکەوێ هی ئەمیش کوڵە

زانست بەبێ دین هەر ئەبێ وابێ     قەت لەمە باشتر نەتیجەی نابێ
هیچ نەبێ ئێمەش شوکری خودا کەین     کە حەز لە شێوەی ئەمانە ناکەین
هەرکەس بە ڕێگەی ئەددەبدا ڕۆیی     دوور بوو لە بەزمی منیی و تۆتۆیی
دوور بوو لە هەڵەی فیکریی لە ژیندا     پاڵی دا بە لای قەڵاکەی دیندا
با عەوامیش بێ ئەو هەر زانایە     ئەتوانم بڵێم وەك مەلا وایە
بەڵام مێزەرە و جوببەکەی کەمە     قەیناکا دڵی لەگەڵ خوا جەمە
ئەمەش بەشێکە لەلای خوداوە     ئەدرێ بەو کەسەی بۆ ئەو شیاوە
بەڵام وا چاکە ئەوەش بزانین     لەسەر دوو بەشە علووم و زانین
بەشێك لەم دووە عیلمی وەهبییە     ئەو بەشەکەی تر ناوی کەسبییە
ئەم دابەشینەش موجمەل بزانە     ئەنا بە تەفصیل زۆرن ئەمانە
یەکەم هەر بەبێ دەرس و دیراسە     ئەخرێتە نێو دڵ لە خواوە ڕاسە
دووهەم بە کۆشش (لَیْسَ لِلإِنْسَانْ     إِلاَّ مَا سَعَی) بە نەصصی قورئان
جا خودا چونکە لوتفەکەی عامە     لە دنیا ئەمیان جێی سوودی عامە
هەموو بەشدارن لەم بەشەی دووهەم     بەپێی تێکۆشین سا چ زۆر چ کەم
بەڵام ئەو بەشەی یەکەم لە زانین     لوتفێکی خاصە بۆ خەواصی دین
بە هیچ کەسی تر نەدراوە نابێ     سەد کەڕەت کوڕی شێخ و مەلا بێ
بەس بە تەقوایە و بە پارێزگاریی     لەگەڵ ملکەچیی بۆ ئەمری باریی
لەگەڵ ئەم حاڵەش بە شەرت گیراوە     ئیستیعدادیشی ببێ ئەو پیاوە
ئەنا ئاسنی قەڵب نابێ بە دەبان     سەد کەڕەت بیبەی بۆ سینە و دەبان[٦٧]
کەوابوو ئەگەر بێ هەڵە و پەڵە     بە وردیی بڕۆین بۆ ئەم مەسئەلە
ڕوون ئەبێتەوە حەقیقەت چۆنە     واتە زانینیش وەکو دین کۆنە
کۆنە بەم مەعنا پێویستە بوونی     بۆ بەشەر، ئەگەر لێزان و ڕوونی

بەڵام کۆنەکەی (موزدەك)و (مانیی) دوورە لە یاسای بەرزی ئینسانیی
مەگەر نابینن ئەوانەی خۆیان دیعایەی زانین ئەکەن بۆ خۆیان
هەوڵ ئەدەن زانین بکەن بە مایە بۆ چەن رۆژ ژینی بێ پلە و پایە
بێ ئەوەی نرخێك دابنێن بۆ دین یا بە پێویستی بزانن بۆ ژین
چۆن لە رێبازی ژین ترازاون یا چۆن گێرۆدەی فیکرەی بڵاون
چۆن ژینیان تاڵ کرد لە ئادەمیزاد چۆن کورەی ئەرزیان پڕ کرد لە فەساد
چۆن دەرچوون هەموو لە یاسای ئەدەب چۆن لەدەسیان چوو سەرمایەی نەسەب
چۆن وا بە رووتیی بە تێکەڵ ئەژین بێ ئەوەی هەست کەن بزانن کە چین
یا بۆچی هاتوون بەو قیافەوە بۆ مویتەلا بوون بەو سەخافەوە
کە بێ شك ئاژەڵ لەگەڵ ئەمانە فەرقیان لێرەوە تا ئاسمانە
کاکە تۆ بیرێ لە ئاژەڵ کەوە جا هەر خۆت جوابی هەڵەی خۆت دەوە
واتە ئاژەڵ زۆر لەوان ژیرترن(٦٨) بۆ نەوعی خۆیان خاوەن بیرترن
تەنانەت نەوعی حەیوانی کێویی وەك شێر و پڵنگ یا گورگ و رێویی
لە بەینی خۆیان بەبێ ئاژاوە ئەژین بە شاخ و دەشت و چیاوە
کەم وایە بۆ یەك بیکەن بە کارێ بە گژ یەکا چن بە رێکەوت جارێ
ئەنجا لەوانیش حەیوانی ماڵیی ژیرترن، لە زۆر شت ئەبن حاڵیی
خاوەنی وەفا و هەست و تەمیزن لەلای خاوەنیان یەکجار عەزیزن
چونکە بەسوود و موطیعن بۆیان هەموو ئەناسن خاوەنی خۆیان
ئەرکی خاوەنیان ئەبەن بەڕێوە هەرچەن زەحمەتی زۆری وا پێوە
لە سواریی لە جووت چی مەیلی بێنێ گوێچکە شل ئەکا و سەر ناوەشێنێ
چونکە ئەزانێ لەلای خوداوە بۆ خزمەت بە خەڵك دروست کراوە
هەریەك بە رەنگێ سوود ئەگەیێنن سەر بۆ ئەمری حەق دائەنەوێنن

ئەنا بۆ کەسێ بەهۆش و ژیرە
بەپێی زاهیر بێ کەی عەقڵگیرە

حەیوانێ ئاوا بەهێز و تاقەت
بە قسەی مناڵێ بکا قەناعەت

ئەرکی وا گران بگرێتە ئەستۆی
تەنانەت چەقۆش بنێن لە ئەستۆی

بڕوانە گامێش بەو دوو شاخەوە
یا ئەسپ و گاجووت بەو دەماخەوە

ئەگەر تەسخیری خودایی نەبێ
چۆن وا بە ئاسان بێ بایی ئەبێ

چۆن سەری تەسلیم دائەخەن بۆمان
ئەگەر تێفکرین لەوان و خۆمان

ئێمە بە مێشێ بێتاقەت ئەبین
ئەوان لە سەد مێش ناپرسن کە چین

هەروا گژ و گیا لە دەشت و لە دەر
زۆری وای هەیە زیانە و زەرەر

ئەو بە ئاژەڵیی و بە بێ زمانیی
ئەزانێ کامی زیانە بۆ گیانی

دووری لێ ئەکا دەمی بۆ نابا
ئەگەرنا ئەبوو هیچی نەمابا

بەڵام ئەم بە خۆی ئەڵێ ئینسانم
فەرقی خراپە و چاکە ئەزانم

لەگەڵ ئەوەشدا چی زیانە بۆی
ئەیکا بە یاسا بۆ گەلان و خۆی

هەر وا ئەزانێ بەس خۆی حیسابە
نابێ کەس بڵێ وا نیە بابە

تۆ کە نازانی دنیا چ باسە
بۆ گوێش ناگری بۆ ئەوەی راسە

تۆ کە ئینسانی نابێ نەزانی
ئەگەر تۆ زانای، ئەدیبێ جوانی

صانیعێك هەیە لەبۆ مەوجوودات
هەمووی شاهیدیی لەسەر ئەو ئەدات

گشتی بە زمانی حاڵ و تەبیعەت
نەفی ئەکەن فیکرەی هێزی تەبیعەت

تەبیعەت چ خۆی هێزی زەویی بێ
یا نوختەی مەرکەز لەنێو زەویی بێ

یا هی کوراتی جەویی بێ لەلات
یا دەوری رۆژ و ساڵ و مانگ و کات

یا تەصادوفی عەمیا و کوێرانە
ئەگەر وابزانی، دڵت وێرانە

ئەگەر تێبگەن لە حاڵی ئەمان
باوەڕ بە صانیع ئەکەن بێگومان

بە زمانی طەبع ئەڵێن تەسلیمین
ئێمەش مەصنووعی خودای قەدیمین

ئەزانین صانیع لەبۆ ماسیوا هەیە و حەتمییە و بە ناوی خوا
ئیتر سەقافەی دەهریی و فەلسەفیی حوبابی ئاوە یا بلّقی کەفی
بێهێزە وێنەی تالّی عەنکەبووت بۆ دڵ و دەروون قەت نابێ بە قووت
نازانن ئەگەر بە رێکەوت وابێ لە سەد یەك قسەی سوودی تیا بێ
ئەویش پاشماوەی بەرزی ئەدیانە هەر لە ئەهلی دین گەیوە بەمانە
دەم بەددەم یاخۆ دەس بە دەس لەوان هات و مایەوە کەوتە دەس ئەمان
ئەنا بێگومان نەفسی بەشەریی ئەگەر داماڵی هەوسار لە سەری
بۆ باری کیبر و خۆ بە زل زانین حەز ئەکا ئێمە بە خوای بزانین
ئەگەر مەجالی پێ بدرێ لە کەون ئەڕوا بەرەوژوور بۆ کوفری فیرعەون
بەڵکو ئا بەمەش ناوەستێتەوە مەگەر هەر بە دین ببەسرێتەوە
ئەنا وەك فیرعەون وتی بە هامان بۆ بینای قەسرێ بێ سەر و سامان
حەز ئەکا بڕوا سەیری سەما کا تا خودای مووسا و عالەم پەیا کا
تا ئەگەر دەسی بڕوا بە سەریا ئەحمەقی نەفام بدا بە سەریا
بەس خۆی بێنێ پەلیدی ناپاك هەرچێکیش بیکا هەر پێی بڵێن چاك
بەڵام سەد هەزار حەمد لەگەڵ سەنا بۆ بەرزیی روتبەی خودایی خودا
نەك دەستی کەسی ئەبەد پێ ناگا دەستی خەیاڵیش هەرگیز بەو ناگا
ئاوایە حاڵی نەفسی ئەممارە جادووی حیلەباز کۆنە مەککارە
خۆپەرست، بێ شەرم، لە خۆ رازیبوو دەنیی تەبیعەت، بەهەڵەداچوو
ئەگەر پرشنگی لوتفی خودایی نەچێ بەلایا بۆ رێی رەهایی
ناگرێ رێگەی راسی رزگاریی سەر نەویی ناکا بۆ ئەمری باریی
قەت بەلای سوود و چاکەدا ناچێ تۆ ریسوا ئەکا بۆ سووکە ماچێ
هەروا قیاسی بگرە بێگومان بۆت مەعلووم ئەبێ حاڵەتی ئەمان

سا وەرن دەخیل ئودەبای بەڕێز     یاسای گەل مەکەن بە پووشی پەرێز
ئەدەب بەشێکە لە ئیمان و دین     حەیفە بۆ ئەدیب فیکرەی دوور لە دین
جوزئیی لە کوللیی جودا ناکرێ(٦٩)     خەرقی قاعیدە بە کەس ناکرێ
مادام بۆ خزمەت بە گەل هەوڵ ئەدەن     تانە لە ئەسڵ و فەرعی دین مەدەن
چونکە نەك سوودی قەت نابێ بۆتان     زیانیش ئەدەن لە گەل، لە خۆتان
بە عەقڵی سەلیم وەزنی یاسا کەن     چی بە عەقڵ و دین چاکە ئاوا کەن
هەرچی خیلافی ئەم دوو هێزە بێ     ئەبێ هەر هەوای نەفسی دێزە بێ
چونکە عونصوری ئەو ناتەواوە     هەر بە حەقیقەت وەها خولقاوە
مەیل و ئارەزووی خراپەکاریی     لەگەڵ تەبعی ئەو تێکەڵە و ساریی
بۆ ئەوەی بەشەر بە هۆی ریازەت     بەربەرەکانیی بکا بە تاعەت
چی ئەو وتی پێت بە پێچەوانەی     ئەو بجوولێوە پیاوێ پیاوانەی
بەڵام بە شێوەی شەرعی ئیسلامیی     ئەنجا بە واقیع ئەدیبێ نامیی
بەس لغاوی دین رامی ئەکا بۆت     بۆیە هەر بە دین تۆ ئەبی بە خۆت
واتە هەر بە دین ئەبی بە ئینسان     بە مەعنای واقیع بێ شك و گومان
نەك هەر ئەمە و بەس بۆ خۆت بی بە پیاو     سوودت بۆ گەلیش ئەبێ بە لافاو
نەك تەنیا بۆ دین یا دنیای دەنیی     بۆ هەردوو عالەم پێت ئەبێ خەنیی
وا ئەبی نابی بە دڵسۆزی راس     ئەگەر گشت ئەعزات کەی بە چەکوش و داس
تا لە یاسای دین تێ نەگەیشتووی     لە زانکۆی ئەدەب پێ نەگەیشتووی
چونکە بەرهەمی یاسات بۆچی یە     بۆ ریکوپێکیی و ئەمنی گشتی یە
ئەگەر مەنهەجی پیرۆزی ئیسلام     بە راسیی و پاکیی لەنێو خاص و عام
بچێ بەرێوە بێ زیاد و کەمی     بڕۆ بۆی بخەوە بە خاترجەمیی
نە ترسی ناموس نە گیان و نە ماڵ     نە وەزعی خراپ نە شێواویی حاڵ

نابینی لە کەس بۆ تاکە جارێ     سیلمی عالەمیی پێکدێ بە جارێ
نەك هەر پێویستتت بە چی‌تر نابێ     بەڵکو بەبێ دین بە چی‌تر نابێ[٧٠]
واتە هەر دینە بۆ چارەسەری     موشکیلەی عالەم، هەڵەی سەرسەریی
دەرمانی دەردە و هۆی وەفا و سەفا     لا ئەبا پەردەی تاریکیی جەفا
بیساطی عەدڵ و داد بڵاو ئەکا     نیزامی گشتییت بۆ تەواو ئەکا
بە هەر قانوونێ دەس بەی بۆ ئەمە     بە کێشانەی عەقڵ وەزنەکەی کەمە
رێك و سەربەسەر دەرناچێ لەبۆت     ئەگەر هەزار ساڵ تەکان دەی لە خۆت
نەك تەنیا بە تۆی بێ‌هێز و توانا     بە هەرچی هێزە لە رووی جیهانا
ئەگەر تێکۆشن رێگە پەیدا کەن     چاری ناکۆکیی و ئاژاوە ناکەن
هەروەك ئەبینین بە چاو و بە گوێ     لە هەر قوژبنێك ئاهوناڵە دێ
لەبەر نوقسانیی فیکرەی بەشەریی     چونکە لە راسیی بێبەشن، بەریی
بۆیە ناگونجێ بۆ تەنیا شەوێ     بەبێ دین بێ خەم دڵیان بسرەوێ
بەڵام دین ئەگەر سایە گوستەر بێ     دەوری زەمانەی دەورەی عومەر بێ
دەنگی (يَا سَارِي) لە کۆی نەهاوەند     بزرێ لە عالەم نەك هەر نەهاوەند
ئەوسا ئەزانن یاسای دین چی‌یە     ئەبینن سوڵحە و سەفای گشتی‌یە
پڕ ئەبێ لە داد لە گشت لا زەویی     خەڵك پەرێز ئەکا لە ئاوی شەوی
ئەمن و ئەمانەت دەنگ ئەداتەوە     گورگ لەگەڵ مەڕ شەو ئەکاتەوە
هەروەکو مێژووی ئایین شناسان     باس ئەکا بۆمان شوانی خۆراسان
ئەڵێ لە دەورەی عومەری عەزیز     رووداوێ عەجیب لای ئەهلی تەمیز
روویدا لە دەوری ناوچەی ئەو شارە     بوو بە هۆی دەنگوباسی ئەو شارە
ئەویش ئەمە بوو شەوێ لە شەوان     گورگێ دای لە ران مەڕێکی رفان
لە عەینی کاتا شوانی خاوەن فام     وتی نەماوە خەلیفەی ئیسلام

بەڵگە بۆ ئەمە چەند ساڵە شوانم — نەمدیوە کە گورگ دەمکاتە رانم

بۆیە ئەزانم ئەو پایەبەرزە — بە کۆچی دوایی لەسەر ئەم ئەرزە

بارگە و بارەگای عەدڵی پێچاوە — عەدڵ و دادی راس ئێستە نەماوە

لەپاش ماودیەك مەعلووم بوو وابوو — عومەر لە دنیای فانیی نەمابوو

ئاوایە بەهرەی دینی خودامان — نەك قسەی دەمیی و هەڵەی نەفامان

**جا لێرەدا بە پێویستی ئەزانم ئەو ئەدیب و مامۆستا و قوتابییانەی کە خاوەنی هەست و خووی بەرز و پەسەندن لەگەڵ ئەوانەی کە دوورن لە ئەخلاق و رەوشتی جوان جیایان بکەمەوە بۆئەوەی گومانی خراپ نەبەن**

ئەنجا ئەترسم زانا و رۆشنبیر — خاوەنی هەست و خووی پەسەند و ژیر

هەروا مامۆسای جامیعە و مەکتەب — کاربەدەستانی پاك و موئەددەب

یاخۆ دەبیر و شاعیر و ئەدیب — هەروا قوتابیی بەشەرم و نەجیب

لەگەڵ ئەوانەی وان لە زانکۆکان — لە داخی دڵم وا بەرن گومان

خەیاڵ بفەرموون نە زۆر و نە کەم — من فەرقی ئەمان لەوانە نەکەم

جامیعە و مەکتەب خراپ بزانم — لە هەرچی لەوێن خانە گومانم

یا بڵێم هەرچی مەلایە چاکە — بەڵام مەکتەبیی هەمووی ناپاکە

یا بڵێم دەبیر گشتی بێ بیرن — بەدەستی هەوا و ئارەزوو گیرن

حاشا سەد کەڕەت حاشا لەو بیرە — گومان وا بەرم بەو هەموو ژیرە

بەو هەموو دەریای عیلم و زانایی — بەو هەموو بەهرە و فەزڵی خوایی

سینە و دەروونیان بەبێ زەرافەت — توختەی داشیرەی سەمای سەقافەت

(کَاشِفُ الرُّمُوزْ) لە صونعی باریی — لە دەریای موحیط تا کورەی ناریی

کەنزی حەقائیق بۆ مادده و مەعنا — لە ژێر سەڕاوە[٧١] تا بە ژوور سەما
هەریەك بە دەوری خۆی لەمانەدا — تیری لە خاڵی نێو نیشانە دا
دوڕڕی نەدیدەی ناسوفتەی کون کرد — بە لوتفی باریی پەی بە مەبەست برد
هەروا دەس بە دەس ئەم بەڕێزانە — لە داری بەریان میوە ڕێزانە
کەس نەما نەبا سوود لە بەرهەمیان — دڵ پاراو نەکا لە ئاوی دەمیان
تەصەوور نەکەن دەخیلە گیانە — تەرکی ئەدەب کەم لەگەڵ ئەمانە
ئەمانە ڕێزیان لەسەر چاومە — ناویشیان لە ژوور سەر و ناومە
ئەمانە قووتی رووحی گەلانن — ئازیزن هەموو ئارامی گیانن
ئەمانە نووری چاوی ولاتن — ئەمانە رۆڵەی زانکۆی خەباتن
ئەمانە هیوای چینی داهاتوون — ئەمانە بە گژ نەزانییا چوون
بە (هَلْ یَسْتَوِي الَّذِینَ) باریی — ڕێزی بۆ پلەی ئەمان کرد دیاریی
ئەمانە هێزی دڵ و دەروونن — چرای رووناکیین کە خۆیان روونن
ئەمانە یاسای گەل ئەپارێزن — شێری مەیدانن گشتیان بەڕێزن
سەرمەشقی گەلان ئەمانەن بە راس — ئەمانە دوورن لە بڕێ قسە و باس
بەمانە دایم لاپەڕەی مێژوو — رەنگینە ئێستە یا لە رابردوو
ئەمانە گوڵی چیای سەربەرزین — کێشکچیی گەل و سنووری مەرزین
کێ بێ بەمانە نەڵێ پیاوچاکن! — خاوەنی هەست و دەروونی پاکن
کێ بێ شانازیی نەکا بەمانە — ئەمانە جێیان لەنێو دڵانە
ئەمانە ئەرکی گەل و نیشتمان — بە هەرچی هێزە ئەگرنە سەر شان
نیشتمان بەمان ئەگەشێتەوە — ئەگەر هێندەی تر بچەوسێتەوە
ئەمانەن هێزی بەربەرەکانیی — لەگەڵ دوژمن و جەهل و نەزانیی
هەنگاو بە هەنگاو قۆناخ بە قۆناخ — دەشت و چیامان بۆ ئەکەن بە باخ

داخ لەسەر دڵان لا ئەبەن تەواو  چاو لە وتاریان پڕ ئەبێ لە ئاو[٧٢]
شادیی ئەبارێ لە خامەی ئەمان  ئەگەر تێفکرن لە نامەی ئەمان
نیزامی گشتیی لەسەدا هەشتا  پێویست بەمانە و هەر کەمە هێشتا
ئەبێ تێکۆشن بۆ لەسەدا سەد  لافاوی جەهل و نەزانیی کەن سەد
چونکە دوژمنان بەس لەم ڕێگەوە  مەجالیان ئەبێ لەنێو ئێوەوە
هۆرە بتاشن بۆ گەل قەڵشاندن  بۆ تۆوی نیفاق لێرە وەشاندن
تا بە فێڵ لەنێو حەساری سنوور  بیکەن بە کارێ لە نزیك و دوور
بەرهەمی ڕەنجی سەدان ساڵەمان  لە تووکی سەرمان تا بەن کاڵەمان
لەسەر چیاکان تا ژێر زەویی و ئاو  بە تالان بەرن، بۆ ئێمەش چڵکاو
ئێمە چاو لە دەس دەستی دژیی بین  هەروا خەریکی براکوژیی بین
بێ زانا و ئەدیب وڵات وێرانە  ئەبێ بە مۆڵگەی دژ و بێگانە
بەڵام کام زانا! عالم بە عەمەل  نەك باری عیلم و پشتی کەری شەل
چونکە زانای وا زیان گەیێنە  بۆ خۆی و بۆ گەل قیمەت شکێنە
نەبوونی سەد قات باشە لە بوونی  هەروەك نەزانیی و شێتیی و جنوونیی
چونکە بێ عەمەل با ئەرەستوو بێ  ئەبێ هەر نێوی پیسی لەدوو بێ
کەوابوو زانین ئەو کاتە چاکە  بەرهەمی دایم کردەوەی چاکە
ئەمانە حەیفن بۆ مەکتەب و دین  هەروا ڕێدانیان لەنێو زانکۆی ژین
جامیعە و مەکتەب مەخزەنی ڕازن  جێگەی بولبول و هەڵمەتی بازن
مەداری دەوری پەروانەی عەشقن  سەفاگای هەوای ئیدراك و شەوقن
ئەم لە دەوری شەم بسووڕێتەوە  تا ئەگا بە شەم بسووتێتەوە
بولبول بە هەزار داستانەکەی  بخوێنێ لەبەر ئاستانەکەی
باز بە هەڵمەت و زۆری پەنجەوە  چنگ خاتە قاسەی زێڕ و گەنجەوە

ئەو کێشك لە گوڵ، ئەم لە خەزێنە — هەرچی بەسوودە و خەفەت ڕەوێنە
ئەو بۆ شەوقی دڵ بخوێنێ بە ناز — ئەم بە بیری تیژ بێنێتە دەر غاز
هەر نەبێ ئەبێ بە وێنەی تووتیی — دەرسی مامۆستا ببێ بە قووتی
تا کەم کەم ئەگا بەو بولبولانە — بەو جێگای هیوای کۆڕی گەلانە
هەریەك بە ڕەنگێ خەریك بن بە چاو — بە دەم بە قەڵەم بە دەس بە هەناو
ڕێ نەدەن بە دژ بۆگەنی دەمی — دووکەڵی قیری دڵی پڕ تەمی
میکرۆبی فیکر و بیری پەرکەمی — تێکەڵ کا لەگەڵ سوود و بەرهەمی
چونکە ئەزانن ئەم دوو مەنبەعە — بۆ ڕۆژی خەبات ئاسۆ و مەطلەعە
وەسفیان بە قەڵەم نایەتە تەحریر — هەروەك بە زمان ناکرێ تەقریر
وا گومان نەبەن مەلا نەزانن — هەر مەلا قەدری ئەمان ئەزانن
مەلا پاك و پیس جیا ئەکاتەوە — سوود و زیانیان لێك ئەداتەوە
ئەیخاتە بەرچاو ئەوەی بەکەڵکە — یا ئەو شتانەی بە زیانی خەڵکە
بۆ ئەوەی گەلان خۆ بپارێزن — لەوانەی نزم و پەست و بێ ڕێزن
بەڵگەی (عُرْوَةُ الْوُثْقَی)ی مەلایان — ئەگەڕێتەوە بۆ ئەنبیایان
چونکە زانایی لە ئەسڵا کە هات — بۆ گرۆی بەشەر کرا بە خەڵات
لە ئادەم گەیشت بە حەزرەتی شیس — لە شیس وەریگرت حەزرەتی ئیدریس
بەڵام تەدریسی علووم و فنوون — یا شێوەی نووسین بە زمانێ کە بوون
لە خواوە ئیلهام کرا بەو زاتە — هەر بۆیە زانین ڕێگەی نەجاتە
هەروا دەس بە دەس لە ئەنبیاوە — گەیشت بە دەستی مەلای زاناوە
حەدیس ئەفەرموێ زانایانی دین — میراتگرانی ئێمەن بە یەقین
لەمان پەرەی سەند گەیشت بەم جیلە — ئێستاش بێ ئەمان فکریان عەلیلە
بە چەن قەرنی تر ناگەیێن بەوان — ئەمان مێروولەن، وەك خەرمان ئەوان

هەر ڕۆژە دەنکێک کێشەوە ئەکەن          بەم دەنکە دەنکە کەی بەوان ئەگەن

مەلا بە وێنەی نوور و قەبەس بوون          عەوام لە جێگەی مێش و مەگەس بوون

لە شەهد و شیری ئەمانە نیشتن          بە هۆی ئەمان بوو کە پێگەیشتن

بە بیری مەلا عەیبە نەزانیی          هەروەك بێ دینیی زۆرە زیانی

حەیفە لە شوێنێ ئاو بخۆیتەوە          بەردی تێخەیت و بۆی نەڕۆیتەوە

جامیعە و مەکتەب بۆ ئاوەدانیی          پێویستە بوونیان وەك ئاوی کانیی

هەروەك دێ بە دێم دروست ناکرێ          بەبێ ئەمانیش سەمەر ناگرێ

سەرچاوەی کانیی تا روون و پاکە          هۆی بووژانەوەی ئینسان و خاکە

بەڵام کە ئەحمەق لەبەر پیسیی خۆی          پیسی کرد تەواو تام و ڕەنگ و بۆی

ئەو کاتە هەمووی ئەبێ بە میکرۆب          ئەگەر سەیری کەن لە رووی میکرۆسکۆب

ئەبێ ئەو پیسیەی دوور خرێتەوە          تا وەك ئەوەڵ جار روون ئەبێتەوە

حەیفە ئەوانەی خاوەنی کانیین          ڕێ دەن بەوانەی ئەزانن چا نین

حەیفە مەنبەعێ ئاوا بەسوود بێ          جێگەی هەتیوی لات و حەسوود بێ

حەیفە کەرگەدەن بۆ باخ و چەمەن          ئاخر کێ دیویە زاغ و نەستەرەن!

قالۆنچە و دەرکی ڕەمزی حەقایق!          دیمەنی ورچ و لالە و شەقایق

داڵەکەرخۆرە و گوڵزاری گوڵان          ئاخر عەنتەر و جێ هیوای دڵان!

خەزێنەداریی و دزی بێ شەرەف          هەستی مەسئوولیی و ڕۆڵەی نا خەلەف

ئەمانە وەك مێش طالیبی پیسین          تابیعی هەوای نەفسی ئیبلیسین

گێڕەشێوێنی بیساطی خۆشین          سەریان بە کووپەی خومخانە کەن شین

با کۆمەڵ لێیان بتەوسێنەوە          بە بای ڕیسوایی بچەوسێنەوە

نە لەگەڵ دینن نە لەگەڵ دنیان          نە پیاون نە ژن موشکیل و خونسان[٧٣]

وەك مالاریا میکرۆبی جاریین          گەل نەخۆش ئەخەن نەخۆشیی سارین

زامی کۆن و نوێ تەشەنا ئەکەن | ئەگەر بمێنن گەل فەنا ئەکەن
ڕێدان بە بەزمی ئەم بێ نەزمانە | دەردێکە دوایی چاری گرانە
چونکە کوڕی خەڵك لە خەڵك ئەشۆرن | بە وێنەی خۆیان خوویان ئەگۆڕن
وایان لێ ئەکەن عەیبی ئەزانن | لای کەسێ بڵێی کوڕی فلانن
جا کەسێ شەرمی بێ بە باوکی خۆی | ئەی ئەبێ چۆن بێ لەگەڵ دایکی خۆی
بێگومان زیاتر بەم لاڕێ ئەبێ | ئەویش کە ماڵی لە لادێ ببێ
ئەم شێوە شێوەی بێ دایك و بابە | یا هی سەرخۆش و مەستی شەرابە
ئاخۆ ئەمانە بچنە هەر شوێنێ | ئیتر ئەو شوێنە قەدری ئەمێنێ!
ڕەجایە هەرگیز نەکەن بە کارێ | قەدری جامیعە بێتەوە خوارێ
ئێوە هەر خۆتان مەسئوولی ئەوەن | با نەبێ بە جێی دڕندە و دەوەن
چون لە جامیعە و مەکتەبی جاران | حەیا ئەباری وەك پەڵەی باران
لە ساماڵی ساف زانست دەرئەکەوت | نەك لە هەوری ڕەش یا دووکەڵی نەوت
شەرم و شەرەف بوو بان و فەرشەکەی | قەڵای ئەدەب بوو دەرك و حەوشەکەی
مەلاش گومانی ئەمەی لێ بردن | بۆیە مناڵی بۆ نایە خوێندن
بۆیە گۆشەکەی جەرگی لەڕێوە | بە کیژ و بە کوڕ دای بە دەس ئێوە
بۆ خزمەت بە گەل وەك مناڵی خەڵك | بەڵکە ڕۆژێ بێ لێی وەرگرن کەڵك
بەڵام بەو جۆرە کە عەرزم کردن | نەك لە قانوونی ئەدەب دەرکردن
تا نەڵێن مەلا دەماخی وشکە | مەکتەبی لەلا مار و دووپشکە
تا نەڵێن مەلا سڵ لە چاك ئەکا | خۆی لە ڕیزی گەل دوور و تاك ئەکا
ئەویش لە قەڕنی سەدەی بیستەمدا | کە وا نەزانیی چوو بە عەدەمدا
سەنعەت و پیشە دەرچوون لە زەویی | گەلان چوونە سەر کوراتی جەویی
کەچیی بەبۆنەی ڕەفیقیی ئەمان | مناڵی لێ بوو بە باری خەمان

خێری لێ نەدی مامۆسای فەقیر　　رۆڵەکەی لێ بوو بە تەوق و زنجیر
چوونی هەر وەی و نەچوونی هەر وەی　　کە نەشچێ ئەڵێن مامۆسا نەیکەی
با موستەقبەلی ئەویش نەفەوتێ　　منەت نەکێشێ بە دەس دەم چەوتێ
با بە حورِ بژی تا لەم سەردەمە　　با ئەویش بلێ منیش خۆم هەمە
ئەنجا مامۆسا لەبەر ئەم حاڵە　　ئەبێتە جێگەی لۆمەی بەتاڵە
گیر ئەخوا بە دەس مناڵ و گەورە　　نەیزانی مەکتەب ئەگا بەم دەورە
نەیزانی شەیتان ئەو لە خەو ئەکا　　مەشهوورە ئەڵێن مەلاش سەهو ئەکا
ئێستاش بە هەرکەس ئەڵێی وا مەکەن　　ئەڵێن ئەی بۆچی مەلا وا ئەکەن!
ئەوانەی خاوەن مناڵی نێرن　　قەیناکا، ئەی کچ بۆچی ئەنێرن
حەق وایە ئەمان تا پەتی ئیعدام　　کچیان نەنێرن بۆ جێگەی حەرام
تا ئەمان نەبن بۆ چاولێکەریی　　بە سەرمەشقی خەڵك لە بێ خەبەریی
لابردنی زەرەر پێشکەوتووە لەسەر　　راکێشانی سوود بە حوکمی خەبەر
بەڵام دەفعی چاك بۆ جەلبی خەراب　　دوورە لە یاسای کەلام و کیتاب
گومانم وایە ئەگەر نەترسین　　ئەبێ جوابەکەی لەمان[٧٤] بپرسین
بەڵام بێگومان بێ جواب ئەمێنن　　چونکە کەلامی خودا ئەخوێنن
ئەویش مەنع ئەکا لە تێکەڵاویی　　بەم شێوە ئاوا بە بەربڵاویی
لە چەن جێگەدا ئایەتی حیجاب　　هاتۆتە خوارێ وا ئەکا ئیجاب
ئەبێ موسڵمان هەموو تێکۆشن　　خۆیان لەیەکتر تەواو داپۆشن
هەروا تێکەڵیی و خەڵوەت و سەفەر　　بە شێوەی گشتیی مەنع ئەکا، مەگەر
لەگەڵ مەحرەمی شەرعیی بە نەسەب　　یا بە شیر خواردن ئەویش بە ئەدەب
یا موصاهەرە وەك بووك و خەسوو　　یا بە نیکاحی بەینی ژن و شوو
ئەمانە هەموو مەحرەمن بۆ یەك　　قەیناکا ئەگەر روو دەرخەن لەیەك

هەروا بڕێ تر بە عورف و عادە          وەك چوونی نەخۆش بۆ لای عەیادە
یا موعامەلە و وەرگرتنی دین          بەوپەڕی حەیا بە شەرم و تەمکین
ئەمانەش ئەگەر بەبێ خیانەت          خزمەت کەن بە خەڵك لەگەڵ ئەمانەت
ئەگەر لەوانەن لە توهمەت دوورن          لەبەر زەرووڕەت بە شەرع مەعزوورن
بەڵام تێکەڵیی ئا لەم زەمانە          کە ئەمڕۆ یاسای هەموو گەلانە
ئایە هەموویان مەحرەمن بە راس          یاخۆ حەرامن بێگانە و نەناس
ئاخۆ هەموویان لە شوبهە دوورن          بە شەرع و ویژدان هەموو مەعزوورن!
ئەبێ بپرسین لە خۆیان چۆنن          هەموو سەد ساڵە و نەخۆش و کۆنن!
یا پێچەوانەی هەمووی ئەمانە          ئەم جۆرە حاڵە کەی جێی گومانە
مەشهوورە ئەڵێن بە قسەی مەلا کەن          بۆ خەڵك خێرخوای ئوموری چاکەن
کە هات و لەگەڵ کردەوەکەی ئەو[٧٥]          رێك نەبوو برۆ خۆتی لێ بکە خەو
قەڵەم دەخیلە! نەکەی، سەر نەکەی          سەر لە سنووری ئەدەب دەرنەکەی
چونکە فەرموودەی (خَیْرُ الْوَرَی)یە          حاڵەتی مەلا لە کۆمەڵ جیایە
ئەوانەی خاوەن کردەوەی پاکن          بەکەڵکن بۆ خەڵك بۆ خۆشیان چاکن
بێ کردەوەکەش وەکو هێڵەگ وان          سۆسەکەی بۆ خۆی[٧٦] پاکەکەی بۆ نان
کەوابوو سوودی بۆ گەل تەواوە          بەس بۆ خۆی کەمێ کەوتۆتە دواوە
جا لەبەر ئەمە هەر خاوەن رێزن          لە تەرکی ئەدەب خۆ بپارێزن
رێز و حورمەتیان لەسەر گشت کەسە          حەدیسی حەزرەت بۆ ئەمان بەسە
هەمووی ئەمانە داخ بە دڵ ئەدەن          تامی عەزابی نێو تۆی گڵ ئەدەن
ئێشی نەسرەوتووم لێ دووپات ئەکەن          ژینم حەواڵەی سات و کات ئەکەن
زامێ تر لەسەر زامە کۆنەکەم          ئەنێنە سەر دڵ، ناڵە بۆ نەکەم!
شادیی چی ئەکەن! تەقە و رەقەی چی          هەڵپەڕین بۆچی، چەپڵە و چەقەی چی!

بۆ کام مەنزڵگای مەبەست ڕێپێوان     بۆ کام بەرهەمی خەباتی کێوان
لە پەنای سەدان خەفەت و مەینەت     لەنێو هەزاران ئاژاوە و زەحمەت
خۆزگە ئەمزانی بە چی دڵخۆشن     دیارە نازانن کە چەن نەخۆشن
کەسێ هەستی بێ گەل وا لە چیدا     چۆن ئەبێ بێ هیچ لەپ لە لەپی دا
چۆن ئەبێ ئاوا کۆڵان بە کۆڵان     بکەونە شوێنی دەهۆڵ بەکۆڵان
بۆ[٧٧] دڵ بە دەنگی زوڕنا خۆش ئەبێ!     یا بەوەی دڵی گەل نەخۆش ئەبێ
زامی زامداران نەمێنێ شوێنی     بۆگەنی دوژمن نەمێنێ بێنی
بێتە بەر داری ڕەمزی ئازادیی     بە سروەی بەیان بەهاری شادیی
ڕزگار بێ خاکی نیشتمانەکەی     گەشەی بێ دەر و دەشتە جوانەکەی
بەڵام داخەکەم منداڵ بازاڕیی     ڕەمزی خەباتە لە کوردەواریی
ئەویش هوتافی دژ بە دین کێشان     خوێ نەکەن بەسەر زامی دڵ ڕێشان
ئاوایە حاڵی گەلی هەژارم     هەر بۆیە ئەمساڵ خۆزگە بە پارم
گەلێ ئاوابێ وەزعی ناوەخۆی     ئەبێ گەلخوازان بە کوڵ بگرین بۆی
ئاخۆ گەلی کورد لەبەرچی وایە     هەر ڕۆژە دژێك پێی ئەکا کایە
ئێستە کە دەورەی سەدەی بیستەمە     پێشێلیی نەبێ هەموو شتی کەمە
خۆ مێژووی لەنێو مێژووی گەلاندا     باز و شاهێن بوو لەنێو مەلاندا
چ نکبەتێك بوو سەری دا لێمان     سابوون و بەزیان دا لە ژێر پێمان
خزاین هەڵگلاین بەسەر دار و بەرد     بەدەس خەمخۆری فێڵەسووی نامەرد
وامان ئەزانی ئەم بەز و کەفە     بەسمانە، لە جێی هەرچی مەسرەفە
کەچیی زووبەزوو بەسەر سەرا چووین     تا لە زەلکاوی ئەوان نوقم بووین
ئێمە تێدا چووین ئەوان جێگیر بوون     خۆیان بە ئاغا و میر و گزیر بوون
ئێمەش وەك خەزنەی قارۆونی هەژار     بەو گەنکاوەدا هەر ئەچینە خوار

رۆژ بە رۆژ زیاتر سەرنگوون ئەبین    پەژارەدار و پەست و دوون[٧٨] ئەبین
زووخاوی دەروون ئەخۆین رۆژ و شەو    کاکی نەخۆشیش هەڵناسێ لە خەو
خۆ ئەوسا نەخۆش هەر خەوی نەبوو    مەیلی ئارەق و گۆشت کەوی نەبوو
مەزەی شەرابی بەلاوە تاڵ بوو    ئاواتی تەنیا هەر سووکیی حاڵ بوو
قوربانیی ئەدا بۆ رزگاربوونی    لە چنگ ئازار و کزیی و زەبوونیی
هۆشی هەر لەلای ئەم خەیاڵە بوو    ئاخۆ بۆ تووشی ئا ئەم حاڵە بوو
دێیەودێ ئەینارد بەشوێن لێزانێك    بەشکەم چاری کا بە هۆی دەرمانێك
یا سوورەی رەعدیان ئەخوێند بەسەریا    بۆ ئەوەی زوو گیان دەرچێ لە بەریا
تا نەبێتە بار بەسەر ماڵەوە    بڕواتە جێگەی ژین بەتاڵەوە
سا لەوێ هەرچی لێ ئەکەن ئەکەن    یا لە خۆشییدا یا سزای ئەدەن
بەڵام نەخۆشییەك لەنێو کوردایە    زگماکە چاری بە هیچ کەس نایە
نە وایە بمرێ نە چاك بێتەوە    نە خۆی نە دوژمن ناحەسێتەوە
بارێك و بنێسی و بناوبوێریەتی    دەردی چاوئێشەی پیاوی کوێریەتی
نە چاو ئەبینێ نە ئێش ئەسرەوێ    نە دێڵێ کەسیش خەوی لێ بکەوێ
پێشینان ئەڵێن کوێر هەتا ماوە    دایم بەتەمای بینینی چاوە
خۆ ناشیبینێ هەرگیز ئەو رۆژە    بە چاو خەریك بێ بە کەند و کۆژە
بەشی هەر سواڵە و دەرگا گەڕانە    شانی چاوساغ و گۆچان کوتانە
ئەگەر وا نەبان چۆن ئەبوو وابن    هەر چاولەدەست و رووت و گەدا بن
هەر ژێرچەپۆکی ژێرچەپۆکە بن    بۆ ناوخۆ پۆلا و بۆ دژ لۆکە بن
ئەنا بێگومان پیاوی هەڵکەوتوو    بێ وێنەی مێژوو لە کڵ وا دەرچوو
قاڵکراو لەنێو بۆتەی ژیریدا    بێ ئەوەی لاکا بەلای میریدا
لە کوردیش زۆرە لە هەموو بارێك    لە زوربەی لادێ و لە هەموو شارێك

بەڵام نەخۆشیی خۆخۆریی و مەستیی
خۆ بە زل زانین، دوژمن پەرستیی

بۆ خزمەت بە دژ بە چەك رازاوە
بۆ گەلیش تەنیا شەڕ و ئاژاوە

هەریەك بە دەستی دژێوە دیلە
بۆیە گەلی کورد ئاوا زەلیلە

قەت نەبوو، ئەمدی نەبن بە هۆرە
بۆ لەت لەتی یەك نۆرە بە نۆرە

دەی من بڵێم چی! لای کێ بەرم داد
هەر مەگەر لای خۆت (یَا رَبَّ الْعِبَادْ)

## لاچوونی پەردەی رەشی نکبەت و باشترین هەل و دەرفەت بۆ گەل

## بەڵام دووبارە هەر بەداخەوە

لەپاش ماوەیەك کە دیتم بە چاو
خەریکە هەوری مەینەت بێ بڵاو

تێکچێ بناغەی قۆناغی ستەم
وا جموجۆڵە و کۆمەڵ ئەبن جەم

باسی خەباتە و چارەسەری گەل
ئەڵێن بە راوێژ موشکیل ئەکەین حەل

بەڵکە ئەمجارە تیشکی رزگاریی
پرشنگ بڵاوکا لە کوردەواریی

جا لەم کاتەدا زۆر بە تین بە قوڵ
زووخاوی زامی دەروون هاتە کوڵ

بۆ چارەڕەشیی کوردی رەنجەڕۆ
دووکەڵی ئاهم بۆی ئەدا بۆسۆ

سەرم نایە سەر بەرۆکی خەیاڵ
چوومە ناو خەبات تیژتر لە شەماڵ

بەڵام کام خەبات! خەباتی راوێژ
نەك چەقە و تەقە و تیر لەیەك هاوێژ

ئەموت ئاخۆ بۆ! چی بوو چ قەوما
لەنێو گەلاندا هەر کورد بەجێما

بە پازدە تا بیست ملیۆن کوڕی چاك
نەبەز وەکو شێر، لە دوژمن بێباك

پیاوی مێژوویی صەفی کارزار[٧٩]
نەك هەر یەك و دوو، بە دەیان هەزار

هەڵکەوتوو لەنێو خاکی نیشتمان
شایستەی هانا و پەنا و پشتمان

بەڵام نەك تەنیا نەگەیین بە کام
زۆریشیان کێشان بە داری ئیعدام

لەگەڵ ئەوەشدا خوێنی ئەوانە / سەردێری مەشقی گەلی کوردانە
ناویان لە مێژوو ناسڕێتەوە / گەل لە ڕێی ئەوان ناگەڕێتەوە
چونکە ئەزانێ مافە و ڕەوایە / کۆڵدان مەحاڵە هەتا هەتایە
لە لوڕ تا کەڵهوڕ لە جاف تا بڵباس / جزیرەی عومەر تا چۆمی ئاراس
لە ملە محەممەدیی[٨٠] تا جەبەل حەمرین / لەمپەڕ بۆ ئەوپەڕ درێژیی و بەرین
بەگوێرەی عەقڵ و عادەتیش، کاکە / ئەگەر تێفکرین لەم ئاو و خاکە
بەپێی سنووری جوغرافیایی / کانگەی زێڕی ڕەش، شتی کیمیایی
ئەبوو ئەستێرەی گەشی خۆشبەختیی / هەر زوو لێی دابا بارەگا و تەختی
لە دەشت و چیای گەرمێن و کوێستان / گوڵ و گوڵزار و باخی کوردستان
لەپاش تەجرەبە و بیری سەدان ساڵ / هەوڵ و تەقالای ڕۆژ و مانگ و ساڵ
ڕێکەوتی پلە و هەلی بەقیمەت / بە سەرکردەیی دەیان بلیمەت
هێواشێ دامە بەر مەودای خەیاڵ / تێفکریم لە وەزع تەواو و کەماڵ
حاڵیم بوو کە کورد بۆیە داماوە / کراوە بە تەختەی پاپۆڕە شکاوە
دایم لە گێژ و مەوجی دەریادا / خول ئەخوا ئەڕوا بە هەرچوار لادا
لە هەر لا بۆ ڕێی نەجات ئەکۆشێ / شەپۆلی مەینەت دێ دای ئەپۆشێ
نازانێ پەنا بۆ لای کێ بەرێ / دەس بە چی بگرێ، چۆن بێتە دەرێ
دەستی دا بەدەس سەد ناکەسەوە / گیری خوارد بەدەس سەد تەرەسەوە
ئەم وتی دەستت ڕاکێشە بۆ من / ڕزگارت ئەکەم لە چنگی دوژمن
ئەوی تر وتی نەخێر من چاکم / خاوەنی هێز و دڵێکی پاکم
ئەم وتی نەخێر درۆ ئەکا ئەو / بەڵێنی بۆ کەس قەت نابێ پتەو
ڕووکە بۆ لای خۆم تا دەرت بێنم / حەقی چەن ساڵەت لە دژ بستێنم
ئەوی تر وتی ئەم هیچ بەدەستە / سەر زلی بێ خێر پارە پەرستە

ئەگەر دەسیشت بگرێ لەو حاڵە — زۆر نابا ئەڵێ دەی ئاش بەتاڵە
هەر من بەدەردی گەلی کورد ئەخۆم — چونکە لە ئێوەن، برێکیش لە خۆم
من کە لاگیری چینی چەوساوەم — هەر من پەناگای نەتەوەی کاوەم
من لەگەڵ ئێوە دراوسێ ماڵم — بۆ دوژمنی کورد (رۆستەمی زاڵ)م
ئەوان بە مانگێ ناگەنە لاتان — چڵپاوکەرانی مافی وڵاتان
ئەوی تر ئەڵێ گوێ بگرە بۆ من — بۆ تەنیا ساڵێ لێی غافڵ بم من
یارمەتیی نەدەم لە رێگەی ژیان — پشتی کوور ئەبێ وەك قەوسی کەوان
ئەو چۆن ئەتوانێ لاتی سەربەتیی — هەتا ئاخر بێ ناز و نیعمەتی
ئەو پەتی یاسای جینسیی پچڕاوە — بەشی لە یاسای ئینسیی بڕاوە
لەگەڵ درندە و وەحشیی و جانەوەر — کامەیە فەرقی لاتی کەللە کەر
ئێمە هەر نەبێ خاوەنی بڕواین — خاوەنی یاسای بەرێزی سەماین
ئێمەش وەك ئێوە خاوەن کیتابین — لە ریزی یاسای خودا حیسابین
هەر ئێمە مافی گەلان ئەزانین — بێوەفا نابین هەتا بتوانین
کەوابوو نەکەن رووکەن بەولاوە — ئەوان بۆ عالەم بوون بە ئاژاوە
گەلی هەژاریش لەم گێژاوەدا — نازانێ دەستی بە کام لاوە دا
خۆ کورد تەجرەبەی هەردووانی کردن — بە نۆبە هانا و پەنای پێ بردن
هەر جارە بەپێی وەزعی زەمانە — ئەچوو باوەشی یەکێ لەمانە
بەڵکە یا ئەمیان یا ئەویان راس بێ — گەلی کورد لە دەس ستەم خەلاس بێ
جاری وا ئەبوو لەلای رۆژهەڵات — لە شایی گێران پڕ ئەبوو وڵات
جاری واش ئەبوو لە رۆژئاواوە — دەرگای ئومێدیان لێ ئەکریاوە
کەچیی ماوەیەك ئەبووژایەوە — مەشخەڵی هیوای ئەکوژایەوە
ئەنجا دووکەڵ و پشکۆی ژێر کاکە — ئەچوو بە مێشکی خەڵکی ئەم خاکە

یەکێ لەتاوان دڵی ئەوەستا
هاواری ئەبرد بۆ لای مامۆستا

یەکێ گێژ ئەبوو یەکێ تر وەك شێت
ئەهات خۆی ئەخست بەسەر دەست وپێت

باوکەڕۆی ئەکرد بە شین و گرین
ئینسان دڵی بۆی ئەبوو بە برین

یەکێ لەتاوان ئەیدا بە هەردا
چەکی خەباتی ئەدا بە بەردا

یەکێ بە ناچار رووی ئەکردە دژ
ئەیوت با بڕۆم خۆم بدەم بە کوژ

تازە کە ئاشم ئاوی لێ بڕا
ئیتر من ژینم بۆچییە برا

ئەنجا مووچەخۆر ئەکەوتنە ولات
بۆ کەشفی ماڵی شارەیی و دێهات

بۆ بەڵگە گرتن لە هەموو چینێ
کارێکیان ئەکرد کافر نەیبینێ

گشت ناچار ئەبوون کە مل داکێشن
دەستی یارمەتییش بۆ دژ راکێشن

خوسووس ئەم گێژەی کە کوردی تێکەوت
ئاویشی لێ بوو بە ئاگر و نەوت

سووتا هەڵقرچا لاشەی سەدان کەس
کێ دیویە ئینسان ببێ بە قەقنەس

کەسیش نەپرسێ کە بۆ وات لێهات
گوناهت چی بوو! کامە بوو خەتات

کامە بوو جەورت کامە زۆرداریت
تاوانت چی بوو! کامە بوو لاریت

خۆ ئەگەر بڵێن کوردیی[٨١] خەتایە
ناوی هەر نابێ قەت بێتە کایە

بڵێم چی قەڵەم لە دەس دژدایە
چی نووسیی ئەبێ بڵێن هەر وایە

ئەنا ئەوانەی خاوەن ویجدانن
خەریکی یاسا و مافی گەلانن

نوێنەری بەناو گرۆی ئینسانن
بە چاوی ئینساف بەملا بڕوانن

ئەزانن کوردیش گەلێکە وەك خەڵك
ئەبێ مافی بێ و لێی وەرگرێ کەڵك

چونکە گەلێکە خاوەن زمانە
خاوەن قەڵەم و هێزی بەیانە

نیشتمانێکی هەیە بێ وێنە
ئەگەر حەز نەکەی بەردی لێ چێنە

ژمارەی خۆی و پێوانەی خاکی
ئەگەر بۆی بکرێ بە چاکیی و پاکیی

زیاتر لە پێنج شەش دەوڵەتانی کات
خاوەنی گەلە و باشترین ولات

ئەنجا بۆ خەبات لەپێناوی گەل / بەگوێرەی یاسا و قانوونی (دۆڵ)
گەلان بە حەوت ساڵ مافیان رەوایە / ئەبن بە خاوەن سوود و سەرمایە
چارەنووسی خۆ ئەگرنە دەس خۆ / خۆ گەلی کوردی ئێمەی رەنجەڕۆ
بە سەدان ساڵە خەبات ئەگێڕێ / توانیی لە دوژمن روو وەرنەگێڕێ
توانیی بە خوێنی شەهیدی خەبات / ئاو بدا هەموو دەشت و چیای وڵات
لە هەر مەڵبەندێ لە کوردستانی / کردی بۆ دوژمن بە گۆڕستانی
کۆڵی هەر نەدا و قەت کۆڵیش نادا / هەتا کورد مابێ لە رووی دنیادا
دەی بۆ هەتا کەی ئەم گەلە ئاوا / بە سوودی خەڵکی شەرق و رۆژئاوا
پێشێل بێ مافی، نەگا بە مەبەست / بە نۆبە نۆبە بە دەستی ئەنقەست
پووچەڵ کەن ئیشی ئەم گەلە کۆنە / بیخەنە داویش وەك کەو و سۆنە
ئاخۆ وان لەکوێ خێرخوای نەتەوان / ئادەی کامەیە بەرهەمی ئەوان
ئەگەر راس ئەکەن دڵسۆزی خەڵکن / بۆ زۆرلێکراو بەسوود و کەڵکن
خۆ هیچ کەس وەك کورد زۆری لێ نەکرا / ماڵ و سامانی بە تاڵان نەبرا
ئەی بۆ بە قورقوشم هەردوو گوێی خنیی / چاوی لێ نووقاند هەناسەی چنیی
ئێستاش هەر بڵێم خێرخوای گەلانن / خاوەنی هەست و بیروڕای جوانن
یا بڵێم بە دەم زرنگ و باشن / بەڵام هەر بۆ لای خۆیان ئەتاشن
ئەبینم چینی سەرمایەداریی / هەر بە سەرمایەی خەڵك ئەکەن یاریی
ئەوەش دەم ئەدا لە ئیشتیراکیی / هەر بۆ خۆی ئەوێ بەشی گشت پاکی
بەس بەناوی رووت لە یەکتر دیارین / ئەنا هەردوو لا هەر ئیستیعمارین
رەحم و بەزەیی ناچێ بەلایان / لەبەر قەسوەتی قەلب و خەتایان
دڵێ کە شەیتان دەسی پێ گەیی / چی ئەکا لەودا رەحم و بەزەیی
بێگومان وایە راستە ئەم باسە / خوێنی گەلانیان کردە نێو کاسە

قەت تیریش ناخۆن لەو خوێن مژینە
ئەشڵێن مەبەستمان بۆ ئێوە ژینە

ژینی سەربەخۆ بەپێی چارەنووس
جارێ وادەی غەرب جارێ وادەی رووس

هەر ڕەشەبایێك هەڵكا لەملاوە
فووی هەر لەوێوە پێدا كراوە

سەیریش وا لەوا پێشێلكراوان
ئەچنە باوەشیان بەهەڵەداوان

بەتەمای خێری ئەو بێ خێرانەن
هەر چاو لەدەستی ئەو دڵ كوێرانەن

ئەوان زوو هەستیان بەم بێ هەستییە
كرد بۆیە دەستیان لەژوور دەستیە

ئێستاش هەر ئەڵێن ئەوان پێشكەوتوون
هەست ناكەن بە چی بۆچی سەركەوتوون

تا بێن ڕۆژ بەڕۆژ بەرەو دوا ئەڕۆن
ئەمدی خەمێكی ئەساسیی بخۆن

بە لێبڕاویی یەك بگرن بە جەم
بۆ ڕزگاریی گەل لە دەستی ستەم

ناكەن هەر ئەبێ خۆ لە شەڕ لادەن
یا چۆك بە دوژمن بۆ ئەبەد دادەن

قەت ئەبوو شەوێ سەر بنێمەوە
بە داخی تازەی گەل ئەتلێمەوە

**شتێكی روون و ئاشكرایە كە گەلی كورد هەر لە پشتەوە خەنجەری لێدراوە و لە ژێر بەڵێنی درۆدا پێشێل كراوە**

پاش گەشت و خولێك لەم ناوە ناوە
ڕەوتی گەلم دی، دڵم كولاوە

ئەقشی سیاسیی زوربەی دوەلیی
بۆتە میكرۆبی ناوخۆیی گەلی

بە ددم دەم ئەدەن لە عەدڵ و لە داد
(وَمَا هُمْ إلاَّ عَدُوُّ الْعِبَادْ)

بوونە هۆی فەساد بۆ گەلان هەموو
خیلافی ئێمەش لەوانە هەموو

كۆمەڵێكی زۆر لە هەموو لاوە
بۆ مافی گەلان كە ڕێك خراوە

هاتوونە كایەی دەوری سیاسیی
بەڵام كام كایە! ناكرێ باسی

یەكێ بە باڵای غەربا ئەخوێنێ
یەكێ باڵ بۆ شەرق ڕائەوەشێنێ

یەك بۆ ئەفریقای پەڕند و چڕند — یەکێ هەوڵ ئەدا بۆ موحیطی هیند
یەکێ تر ئەڵێ دڵسۆزم بە راست — بۆ رۆژهەڵاتی بەشی ناوەڕاست
یەکێ بۆ وەحدەی عەرەب بەتینە — یەکێ بۆ ئیسلام دڵی خەمگینە
یەکێ بۆ فارس، یەك بۆ تورکمان — هەروا بۆ باقیی گەلانی جیهان
ئەڵێن بە سوودی گشتی راتەگەین — هەرکەس بەپێی خۆی مافی پێ ئەدەین
ئێمە یەککگرتووین بۆ دەفعی موشکل — بەپێی عەدالەت (لِكُلٍّ فِي الْكُلّ)
ئێمە لاگیری چینی چەوساوەین — بۆ گەلی کوردیش لە جێگەی کاوەین
جا ئەگەر راستە لە حیلە بەریین — بە دڵ خێرخوازی کوردی بێ بەریین
ئەم هەموو فیتنە و شەڕ و ئاژاوە — چی ئەکا لێرە! بۆچی نەکوژاوە
بڕێ تر ئەڵێن ئێمە بۆ هەژار — بەپیت و خێرین وەك پەڵەی بەهار
هەموو کەس ئەکەین بە خاوەن پیشە — ئیش ئەکەین بەهۆی ژینی هەمیشە[٨٢]
وا ئەکەین ئەرکی فەلا و هەژاران — کەم بێ و بەرهەمیش سەد قاتی جاران
مەکینە بۆ جووت بۆ چینی فەلا — ئەنێرین، تا کەی هۆهۆی جووتی گا!
کاتی پێویستیش گەلابێکی باش — بخاتە شوێنی بۆ ئیش و بۆ ئاش
هەروا دەراسە بۆ گەنم دروون — تا کەی پشتی کووڕ سەر سەردەونخوون
با ئارەقەی سەر نەچێتە چاوی — سەپانی فەقیر کوێر ببێ چاوی
قۆڵی وەکو داس بۆ دروێنەی داس — تا کەی هەڵسووڕێ بە لای چەپ و راس
دەوری هەسان و داس و چەورەسان — قەلاچۆ ئەکەین بە سووك و ئاسان
هەروا مەکینە و جەنجەڕ بۆ گێرە — خەرمانیش ئەکوتێ و بۆ گاکەش خێرە
ئەنجا مەکینەی خەرمان پاککردن — لە جێگەی شەن و باڵەکەو کردن
بە تۆزێك جموجۆڵی ژیرانە — ردنێوی دێنێ چی دەغڵ و دانە
ئاشە مەکینەش ئەنێرین بە تاو — دەبا رزگار بن لە دەس ئاشی ئاو

تا کەی هاڕەی ئاو، تەقەی چەقەنە
ئەویش بەرهەمی حەفتەی نێو تەنە

لە جێی تەنوور و نانی لا سووتاو
سەمووخانەیە و کولێرەی برژاو

هەروا مەکینەی شۆفڵ و لۆدەر
بۆ جادە کێشان بۆ کاتی سەفەر

لەگەڵ مەکینەی ئاو و کارەبا
بۆ شار و لادێ موفت و مەرحەبا

بۆ پیشەسازییش یەکجار بەکەڵکن
هۆی پێکهێنانی پێویستیی خەڵکن

دەورێکی جوان و گرنگ ئەبینن
کەس نابێ سوودیان لێوە نەبینن

دەبا نەجات بێ بە دەس چراوە
بە با و بە باران هەر ئەکوژاوە

با بڕوا دەوری بارەبەریی کەر
بە هەچە هەچە و بە نەقیزەی تەڕ

ئەسپ و ماینیش نامێنێ باوی
ئیتر بۆچیتە زین و لغاوی

کارێ وا ئەکەین بە درێژیی مێژوو
پەشیمان نەبن بۆ ژینی پێشوو

هەروا شتی تر چی ترتان ئەوێ
ئێمە بۆ خۆشیی ئێوەمان ئەوێ

بەڵێ ئەمانە هۆی حەسانەوەن
بەڵام بە راستیی جێی لێکدانەوەن

دووگەی وا چەور بێ تەقەی تەڵە
قەت باوەڕ نەکەی، نەچی بە هەڵە

ئەم ماستە هەرگیز بێ موو نەزانی
کە گیرا گەرووت ئەوسا ئەزانی

ئەمانە دەم و دڵیان جیایە
هەزار حیلەیان لە ژێر سەرایە

بۆ رازانەوەی خەریتەی ژیان
گەل خەڵەتێنن بە سەدان سەدان

بەڵام درۆیە و فێڵە، (وَإِلاَّ
لاَ خَيْرَ فِيهِمْ حَاشَا وكَلاَّ)

❊❊❊

## بە چاو خشاندنێك بە لاپەڕەکانی مێژووی گشتیدا دەرئەکەوێ
## کە پێشێلکەرانی مافی گەلانی ستەم لێکراو کێن

میلەی تەرازووی هەمووی ئەوانە      بە دەستی شەرق و غەربی بزانە
هەر جارە یەکیان وەك وەزنەی قەپان      تاوتوو ئەکەن بۆ ڕێی خۆسەپان
بەسەر گەلانی هەزار و لاواز      بە وەعدەی درۆ بە سەدان ئاواز
بەڵێ جار بە جار هەر ئەدوێن لەیەك      بەلام نایەڵن دەمیان گا بەیەك
بە گەف کردن و ناحەز پێك وتن      ئاو قوڕاو ئەکەن بۆ ماسیی گرتن
ئەوەش مەعلوومە هەرچۆن ڕێکەوێ      دز هەر بازاڕی ئاژاوەی ئەوێ
دوژمن وەکو خۆت بێ خەم مەزانە      بیری ئەو قوولە، تەمای پێمانە
خەریتەی زەویی وا لە بەردەمی      لە شەرق هەتا غەرب لە زۆر و کەمی
پێوانەی ئەکا بە میقیاسی غەش      بەس بە سوودی خۆی ئەیکا بە بەش بەش
وەك قەسسابی چاك بۆ گا سەربڕین      بە تەور ئەماڵێ بە سەلکیا بە قین
بۆ ئەوەی هۆشی لە خۆی نەمێنێ      بۆ گیانی شیرین سەر نەوەشێنێ
یا لینگەفڕێ نەکا و هەڵبستێ      بۆ سەربڕینی قەسساب نەوەستێ
تا بە مەیلی خۆی ملی هەڵبڕێ      پێستەکەی لابا و ورگی هەڵدڕێ
بڕوانە چەقۆ و دەستی ساتۆری      بزانە چی ئەکا بە زۆڵیی و زۆری
چەرمەکەی زەوییت بۆ بلاو ئەکا      ئەوەی بەکەڵکە لێت گلاو ئەکا
هەروەکو چاوبەست ئازا گورجوگۆڵ      گوێ نادا بە کەس یا بە بۆڵەبۆڵ
ئەوەی بەنرخە ئەیبا لەبۆ خۆی      تۆش لە دوورەوە هەر بڕوانە بۆی
ئەنجا پێست ئەڵێ بێدەنگ دانیشە      منم خاوەنی سەنعەت و پیشە
تۆ سەرت لە هیچ دەرناچێ یەقین      هەر من پێشکەوتووم بۆ قۆناغی ژین

چەرمەکەی ئەبەم بۆت دەباغ ئەکەم
بۆت بە شبراو و قایشی ساغ ئەکەم

ئەیکەم بە کاڵەی شەمامە بەندیی
یا بە قۆندەرەی کردەی هۆڵەندیی

بۆ ئەوەی دڕکی مەینەت و کاتت
نەچێ بە پێتا بۆ ڕێی خەباتت

هەم ئەیکەم بە زین بۆ ڕۆژی سوارییت
بۆ کاتی خەبات لە کوردەوارییت

هەروا بە فیشەکلغی مل و شان
تا بیدەی لە خۆت وەك شێری ژیان(۸۳)

تووکەکەش ئەکەم بە تاجی سەرت
با خەڵك جەم بن لە دەوروبەرت

چەرمەکەی سەری بۆ تیرەی کڵاش
کلك و گوێچکەشی بۆ زەلامی جاش

بەڵام مێشکەکەی لەگەڵ زمانی
بۆ من و، بۆ تۆش پووك و ددانی

ئەمجا سەرسینگ و بەزی سەر شانی
لەگەڵ نەرمەکەی لەش و لا ڕانی

گورچیلە و دڵ و جەرگی خوێناوی
قەیناکا بۆ من، بۆ تۆش زراوی

باقیی ناو سکی لەگەڵ ڕیخۆڵە
دای ئەنێم بۆ تۆ چی نەرمونۆڵە

ورگەکەش بەرە و بیکە بە گیپە
شایانی سفرەی میر و سەرتیپە

ڕیخۆڵەکانی ببەستە پشتت
چونکە پشتوێنە یاسا و ڕەوشتت

باقیی شەخەڵی ورگی پتەوی
باشترین شتە بۆ کودی زەویی

ئێسقانی سەری بۆ کوتکی(۸٤) ناو ماڵ
پەل و پەراسووی بۆ داری ڕەشماڵ

پێویستن بۆتان بۆ کاتی بەهار
کە پۆل پۆل ئەڕۆن ئەچن بۆ هەوار

شاخەکەی خۆش کەن بۆ ڕۆنی هەسان
با دانەمێنن بۆی پاڵە و سەپان

شاڕەگی لاشە و خوێنی حەیاتی
کانگەی دەروون و دڵی وڵاتی

ئەمانەی بۆ من، دۆنەکەی بۆ تۆ
بیدە لە ژێر پێت کاتی هاتوچۆ

با پێت نەقەڵشێ لەنێو تۆز و خۆڵ
بە کۆنە کاڵە و پێڵاوی شڕۆڵ

ئەگەر ئەزانی سوودی ئەم دۆنە
بۆ جادە و کۆڵان بەرهەمی چۆنە

ئەڵێی من لە تۆ بەس نەمەم بەسە
چونکە دنیایە و هەرکەس هەرکەسە

نە خۆت نە بارت نە بارەبەرت
ناچەقێتە قورِ بۆ دەردی سەرت

واتە قیرتاوی رێباز و شەقام
باشترین ئەرکە بۆ خزمەت بە عام

ئەوسا ئەزانی من بۆ تۆ چۆنم
چ دڵ سۆزێکی لەمێژ و کۆنم

ئەنجا بێ خەم بە، وەسیلەی ژینت
بۆ تەرتیب نەکەم بتبێ یەقینت

لە غاز و نەوت و لە رۆن و بەنزین
سەد ئەوەندەی دار بێ دووکەڵ بە تین

لە سەیارەی چاك بۆ کاتی سەفەر
قۆناغ بە قۆناغ برِۆی بێ خەتەر

یا بە فرۆکە و پاپۆری دەریا
تۆغرت خێر بێ، چالاك و وریا

بۆ شەرِق یا بۆ غەرِب بۆ رابواردن
لە مەلها و مەسبەح جێی خەو و خواردن

ئەوەی بیستووتە لە وەسفی بەهەشت
برِۆ و ببینە باخ و دەر و دەشت

بە رەنگ و بۆنی گوڵان خەملاوە
کورِ و کچی جوان دەوری لێداوە

واتە لە هەر لا حۆر و غیلمانە
بەهەشت چی ترە بێجگە لەمانە!

هەمووی چاوەڕێی میوانیی تۆیە(٨٥)
بەڵام ئەرکەکەی یەك بە دە و نۆیە

هەرچەند بەرهەمی وڵاتی خۆتە
ئێمە لێرەدا ئەیخەینە بۆتە

قاڵی ئەکەین بۆت بۆ مەزەی شەراب
نەکەی بترسی لە رۆژی حیساب

ژیانی بەنرخ و بێ کێشە و گێرە
ئەگەر ئەتەوێ ئەوەتا لێرە

هەرچی دەسکەوتی ئیش و کارتە
سا رەنجی پایز یا بەهارتە

بیکە بە پارە و بیخە گیرفانت
یەکسەر بە خۆت و خاو و خێزانت

وەرن بۆ ئێرە جێی سەیرانگایە
سەری رەش چیە ئەو شاخ و چیایە!

یاخۆ سەرچاوەی زەڵم و سەرچنار
تاڤگەی (عەلی بەگ) پرِ لە مشك و مار

با خێزانیشت چاوێ کاتەوە
ناورِ لە ژینی ئێمە داتەوە

بزانن فەرقی ژیانی ئێمە و
ژیانی ئێوەی تێرنەبوو لە خەو

لەبەر مێشوولە و مالاریا و مەگەس
قەت خەو ناکەوێ شەو لە چاوی کەس

حالّیی بن ژینی ئێوە هەر ژانە … ژین ئەم ژینەیە ئێمە هەمانە
بە رۆژ بۆ پارە تاوێ هەوڵ ئەدەین … بە شەو عەیش و نۆش لەپ لە لەپ ئەدەین
هەرکەس بیەوێ ماڵ نەکاتەوە … جێشی حازر بێ و پاڵ بداتەوە
پێویستی نابێ خەریك بێ بە ماڵ … بە سەرجەنجاڵیی تێکدا لە خۆی حاڵ
ئوتێلی مومتاز بۆ جێگەی خەوی … لەگەڵ جوانترین رەفیق بۆ شەوی
لە هۆدەی خەڵوەت وەك شووشە سافە … هەموو شەوێکی شەوی زەفافە
کەس بۆ کوڕ و کچ ناپرسێتەوە … ئاخۆ شەو لە کوێ سەر ئەنێتەوە
نە باب نە برا نالێن لە کوێ بووی … چیت ئەکرد یاخۆ رەفیقی کێ بووی
بلێن بە چینی گەنجی نیشتەجێ[٨٦] … نەترسن بڵێن دین لەکیس ئەچێ
لێرە رێگەی دین ناگیرێ لە کەس … چی ئەکەی بیکە تا خۆت ئەڵێی بەس
کاتی نەخۆشییش لە خەستەخانە … چاکترین دکتۆر ئێمە هەمانە
پسپۆڕی هەموو ئازای ئەندامە … نالێ کێی کاکە، خەڵکی کوێی مامە
لێرە ویژدان و زەمیر کار ئەکا … کێ فەرقی لادێ و خەڵکی شار ئەکا
بۆ سووکە لەرز و سەرئێشە و ددان … یاخۆ گەندە تا و بێخەویی شەوان
حەبی جۆربەجۆر لە ئەجزاخانە … تا بڵێن هەیە و زۆر و هەرزانە
بیخۆن بێ خەم بن لە لەش بەباریی … یا بە رواڵەت شێوەی هەژاریی
خۆت لێرە خاوەن مەیل و ئیرادەی … هەر پارەت بێ سا وەرە سا دەی
کەس بە کەس نابێ بڵێ چ کارەی … خەڵکی کام وڵات یا هی کام شارەی
هەرچی کەی لێرە مانیع نیە بۆت … ئاوایە مەعنای ژینی سەربەخۆت
هەموو هۆی خۆشییت ئامادە و بێ خەم … لەولا چی ئەبێ جارِ بە جەهەننەم
ئەنجا بۆ ئەوەی کە بێ بەش نەبی … زیاتر لە ئێستە چارەڕەش نەبی
ئەگەر تۆش دەستت نەگەیشت بە من … خۆم بۆت ئەگەڕێم قوژبن بە قوژبن

تـا پەیـدات ئەکـەم لێـرە و لەوێـدا    نەبا(...) نەحۆش بـی و بمـری لـە جێـە
نە وەسـیلەی ژیـن نـە هـی نەخۆشـیی    نەتبێ، چـیت هەیـە ئـەویش بفرۆشـی
چی تۆ پێت بوێ و مەبەست بێ لـەلات    کـاتی نەخۆشـیی دکتـۆر دێتـە لات
خـۆم چـاوەدێریت پـڕ بـە دڵ ئەکـەم    کە مـردی گوڵـت لەسـەر شـین ئەکـەم
نـاوت لـێ ئـەنێم شـەهیدی خـەبات    تـا هـەموو کەسـت ئەنێـژم لـەلات
نەکـەی! خـەم نـەخۆی بـۆ نیشـتمانت    بـۆ جـێ هەوارگـەی رەنگـین و جوانـت
نـەڵێی بێکـەس مـا نیشـتمانەکەم    هیـوا و هومێـدی مـاوەی ژیانەکـەم
نایـەڵم هـەرگیز دایکـی نیشـتمان    بـێ سەرپەرشـت بـێ لـەنێو گشـتمان
مـیر و گـزیری بـۆ ئـەگرم ئـەمجار    بـۆت ئـەڕەنگێنم وەك کـاتی بـەهار
تـا بـۆنی لالـە و گوڵـزاری چـەمەن    بچـێ بەسـەرتا لـە ژێـر تـۆی کەفـەن
بەڵێن بێ مـن تـۆم لـەوێش لـەبیر بـێ    با تۆش جێگەکەت (بِئْسَ الْمَصِيرْ) بـێ
دەك ماڵـت برمـێ خـۆت و گـزیرت    بۆ چاکەی نەیکەی لەعنەت لـە شـیرت
راس ئەکەن شەرقی و غەربی و ئورووپیی    بوورژیی و کاتۆلیـك بـوودایی و هیپیـی
ئەگـەر وا نەکـەن لـەملاش بـێ بەشـن    لـەولاش گـیرۆدەی دواڕۆژی رەشـن
چـونکە ئـەم دنیـا بـەو شـێوە پیسـە    بەهەشـتی گـرۆی کـوفر و ئیبلیسـە
چـی نەیکـەن ئـەوان پەشـیمان ئـەبن    لـەو پەشـیمانییەش پەشـیمان ئـەبن
ئـاوات ئـەخوازن خۆزگـە نەبوایـەن    ئەگەر هەر ئـەبوون دار و بـەرد بوایـەن
یـا کـە ئـەمردن زینـدوو نـەکرابان    بـۆ جـەزای عەمـەل سـزا نـەدرابان
کـەوابوو ئـەوان بـە بـوون و نـەبوون    لە ژیـن بـێ‌بەشـن بـە هەڵـەدا چـوون
بـۆ دوو رۆژە ژیـن ئـەو هـەموو ژانـە    کـەی پەسـەندە لای ئـەودی ئینسـانە
دنیـا کـە بـێ شـك هـەر ئەبڕێتـەوە    کـەس بـەو هـەتا سـەر ناحەسـێتەوە
هەر نەبێ کـاتی پیریـی و بـێ دەسـیی    بـۆ خـۆت لـە ژیـانی دنیـا وەڕەسـی

ئارەزوو ئەکەی کە پێ داکێشی     بۆ پەیکی ئەجەل ملت راکێشی
شا بی یا وەزیر خەیاڵت خاوە     دوارۆژی دنیات دوو گەزە جاوە
ئەویش دائەڕزێ لەبەرتا تەواو     بە رووت و قووتیی خۆت دێتە بەرچاو
تا ئەو دائەڕزێ تۆش داگەنیوی     وەك خرچەی رزیو پێکدا تەپیوی
نە رەنگ نە روخسار نە وێنە و دیمەن     هیچی نامێنێ لە ژێر تۆی کەفەن
ئەندامت لەیەك جیا ئەبێتەوە     جەزای کردەوەت پێ ئەدرێتەوە
مار و دووپشك پێت ئەبن خەنیی     دەردی چیت ئەخوا غرووری منیی(٨٨)
ئەوسا لە ژێر گڵ پێم بڵێ، مامە     لاشەی فەقیر و دەوڵەمەند کامە
ئەوسا ئەزانی بێ شك و تەردید     مەعنای ئایەت و حەدیسی وەعید
ئەوسا ئەزانی مەلا چی ئەوت     کێ بەجێماوە و کێ وەپێش کەوت
کێ دڵسۆزت بوو، دوژمنت کێ بوو     قسەی کامەمان بەڕێ و جێ بوو
هەستی ئیسلامییت کێ لە تۆی دزیی     نەتزانی بە خۆت تا ئاوا رزیی
جا خۆت بیرکەوە لەو دان و داوە     کە دوژمن بە فێڵ بۆتی داناوە
قەت ئەمین مەبە لەو خوو پڵنگە     ئازای ئەندامی ددان و چنگە
چاوی وەك چاوی گورگە لە شەودا     کەشف ئەکا وڵات تۆ وای لە خەودا
واتە سەرچاوەی زێڕی نەوتەکەت     ئەمژێ وەك ئاوی بیری حەوشەکەت
لایێ بە پاپۆڕ لایێ بە لۆریی     لایێ تر هەروا ئەیکاتە بۆریی
ئێمە لە بۆریی ئاویش بێبەشین     ئەگەرچی لەسەر ئاڵتوونی رەشین
ئەو لێرە بۆریی بە ژێر زەویدا     بەو هەموو رێگای بەرز و نەویدا
بەو هەموو دەشت و شاخ و چیادا     هەم لە رووی زەویی هەم بە دەریادا
ئەیبا بۆ ئەوێ بێ ئارەق رشتن     بێ ئەوەی لە خۆی کەس دا بە کوشتن
ئەودی بەکەڵکە ئەیبا لەبۆ خۆی     تۆش لە دوورەوە هەر بڕوانە بۆی

ئەوپەڕی چاکەی بۆ چینی هەژار ‌‌ ئەمەیە ئەڵێ ئەتکەم بە کرێکار
با لە بێ ئیشیی خەفەتبار نەبی ‌‌ لای ماڵ و خێزان شەرمەزار نەبی
رووت نەبێ شەویش بچییەوە ماڵێ ‌‌ منداڵی برسیی لە دەورت ئاڵێ
ئەویش بەو مەرجەی خیانەت نەکەی ‌‌ لە ئیشی مندا دەخالەت نەکەی
نەڵێی با منیش خاوەن پیشە بم ‌‌ بۆ چینی دوای خۆم بنج و ریشە بم
خەیاڵی فێربوون نەچێتە سەرت ‌‌ ئەبێتە مایەی نەمانی سەرت
مووچەی رۆژانە کافیی‌یە بۆ تۆ ‌‌ بیخە گیرفانت بە بێدەنگ بڕۆ
بەیانییش سەری سەعاتی دەوام ‌‌ کەمتەرخەم نەبی، زوو وەرە بۆ لام
نەکەی دواکەوی لە کەند و کۆژەت ‌‌ ئەنا لێت ئەبڕم مووچەی ئەو رۆژەت
هەزاری وەك تۆ وەستاوە لەوێ ‌‌ بە پارەی کەمتر بۆ نانی شەوێ
دەستم ماچ ئەکا و ئەلالێتەوە ‌‌ لە چەند واسیتەش ئەپاڕێتەوە
بیخەمە سەر ئیش، دەس بەتاڵ نەبێ ‌‌ تا چاولەبەری ژن و ماڵ نەبێ
ئاوایە چاکەی دوژمنانی دین ‌‌ هێشتا بەو حاڵەش لێمان رازیی نین
هەر خوا مەجالی نەداوە پێیان ‌‌ ئەنا هیچ بە دوور مەزانە لێیان
ئەگەر هیچ نەبێ خۆمان لە خۆمان ‌‌ ئەکەن بە دوژمن بۆ گیانی خۆمان
ئێمە بەربینە گیانی یەکترین ‌‌ هەر رۆژە لایەك پڕ بکەین لە شین
بۆ کەمێ پارە یا ئافەرینێك ‌‌ بە ناوی ژیان بەڵام چ ژینێك!
بە پارە و لالە بۆ مووچەخۆریی ‌‌ ئەویش بەوپەڕی کزیی و سەرشۆڕیی
تێفکرن ئێوە لە حیلەی ئەوان ‌‌ شەیتان حەساوە، پێگەیین ئەوان
شەیتان بە خەیاڵ ئینسان هان ئەدا ‌‌ کەی بە کردەوە خۆی نیشان ئەدا
بەڵام ئەمانە بە کردەوەی پیس ‌‌ بەستیان لە پشت مل دوو دەستی ئیبلیس
هاتن لەرێوە لەگەڵ کاربەدەست ‌‌ پەیمانی یاسای پیسی خۆیان بەست

هەروا خزانە نێو یاسانووسان
بە حیلە چاوی ئەوانیان نووسان

پێیان سەلماندن ئێوە دواکەوتوون
لە ژیانی خۆتان بە هەڵەدا چوون

ئەم دواکەوتنەش هۆی نەزانینە
نەزانییش هەمووی واسیتەی دینە

چی کرد بۆ ئێوە ئەو دینە کۆنە
کامە بەرهەمی! بزانین چۆنە

بێجگە لە وەعدە و ترس و بیم و لەرز
بە سەدان شێوە، بە هەزاران تەرز

ئەویش لەبۆ کەی! لەبۆ دوای مردن
هەر بە قسە قوڕیان بەسەردا کردن

بۆ هەرگیز ئێمە نەماندیی جارێك
لە گۆڕستانی لادێ یا شارێك

یەکێ بێتەوە بڵێین چ باسە!
بڵێ مەوعیزەی مەلا گشت راسە

تەنیا موسڵمان حیسابی پاکە
چونکە ئەو دینی بەلاوە چاکە

ئەوەی فاسق بێ یا کافر بە دین
سزایان ئەدەن بە قەهر و بە قین

ئێمە بڕوامان لەم بارە وایە
هیچی وا نیە و گاڵە و هەرایە

کەوابوو هەرچی مەلا لەم بارە
ئەیڵێ فریوە بۆ پووڵ و پارە

تا لە دنیادان بیبەن بەرێوە
هەرچی ئارەزووی نەفسی وا پێوە

لە دوای مردنتان شتێ تر نیە
زیندووبوونەوە و سزای گۆڕ چیە

کامەیە بەهەشت جەهەننەم چۆنە؟
تا کەی فریوی ئەم یاسا کۆنە

شتێ کە ئاوا نادیارییە
بەس لە سەردەمی مەلا جارییە

چۆن ئەبێ جێگەی بڕوا بێ بۆتان
باوەڕتان نەبێ بە عەقڵی خۆتان

ئاخر چۆن ئەبێ شتی نامەلموس
هەڵیبژێرن بۆ رێی چارەنووس

شتێ نەیبینن لە چی ئەترسن
تا کەی لە عەقڵی خۆتان ناپرسن

بڵێن هەی یاران خۆ ئێمەش ژیرین
بۆ بەدەس قسەی مەلا ئەسیرین

ئاخر هەتا کەی لە ژین بێبەش بین
دڵ پڕ لە ترسی دوارۆژی رەش بین

بەسیە راپەڕن لەو خەوە هەستن
لای ئێمە هەموو سەرخۆش و مەستن

خەریکی شادیین بە رۆژ و بە شەو
بایە لەلایان قسەی ئەم و ئەو

بیر ئا لەمانە هەر ناکەنەوە
جوابی مەلا و شت قەت نادەنەوە؛

چونکە لای ئێمە ئەو دەنگوباسە
کۆنەپەرستیی و بلّغ و تەناسە[89]

سەری ئێوەیان پێچاوەتە جاو
دووکانە و لە ژێر ناوی دین بە ناو

## لێکۆڵینەوەیەك لەسەر بینراو و نەبینراو لە روانگەی عەقڵی سەلیمدا

جا منیش ئەڵێم بڵێن بەوانە
کە چاوی عەقڵ و دڵیان وێرانە

لەو کاتە عەقڵی عالەم بەش کرا
ئێوە مەشغووڵ بوون بە گاڵتە و هەرا

بێبەش مان تەواو لە عەقڵی سەلیم
مەحاڵە ئێوە و جادەی موستەقیم

مۆری شەقاوەت درا لە دڵتان
ئەبێ هەر وابن تا سەرای گڵتان

ئێوە کە لافی ژیریی لێ ئەدەن
بە خەیاڵ بە عەقڵ پەی بە شت ئەبەن

پێم وتن عەقڵ بەشێکە مەکتووم
لە خاوەن عەقڵی جەهوول و ظەلووم

شتێ بەشێ بێ لەو ناتەواوە
ئەبێ چۆن بڵێی ئەم خۆی تەواوە

ئەگەر بیروڕات لە عەقڵا وابێ
ئەبێ بڵێن پێت سەڵات لێ رابێ

ئەنجا هەرچۆن بێ ئەو نەبینراوە
بۆ حوکمی بوونت بەسەردا داوە!

ئەشفەرمووی بە ئەم من شت ئەزانم
ئەگەر راس ئەکەی ئادەی بزانم

کامەیە عەقڵت، چۆنە وێنەکەی؟
کامەیە رەنگی، کوێیە شوێنەکەی

ئەسڵی ماددەکەی لەگەڵ ئیدڕاکی
بڵێ پێم، ئەگەر تۆ کوڕی چاکی

یاخۆ رووحەکەت کە ژینت بەوە
هەرچی کە ئەیکەی بەبۆنەی ئەوە

ماددەکەی چۆنە و چۆنە ئەتواری؟
لە حاڵی خەودا یا لە بێداریی

یاخۆ وێنەکەی بێ گەرد و رەنگی
یا شێوەی دەرك و دەنگی قەشەنگی

دەرناچێ سەرت لەو بولعەجیبە — لەو نامەرئییەی سەیر و غەریبە
کە بڕیار وابێ هەرچی نەبینرێ — حوکمی نەبوونی بەسەردا بکرێ
کەوابوو بەپێی قسە و کەلامت — نە رووحت هەیە و نە عەقڵ و فامت
چونکە نابینرێن بەو عەقڵ و بیرەت — مەگەر بە چاوی مەعنا و بەصیرەت
خۆ ئەمەش خاصی گرۆی خاصانە — کە لەو عیلمەدا چاك شارەزانە
غەوواصی دەریای دوڕڕ و گەوهەرن — خاوەنی فەزڵ و عیلم و جەوهەرن
دەرکی ئەوانە هەرگیز لەمانە — لەبەر نەزانییت بە دوور مەزانە
ئەمان طەیاری فەزای ئەسرارن — ئەمان مەحرەمی گەنجی ئەنوارن
گەوهەرشناسی عالەمی ئەمرن — تەواو عەیارن، موطیعی ئەمرن
کلیلی دەرگای مەشاکیل گوشان — بەڵێ بە راسیی ئەولیای خودان
تۆ کە مەحدوودی سوپای حەواسی — بۆیە رێ نابەی بە ڕێگەی راسیی
هەرچی لە حەواس بەدەر بوو لەلات — ئەڵێی تام و خوێی نامومکین ئەدات
خۆ هەر خۆت ئەڵێی عەقڵم تەواوە — رووحێکیش وەبەر لاشەم نراوە
خۆت بۆ دیاری! ئەمان بۆ خەفیین — مەگەر سەگ و گورگ لەمانە گەفین!
بەغار بۆ عەدەم لەلای تۆ ڕەوین — بۆیە لە ماڵی نەبووندا کەوین[٩٠]
یا لەلات وایە ئەمرێکی وەهمیین — بێجگە لە مەوهووم شتێکی تر نین
بە هەر لایەکا عەقڵت بڕ نەکا — یا پەلاماری شتێ تر ئەدا
خۆت ئەخەیتە گێر بەم وتوویژە — نەجاتت نابێ هەرگیز لەم گێژە
ئەوەی تۆ ئەڵێی عەقڵ و شعوورە — یا رووحە، لەگەڵ دەعواکەت دوورە
ئەی من بڵێم چی ئا بەم سەقافە — بەس مەگەر بڵێم جەهل و خیلافە
کەوابوو لەسەر ئەم قسەت مەڕۆ — با گوڵی گەنمت لێ نەبێ بە جۆ
بیرێ لە هێزی کاردبا کەوە — هەر خۆت وەڵامی هەڵەی خۆت دەوە

یاخۆ ئەو هێزەی دەنگی تیزاعە ئەدا بە رادیۆ لەو ساحە و قاعە
لە ئانی واحید بە عالەم ئەگا بەبێ زەحمەت و بێ سەر و صەدا
یا وێنە و تەمسیل لەو ئیزاعە چۆن بە کوێدا ئەچێ بۆ تەلەفزیۆن
بە هەوادا دێ یا بە زەوییدا لە بەرزیی ئەڕوا یا لە نەوییدا
کەچیی نابینرێن بەڵام مەوجوودن بەڵگە و دەلیلی دەعوای مەقصوودن
ئەگەر بەمانەش بلێی خەیاڵە دیارە ئیزاعەی سەرت بەتاڵە
باشە ئەگەر نین ئەو ئاسارە چین ؟ شێت و دێوانەش ناڵێن نەخێر نین
کەوابوو نەفیی شتێ نەیزانی یاخۆ نەیبینی، جەهلە و نەزانیی
چونکە شتی وا زۆرە لەم بابە بڕۆ نەخۆشیی عەقڵەکەت لابە
عەقڵ و رووح وێنەی ئاوێنەی پاکن لەگەڵ رووناکیی بەکەڵك و چاکن
ئەگەر رووناکیی با لە ئاوێنە(٩١) ئاوێنە بێ شك وەرئەگرێ وێنە
بەڵام لەکاتێ تۆزی نیشتە سەر یا لە تاریکیی تۆ بیخەیتە دەر
هێزی وەرگرتن بەرئەدا لە دەس نیشانت نادا وێنە و شێوەی کەس
مەگەر بە شتی پاك مشتومالّی کەی ودبەر رووناکیی چرای ماڵی دەی
یا بیدەیتە بەر رووناکیی هەتاو بەرامبەر بە شت رایگری تەواو
ئەوسا تێنەگەی لە جازیبەی ئەو بە رۆژ بێ یاخۆ لەبەر چرای شەو
ئەوەی رووحەکەی بە زوڵمەت فێرە چاوی دڵیشی بە قەسوەت کوێرە
ئەویش بە نووری ئیمان و عەمەل لا ئەچێ و ئەبێ بە جێگەی ئەمەل
تۆ کە ئەمانەت لا دەس ناکەوێ عەقڵەکەت ئەبێ هەروا داکەوێ
تا نەفس و شەیتان بەسەرتا زاڵ بێ ئەبێ عەقڵەکەت هەر بێ کەماڵ بێ
نەفس دژێکە وەك دزی ماڵیی یەك لە هەزاران لەو ئەبێ حاڵیی
ئەمیش یەکێکە لە شتی نەبینراو ئەتکا بە تووشی هەزار بەیت و باو

کەچیی تۆ هەرگیز نایبینی بە چاو ئەو بەبێ زەحمەت تۆ ئەخاتە داو
گیرۆدەت ئەکا هەتا تۆ ماوی نایەڵێ هەست کەی کە چەند داماوی
تا سەلبی عەقڵ و هەستی ئینسانییت لێ ئەکا، خۆشت بە خۆت نازانیت
تا ئەتکا بە دیل بۆ ئارەزووی خۆی ناپرسێ لەوەی خۆ لە تۆیە خۆی
ئەم هەر مەبەستی هەوەس بازییە ناترسێ لەوەی خوا نارازییە
خیلقەت و تەبعی ئەم خوو خەسیسە ئیشی خراپ و ئارەزووی پیسە
بۆیە لا ناکا بە لای چاکەدا[٩٢] تا تۆ بێنێ لەم سەر خاکەدا
جا کەسێ پیاوە خۆی نەکا بە دیل بە دەس دوژمنی ئاوا بێ مەثیل
نرخی خۆی لە دەس خۆی نەدا بۆ ئەو بۆ ئارەزووی ئەو رۆژ نەکا بە شەو
لە حەق لا نەدا، دەسخەڕۆ نەبێ با تووشی هەڵەی سەربەخۆ نەبێ
دوژمنی ئاوا مەحووس و نەفام نەبووە قەت نابێ تا قافی قیام
حەز ئەکا بڵێی چی وەسفی چاکە لە تۆدا هەیە و طینەتت پاکە
بەڵام قەت بە لای چاکەشدا نەچێ کۆسە و ریشی پان لەودا دێتەجێ
لەگەڵ ئەم حاڵەش بێ شك بزانە هەر ئەمە حەربەی[٩٣] دەستی شەیتانە
شەیتان بەس بە نەفس زاڵ ئەبێ لەسەر کردەوەی خراپ بۆ گرۆی بەشەر
ئەمەش روونترە لە تیشکی هەتاو کە نەفس و شەیتان نابینرێن بە چاو
کەچیی ئینکاری ئەم دوو خەسیسە مونافیی عەقڵ و نەقڵ و حەدیسە
ئەنجا رەفیقی خراپ و ناکەس ئەنخەڵەتێنن بۆ هەوا و هەوەس
هەروا ئینسانی سەخیف و ناجینس کە پێیان ئەڵێن (شَيَاطِينُ الإِنْسْ)
تەئسیریان لەسەر شعوور و فامت لەسەر ئەخلاق و تەرزی کەلامت
لەسەر رەوشتی بەرزی ئینسانییت ئەوەندە زۆرە خۆشت نەزانیت
ئەمانەش حیزبی ئەم دوو ناپاکەن بۆیە دوژمنی رێبازی چاکەن

تا تۆ بەمانە زیاتر خەریکی — لە ڕێگەی ڕاسیی دوور و تەریکی
ئەمەش بێگومان جورم و خەتایە — هۆی چارەڕەشیی دین و دنیایە
هەروا شتی تر زۆرە لەو بارە — ئەگەر تۆ عەقڵ و رووحت وشیار:
بیرکە لە وەزعی (رُؤیا) لە خەودا — کە تۆ ئەیبینی لە نیوەشەودا!
لە حاڵی خۆشیی یا لە ترس و بیم — ئەگەر بەشداری لە عەقڵی سەلیم
هەرکەس لە ماوەی ژیانی جارێ — خەوی بینیبێ بە ئیشوکارێ
جا خراپە بێ یاخۆ باشە بێ — تەنانەت ئەگەر هاشەوپاشە بێ
وەك حاڵی کابووس کە لەش دائەگرێ — (رَائِي)[٩٤] لە خەویا نزیکە بمرێ
گاه لەبەر سەختیی وەزعی پەشێوی — خەریکە گیانی بێتە سەر لێوی
تەنانەت لەگەڵ ڕەفیقی شەوی — شەریکی حاڵی بێداریی و خەوی
یاخۆ کۆمەڵێك دانیشتوون لەلای — بێ ئاگان تەواو لە حاڵی (رُؤیا)ی
ئایە ئەمانە هەستی پێ ئەکەن — کە لەو حاڵەدا چی لە ئەو ئەکەن!
حاشا کە هەرگیز عالەمی حەواس — مەحاڵە لێرە پەنجە دا لە طاس
کەچیی حاڵەکەی روونە لەلای خۆی — وەك وجوودی خۆی بێگومانە بۆی
تەنانەت ئەگەر بڵێن درۆ بوو — خۆ ئێمە هەموو چاومان لە تۆ بوو
نە لاشەت جووڵا نە دەنگت ئەهات — نە خۆشیتمان دی نە حاڵی جەفات
ئەو قەسەم ئەخوا[٩٥] کە حاڵم وابوو — بۆ کاتی مردن کەمێکم مابوو
ئەنجا من بە کام لەو دەمەتەقە — بڵێم ڕاس ئەکەی قسەی تۆ حەقە
بێگومان بینەر بەینی خۆی و خوای — بێ درۆ ئەکا شەرحی ماجەڕای
کەوابوو بێ شك (مَا وَرَى)ی حەواس[٩٦] — عالەمی تریش بەبێ قسە و باس
هەیە و بە حەواس دەرکی ناکرێ — لێرەدا بۆ من شەرحی نادرێ
بەڵام بە کورتیی لەمەوپێشەوە — باسێکی کەمم هێنا پێشەوە

ئەویش عالەمی (أمْر)و (مَعْنَى)یە      رووتە لە ماددە و لەم خەلقە جیایە
واتە دوو نەوعە کەون و کائینات      یەکەم (مُشَاهَدْ) دوو (مُجَرَّدَاتْ)
کە رووح یەکێکە لە دووەم بەشی      سەیرە تۆ لە هۆی ژینت بێ بەشی
مەحاڵە بۆ تۆ دەرکی ئەم حاڵە      تا تۆ بە ماددە سەرت جەنجاڵە
جا چونکە تۆ خۆت گشت گیانت ژەنگە      بۆ دەرکی دووەم مەجالت تەنگە
بە ناچار ئەڵێی چی (مَرْئِي) نەبێ      ئەبێ لە ئەسڵا وجوودی نەبێ
ئەمەش پێی ئەڵێن جەهلی مورەککەب      دڵت نەڕەنجێ لە تەرکی ئەدەب
کەسێ هەست ئەکا بەو موجەڕڕەدات      کە باری خەتا لە خۆی لا ببات
دەرچێ لە پەردەی زوڵماتی حیجاب      (فَطُوبَى لَهُمْ وَحُسْنُ الْمَآبْ)
قەیناکا کە تۆ ئەمەت نەزانی      بزانی بە خۆت لێرە نەزانی
بەڵام ئینکارت بەس بە نەزانین      یا بە نەبینین دوورە لە زانین
کە تۆ ئینکاری ئەمری بەدیهیی      بفەرمووی، بە شێت زیاتر شەبیهی
ئەویش (بِالأَخَصّ) حەزرەتی باریی      کە زەڕڕە زەڕڕەی عالەم و کاری
عەناصیر یاخۆ جەوهەر و ئەعڕاز      (مَرْئِي)و نا(مَرْئِي) ئەی خاوەنی راز
بە دەستی قەزای ئەو دێتە وجوود      بێجگە خۆی هەمووی مەعدوم بوو مەوجود
واتە بێگومان لە عەدەمدا بوو      وجوود بە تەنیا خاصی خودا بوو
بەڵێ وجوودی لە عیلمی زاتا      بوو، ئەویش لە ژێر پەردەی سیفاتا
لەو کاتە زاتیش کەنزی مەخفیی بوو      کەسێ تر نەبوو بزانێ چی بوو
تەنیا کونهی زات وجوویی (مُطْلَقْ)      دائیرەی ئەسما و سیفاتی بەرحەق
هەبوو بەس، نەبوو کەسی تر ئەو دەم      خامۆش بوو سارای دائیرەی عەدەم
نە رووح راحەتی قووتی عیرفانیی      نە لەش مەینەتی حاڵی حەیوانیی
نە شێوەی ئەشیای (مَرْئِي) دیار بوو      نە لە نا(مَرْئِي) کەس خەبەردار بوو

بەڵام دائیرەی وجوویی (بِالذاتْ) بەس موئحەصیر بوو بە حەزرەتی زات
بۆیە دووسەر ما حاڵەتی سیفات بوون بە مەزهەری (کَمْ)و (کَیْفِیَاتْ)
سەرێکیان وجووب کە لەو جودا نین سەرێکیش ئیمکان کە عەینی ئەو نین
کە ویستی دەستی ئیرادەی زاتی دەرخا ئاساری شەئنی سیفاتی
بۆ ئیجادی کەون دەستی هێنا و برد سەرپۆشی لەسەر ئەو کەنزە لابرد
بە باری ئیمکان پەردەی ماسیوا لەسەر خەزێنەی عەدەم لابرا
جا لە ماسیوا دەرگا کراوە لە موڵکی عەدەم بەرەو ئەملاوە
قافڵەی ئەمر و[٩٧] عەناصیر لەوێ بە نەزم و تەرتیب هات و کەوتە رێ
بەڵام مەرهوونی کات و زەمانە ئەوەش مەخزوونی عیلمی یەزدانە
نابێ پاش و پێش لە عیلمی ئەودا بۆ سەرت ئەدەی بە دار و بەردا !
(لاَ یُبَدَّلُ الْقَوْلُ لَدَیْهِ) (کُلُّهُمْ مِنْهُ، بِهِ، إِلَیْهِ)
تەسلیم بە ئیمان بە پەروەردگار بێنە بە حوکمی خیلقەت و ئاسار
بێگومان هەرکەس دژ بێ بە صانیع بە جەهلی تەواو خۆی ئەکا قانیع
واتە زەرراتی عالەمی ئیمکان دەلیلە لەسەر وجوودی یەزدان
چونکە قەت ئەسەر بەبێ موئەسسیر یا نەزم و تەرتیب بەبێ مودەببیر
نەبووە و ناگونجێ بە عەقڵی سەلیم ئەگەر سەلیمی تەسلیم بە تەسلیم
ئەویش کام ئەسەر دنیا و (مَا فِیهَا) لە رۆژی ئەووڵ تا بە نینتیها
کە مەعلووم ئەمەش عەبەس نەکراوە لێپرسینەوە و حەشری بەدواوە
نەتیجەی ئەمەش عەفوە یا سزا دۆزەخە یاخۆ بەهەشتە و لیقا
لێرە بەرەو ژوور تەفصیلی کەلام با حەواڵە بێ بە عیلمی کەلام[٩٨]
چونکە زیاد لەمە حاسڵی مەبەست بە طوولی کەلام دەرئەچێ لە دەست
(قَلَّ وَدَلَّ)ت ئەگەر بێتە بیر تەصدیق ئەفەرمووی کاکی رەخنەگیر

رەخنە بۆ تەحقیق پەسەند و جوانە — حەق نەسەلماندن شێوەی نەزانە

بڕۆ بپرسە مەترسە لە عەیب — تا رزگار ئەبی لە زەلکاوی رەیب

هەر لە دوورەوە بەرد مەوەشێنە — دەلیلی دەعوات رووبەڕوو[99] بێنە

تا بە حەقیقەت ئەگەی بە ئینصاف — نەك باری لاریی و ئاژاوە و خیلاف

جا کە بۆت دەرکەوت حەقیقەت چۆنە — قەت بە دین نالێی خوڕافیی و کۆنە

چونکە ئەزانی ترازان لە دین — زۆر هەڵەی گەورەت تووش ئەکا لە ژین

هەڵەی وا کە قەت دەرچوونت نەبێ — بیری هەبوون و نەبوونت نەبێ

چونکە پیسترین هەڵەی ئەساسیی — بریتییە لەوەی خودا نەناسی

نەناسینی ئەو خۆ نەناسینە — خۆ نەناسینیش خۆی نەزانینە

نەزانیش لە دین جەزاکەی چییە — سزا و عەزابە و شتێ تر نییە

جا ئەمە لە کوێ و دوو رۆژە خۆشیی — بە لائوبالیی و بەزمی سەرخۆشیی

کە زانیت سزای گوێ نەگرتنت — ئەبێ ئا بەوە لە دوای مردنت

ئەوسا خۆت ئەڵێی واوەیلا لە خۆم — خۆم بە دەستی خۆم ئەمەم کرد بە خۆم

بەڵام گەر بە دین ئومێدەوار بی — چاوەڕێی عەفوی خودای غەففار بی

عەقیدەت وابێ تۆ عەبدی ئەوی — سەری بەندەگیی بۆ بکەی نەویی

باوەڕت ببێ بەوەی کە حەزرەت — شەفیعە بۆمان لە رۆژی دەهشەت

واتە لە قیامەت ئەوە پێشەوات — ترس و مەئیووسیی نامێنێ لەلات

کە هەر واش ئەبێ هەرکەس وەها بێ — بڕوا و[100] کردەوەی بێ جەزا نابێ

جەزاش کام جەزا بەهەشتی بەرین — چی دڵت حەزکا پێت ئەدەن یەقین

سەرەڕای ئەمەش لیقای ئیلاهیی — جەژن و سرووری (لاَ مُتَنَاهِي)

مەحفووظ لە فەنا هەتا هەتایە — نەعیمی موقیم عەطای خودایە

ئەنجا خۆت ئەڵێی بەم دینە جوانە — تۆخەی لەم بەشەی ئێمە هەمانە

خاوەن ئیمان و کردەوەی چاکە   بێ شکە لەولا کە حاڵی چاکە
چونکە فەرموودەی خودا تەواوە   خودا خۆی موژدەی بە ئێمە داوە
بەڵام بەهەشتی دنیای فەنابوو   بەشی کافرە و بەهەڵەداچوو
واتە ئەوانەی بەوان ئەنازن   ڕێبازی ئەوان بە دڵ ئەخوازن
وا گومان ئەبەن دواکەوتووی دینن   لەبەر یاسای دین بێبەش لە ژینن
ئەمەش هەر قسەی دوژمنانتە   ئەڵێن دینە هۆی بەجێمانتە
تا نیزامی دین پرشنگ وەشێن بوو   بۆ دوژمن سوپای قەڵا شکێن بوو
لە دووریش هەرگیز نەیان ئەتوانی   بڕوانن بۆ دین شەوکەت و شانی
دەس کێشن بۆ ناو ئاو و خاکمان   ببن بە دڕك و چوکڵی چاومان
بڕوانە ئێستە کە دین نەماوە   چۆن بوون بە مایەی شەڕ و ئاژاوە
تۆوی نیفاقیان لەم ناوە وەشاند   تا خۆیان بەسەر ئێمەدا سەپاند
هەنگاو بە هەنگاو قەدەم بە قەدەم   لە کورد و تورك و عەرەب و عەجەم
هاتنە نێو دڵی بڕێ خۆفرۆش   بە فێڵ کردنیان سەرخۆش و دڵخۆش
هەروەکو شەیتان بە شێوەی دزیی   لەنێو سکی مار بۆ بەهەشت خزیی
بۆ دەرکردنی ئادەم و حەوا   هەزار قەسەمی بە درۆ خوارد بە خوا
فریوی قسەی ئەویان خوارد بۆیە   ئێستاکەش زەویی جێی من و تۆیە
ئەمانەش هەروا ناپاك و پیسن   (حِزْبُ الشَّیَاطِینْ) گرۆی ئیبلیسن
بردیان بە تالان بە شێوەی گشتیی   ئەوەی پێی بڵێن یاسای سروشتیی
لە ئەخلاقی بەرز خووی پەسەند و پاك   جلوبەرگی جوان بەحورمەت و چاك
بەتایبەت جلی ئافرەتانی کورد   لە هەر ناوچەیەك کە سەیرت ئەکرد
حەیا و شەرەفیان لێ ئەتکایەوە   وەك شەونم لە گوڵ ئەچۆڕایەوە
سەربەرزییان بۆ گەل بە یاسا سازیی   ئەکرد بە مایەی فەخر و شانازیی

هەرچەند مافی گەل پێشێل کرابوو
مافی ئافرەتان لە جێی خۆی مابوو

هەموویان لەنێو قەلای شەرەفدا
ئەژیان نەك ئاوا لە گالتە و گەپدا

خۆیان بە خاوەن خزم و کەسوکار
ئەزانی و دوور بوون لە ئیشی نابار

ئێستاکە دەستیان لە دین بڕیون
بڕێکیان ئەلێی بەچکە هەتیون

وێل و بەرەلَلان لە شار و دێدا
لە جێ سەیرانگا و لێرە و لەوێدا

چی پێچەوانەی مافی ئافرەتە
ئەیکا و لە باوك و براش بێ منەتە

ئەوەش کە خاوەن مێردی بەزیوە
هەستی مرۆڤیان لەویش دزیوە

بە هەرچی هێزە بۆ یاسا شکان
پشتی غیرەتی مرۆڤیان شکان

قوڕیان کرد بەسەر گەل و نیشتمان
بەمان دای لە ئەرز دوژمن پشتمان

کەچیی بەم حالەش دلخۆشن بەمە
هاوار بە مالم بۆ گەلی هەمە

تازە من بە چی خۆش کەم دلی خۆم
مەگەر سەری خۆم هەلگرم بڕۆم

## مافی سروشتیی و راستەقینەی ئافرەت لە روانگەی ویژدانی ئینسانیی و ئاینی بەرزی ئیسلامی پیرۆزدا

دەخیل دادەی کورد چاو نەکەی لەوان
نەمامی جوانییت بەنرخە و گران

هەتکی حورمەت و رێز و کەرامەت
نەکەی، نەفرۆشی بەوان شەرافەت

خۆت نەخەیتە داو بە قسەی پڕوپووچ
بۆ تاوێ تاسەی گەمە و ماچ و مووچ

گوێدان بە دوژمن هۆی نەزانییە
قسەی دین دوژمن هیچی وا نیە

نۆشی ئەو نێشە، نەکەی! نەینۆشی
ئەگەر خاوەنی شعوور و هۆشی

هەنگوینی دەستی بە تال بزانە
سوودی تۆی ناوێ، مەبەستی زیانە

بەلام دین ئەکا بە داری دەستی
تا بتخاتە سەر هەوەس پەرستیی

دین ڕێگەی ژینت کەی تەنگ ئەکا لێت	زۆر لەوان باشتر مافت ئەدا پێت
بەلام پێت ئەڵێ با سەربەرز بی	بە حورمەت بژی و پایەبەرز بی
پێت ئەڵێ دایم بە حەیا و بە شەرم	لەشت داپۆشە بە جلی جوان و نەرم
لە خشڵ و زێوەر ئەتڵەس و حەریر	ئەنواعی زێڕ و شتی کەم نەزیر
بیکە بەبەرتا هەتا ئەتوانیت	یا بیدە لە خۆت بۆ شێوەی جوانییت
وەك پەڕی تاووس بدرەوشێیتەوە	لە تەوقی سەرت هەتا پێتەوە
چی حەرام نەبێ دین بۆ تۆی ئەوێ	دەی لەوە زیاتر چییت لە دین ئەوێ
تێفکرە یاسای دین و حورمەتی	ناز و نیعمەتی پڕ لە حیکمەتی
جلوبەرگیشت وەك خۆت ڕەنگاوە	هەروەك سروشتت بۆیە خولقاوە
بە وردیی بڕۆ بنج و بناوان	هەرچی تر بلێی ئەبێ بە تاوان
لە چی حەز بکەی تەرخانە لەبۆت	بەلام بەو مەرجەی بۆ حەلاڵی خۆت
نەك بۆ هەتیوی لات و سەرپەتیی	بولهەوەسیی بێ خولق و خیلقەتی
حەدد و سنووری نەبێ بەلاوە	سڵ نەکا لە هیچ نەچێتە دواوە
جا تۆش ئەگەر خۆت بەنرخ ئەزانی	زۆر حەیفە ئاوا رووت و عوریانی
قاچ و قولی رووت ئەگەر بلووره	لای خاوەن شەرەف بە نرخی تووره
دیمەنت ئەگەر شەڕ کا لەگەڵ مانگ	بایی پوولێکە و دوو گێزەری قانگ
لەعل و مەرجان و یاقووت و گەوهەر	قەدری نامێنێ کە زۆر کەوتە دەر
چونکە ئەوانەی دایم لە ناوان	حۆرییش بن نابن بە سورمەی چاوان
نابن بە کۆگای ئاواتی دڵان	ئەگەر ناسك بن وەك پەڕی گوڵان
بە بەژن و باڵا ئەگەر عەرعەر بن	مادام سەرپەتیی و لە کۆڵان گەڕ بن
بڕۆن بۆ سەیران لە دەشت و دەردا	کەس نەڵێ دادەم چی لە ژێر سەردا
خۆتان و خواتان بۆ هەر لا بڕۆن	لەگەڵ هەرکەسدا بخەون و بخۆن

هەر شەوێ مەزەی بەزمی سەرخۆشێ    یا لە نێو رەقس و سەمای دەنگخۆشێ
لەگەڵ نامەحرەم بەبێ کەسوکار    نەپرسن هەرگیز لە شەرم و لە عار
تا نەمە مافی رەوای ئێوە بێ    چۆن ئەبێ صەفای وەفای پێوە بێ
تۆ کە رەفیقی هەزارێ تری    بۆ هەر مەصیفێ بڕۆن حازری
دووریی لە ماڵ و لە شارەکەی خۆت    بە ناوی مافت فەرقی نەبێ بۆت
کەی جێگەی هیوان بۆ شەریکی ژین    مادام هەر رۆژێ لەلایەك بژین
سەرم سوڕماوە لە بیر و فامت    لەو شێوە قەڵبەی نزم و بێ تامت
یا تۆ کە رەنگی جوانییت لە خۆیە    ئاخر ئەو هەموو دەرمان و بۆیە
بۆ ئەدەی لە خۆت! خۆت بۆدار ئەکەی    بۆچی کوڕی خەڵك لە خۆت هار ئەکەی
بۆ شەرم و حەیای لە دەس ئەستێنی    تا بەویش حەیا لە خۆت ئەستێنی
هەستی ئینسانیی لێ دائەماڵیی    مەگەر نازانی ئەو چۆنە حاڵی
کە تۆی ئاوا دیی ئەبێتە دەهریی    تازە ناتوانی پێشی لێ بگری
ئەگەر سەریشی لەسەر دانابێ    تازە بێ سوودە نەکەی! وا نابێ
کەوابوو هەر تۆی بۆ ئەویش بەلای    ئەبی بە مایەی شکانی حەیای
ئەبی بە سەرمەشق بۆ تاوانباریی    ئەشکێنی قەلا و قەدری کڕیاری
تۆ چیتە لەسەر مۆدی فەرەنگیی    داو و دەرمان و تەنووردەی تەنگی
بۆ یاسای کوردییت ئاوا بە با دا!    کەی کوردی! کە تۆ لە یاسات لادا
تا یاسای کوردیی بووبوو بە پەرژین    هەزارێکی وەك ئەستیی و خاتوو زین
خەجێ و سیامەند، فەرهاد و شیرین    لاپەڕەی مێژوو بەوان بوو رەنگین
یا وەکو لەیلا و مەجنوونی شەیدا    کە ئێستاش وێنەن بۆ دڵی شەیدا
ئەمانە لە ژێر پەرژینی حیجاب    بە ئاگری عەشق سووتان وەك کەباب
دەنگیان لە عالەم زڕا وەکو تار    بوون بە پەروانە و شەمعی ئەشکبار

مەجلیسی عەشقی دڵی دڵداران     خەڵوەتگەی رازی نازی نازداران
بە یادی ئەوان گەرم و بەتاو بوو     بەزمی مەجنوونیی بەوان تەواو بوو
گوڵ کە پەرژینی نەبێ بەلاوە     رەنگ و بۆی ئەڕوا زوو بەدەم باوە
ئێستە یاساکەت کە وا نەماوە     چرای نازداریی ئێوەش کوژاوە
کەسێ بەنرخە چل چرای دڵە     وەك گەوهەر بە شەو چرای مەنزڵە
ئەگەر وا نەبێ ئەبێ وا نەبێ     نابێ شەریکی ئەم ژیانە بێ
چونکە زۆر عەیبە بۆ یاسا ناسان     هەڵبژاردنی یاسا نەناسان
گشت کەس بە یاسای باوك و باپیری     ئەنازێ، دادەم ئەگەر تۆ ژیری
ئەی بۆ قەت نەبوو نە زۆر و نە کەم     جارێ لە جاران عەرەب یا عەجەم
یا تورك و فەرەنگ تا ئینگلستان     بێنە سەر یاسای خەڵکی کوردستان
ئەی بۆ هەر شتێ لەوێ بوو بە باو     تۆ لێرە ئازا لەوان ئەبڕیی چاو
بۆ مەگەر تۆ خۆت کەمتر ئەزانی     خۆ ئەگەر وابێ دیارە نەزانی
بۆیە خۆت گۆڕیی وەك ئەوان تەواو     داخەکەم بۆ تۆ دادەی ناتەواو
نەتدیوە هەرچی بەنرخ و خاسە     ئەیخەنە جێگەی نهێنیی و قاسە
حەیفت کرد ئاسۆی سنوورت شکاند     پەردەی ناموسی یاساکەت دڕاند
حەیفت کرد گرتت باری نابارِیی     چوویتە سەر یاسای هەڵە و لاساریی
هەر نەبا ئەبوو وا لە خۆت نەکەی     کە فەرقی ئەوان لەگەڵ خۆت نەکەی
کەسێ نەتناسێ بەم جلانەوە     کێ ئەڵێ کوردی! بەو کەژانەوە
کە هیچت لە کورد ناچێ بە زاهیر     مەگەر نازانی کە ئەمریی ئاخیر
چی ئەکا بۆ تۆ ئەوسا سەری رووت     خۆ بە چاوی خۆت دیت سەدان مردووت
خرایە گۆڕ و سەری نایەوە     بێجگە نەدامەت چی بۆ مایەوە!
تۆش وەکو ئەوان هەر ئەوە رێتە     لەپاش ماوەیەك هەر ئەوە جێتە

حەیفە ئەندامی وەك پەڕی گوڵت      تەرمی نازارت لە نێو تۆی گڵت
لەنجە و لارەکەی باڵات وەك چنار      ببێ بە لوقمەی کرم و مشك و مار
ببێ بە نکبەت ئەم بەزمە لێرە      تا ڕۆژێ زووتر تۆبە کەی دێرە
چونکە لە کاتی سارای قیامەت      ئەدەی لە ئەژنۆت بەردی نەدامەت
سزای کردەوەی ئێرەت دێتە ڕێ      مسقاڵە زەڕڕە ون نابێ لەوێ
تۆ لێرە بۆ دین وێنەی ئاگری      وا گومان ئەبەی کە قەت نامری
ئەوانەی دەرست ئاوا دائەدەن      عەبات پێ لەسەر یاسا لا ئەدەن
یاخۆ ئەوانەی بۆ چاولێکەریی      تۆیان لە یاسای گەلت کرد بەریی
یاخۆ ئەوانەی لات دەستە خوشکن      درۆت بۆ ئەکەن، مار و دووپشکن
نەك هەر دۆستت نین یەکەم دوژمنن      ئەمانە فێری پەنا و قوژبنن
تەرازووی ژیریی و ئینسانییت بۆ کەی      تۆ کە فەرقی دۆس لە دوژمن نەکەی
تا هەر کوێ بڕۆی لە شوێن ئەمانە      تاوانە و ئەمەش بارێ گرانە
بۆ هەر گوناهێك تۆ سەبەبکاری      هەر بەو ئەندازە خۆشت بەشداری
گوناهی خەڵکیش ئەکەی بە سەربار      لە ژێر ئەو بارە چۆن ئەبی ڕزگار!
هەر مەگەر شین و فرمێسکی چاوت      عوزری تەقسیری عومری فەوتاوت
هەناسەی گەرمی سینە و دەروونت      بەربێتە خەتای لاشەی زەبوونت
شەرم و خەجاڵەت داتگرێ تەواو      خەتای چەند ساڵەت بێتەوە بەرچاو
ژەنگی تاوانت بتاوێتەوە      کۆگای قوسوورت بشارێتەوە
بەڵکو شنە بای صوبحی سەعادەت      بارانی لوتفی خودا و شەفاعەت
هەڵکا بەلاتا، لابا قەساوەت      بماڵێ تۆز و گەردی شەقاوەت
باری نابāriی داخە لە کۆڵت      تا کەی سەری ڕووت تا شان و قۆڵت
ئاخر بۆ ئەبێ ئاوا کەی لە خۆت      بۆ هەوا و هەوەس زیان دەی لە خۆت

خۆ بێجگە لەودی پێتا بڕوانن  ئەوانەی گەنج و گەوج و نەزانن
سوودت پێ نادا خۆهەڵماڵینت  ئەشبێ بە داخی دواڕۆژی ژینت
چۆن ئەبێ وابێ ئاکامی ژیرییت  بیر نەکەیتەوە لە کاتی پیرییت
کە پشتت لە ژێر باری خەتادا  ئەکۆمێتەوە و ئەچێ بەلادا
با نەچیتە گۆڕ بەم حاڵە دادە  کەم ڕەنجی خۆت و عالەم بە با دە
بۆیە مامۆستا پێت ئەڵێ دادەی  بەڵکو بە قسەکەی لەم بارە لادەی
خۆت نەدەی بەدەم بای هەوا و هەوەس  ئا لەمە زیاتر دەبا بەس بێ بەس
بە خۆ نازینت نازت ئەشکێنێ  ئەم زەوق و زەرقەت تا سەر نامێنێ
نازار ئەو کەسە نازی ڕەوا بێ  قبووڵ کراوی قاپیی خودا بێ
خولق و خووی شیرین بۆ ڕێی مورادت  لەگەڵ خواناسیی تەگا بە دادت
مامۆسا بێ شك دڵسۆزە بۆ تۆ  ڕاست پێ ئەڵێ لە قسەی دەرمەچۆ
هەرچی پێت ئەڵێ ئەمری خودایە  نەك قسەی دەمیی و بێ سوود و مایە
هەرکەس گوێ نەدا گوێچکەی پێ ئەدەن  حەواڵەی حوکمی دادگای ئەکەن
حوکمی مەحکەمەی خودات دێتە ڕێ  ڕۆژێ هەر ئەبێ مەجالت نەبێ
بۆ پەشیمانیی لەم کردەوانەت  بەفیڕۆدانی ئەم عومرە جوانەت
بە ئاهونالە و بە (وَا حَسْرَتَا)  ئەتبەن بۆ سارای سزاگای خەتا
ئەو کاتە نە داد نە هاوار نە ئاه  ناگا بە دادت بۆ عوزری گوناه
دوژمن بەناوی مافی ئافرەتان  لە ڕێی خۆشبەختیی ئەدا تەفرەتان
بۆ ئێوە[١٠١] مافی هێنا کایەوە  بە ئێوەش داوی بۆ دین نایەوە
بەم جۆرە مافە کە دژ ئەیدا پێت  ئەو ڕۆژە ڕەشەش ئەبێ بێتە ڕێت
کەی ئەوە مافە! ئەگەر تۆ ژیری  ئاخر تۆ لە کوێ و دائیرەی میریی!
بە ناز و غەمزە لەسەر کورسیی و مێز  لەگەڵ کۆمەڵێ هەتیوی مل دێز

ئەگەر بەتەمای ئەرکی نیشتمان / دابین کەی بەمە لەنێو گشتمان
یا بۆ مافی گەل لەم ڕێگە هەڵە / تێکۆشی، خۆتت خستۆتە تەڵە
مافی تۆ دیارە دادەی خۆشەویست / خوا دیاریی کرد بۆت بۆخۆت نەتەویست
جا کە تۆ نەتویست ئەمری خوداکەت / ئەبێ بیچێژی سزای خەتاکەت
تێکەڵیی ئێوە و پیاوی لا لەودڕ / وەك لرفی گایە و سەوزەلانی تەڕ
بێستانەوانیی دان بە گای چڵێس / کەیبانووی ماڵ و پشیلەی کاسەلێس!
کێ دیویە گورگ و شوانی مەڕی شەل / یاخۆ بۆ ماڵی قازیی قاز و قەل
خەزێنەداریی و پاسەوانیی دز / کێ دی ڕەفیقیی شێر و ئاسکی کز
ئەگەر تۆ ژیری و خاوەنی خێوی / ئاخر مریشك و هێلانەی ڕێویی!
سا مەگەر بڵێی بەم وەزعە فێرم / سەر و ماڵی خۆم بە دز ئەسپێرم
ئەگەرنا تۆ چی و ئەرکی وەزیفە / خۆت کەی بە لاشە و کەلاکی جیفە
هەر ساتە لاتێ، داڵەکەرخۆرێ / دەنووکت لێدا و شێوەت بگۆڕێ
دایکی نیشتمان تا ئێوەی کوڕە / هەر ڕۆژێك سکی لە دژێ پڕە
هەر نیشتمانێ ئاوا رزگار بێ / دەك بە زووخاو و بە زەهری مار بێ
حاشا لەو ژینە و لەو نیشتمانە / ئێوە سەری خەن بەو شێوە جوانە
مافی سروشتیی خۆتت دا لە دەس / خۆت و یاساکەت دا بەدەس ناکەس
سەرەڕای ئەوەش کە مافت نەچێشت / قەدری گەلیشت لە عالەم نەهێشت
هەرکەس ڕەزا بێ بەم پێشکەوتنە / لە دوژمن زیاتر بە گەل دوژمنە
بۆ ئەویش ڕۆژێ ئەبێ وەکو تۆ / بەردی نەدامەت بدا لە ئەژنۆ
ماف و یاسایەك خودا پێی داون / زۆر لێودشاوە و بەنرخ و شیاون
تێفکرە دادەم، نووکەنووك مەکە / بە دڵ تەسلیم بە، دوعا و تووك مەکە
بۆ ئەوەی ئەڵێی دەستم بڕاوە / سووك و بێ نرخم، بەشم خوراوە

با کەمێ مافت بۆ روون کەمەوە — بە کورتیی جوابی گلەت دەمەوە

لەو رۆژەی کە تۆ دێیتە دنیاوە — فەرقی کوڕ و کچ لە ژین نەخراوە

هەردووکتان وەك یەك بە یەك دایك و باب — پەروەردە ئەکرێن لەسەر یەك حیساب

تا لە خەم ئەڕزن پێ ئەگەن خۆتان — دەرودەشت ئەکەن هەر بە پێی خۆتان

ئەنجا کە تۆزێ هۆشت هاتە بەر — لەگەڵ کیژۆڵان لە ماڵ و لە دەر

زیاتر هەست ئەکەی حاڵی سروشتییت — لەگەڵ کوڕ چۆنە بە شێوەی گشتییت

مەیل و خەیاڵی دڵت بێ وچان — ئەتکێشێ بۆ لای کۆمەڵی کچان

هەر بە تەبیعەت بێ کەس پێوتن — خەریکی یاریی بەشی کچ ئەبن

ئێوە بە بووك و لانك و دەسرازە — ئەگەشێنەوە و نەشەتان سازە

بۆ یاریی کوڕان شیر و دەبانە — تۆپ و تفەنگ و تیر و کەوانە

هەروا شتی تر بەپێی لێوەشان — هەر خۆتان ئەیکەن بە ئەرکی سەرشان

کەوابوو مافت هەر بە مناڵیی — خۆت لەخۆتەوە لێت ئەبێ حاڵیی

ئەگەر خۆت لە خۆت نەگۆڕیی حاڵت — نەکەویتە شوێن فکری بەتاڵت

هەر ئەمە مانای مافی رەوایە — کە دەرچووی لەمە هەڵە و خەتایە

تا ئاوەدانیی ماڵی باوانی — ساوا و ساویلکە و خنجیلە و جوانی

بیر لە رۆژانی داهاتووی تەمەن — ناکەی بە غەیری یاریی هاو تەمەن

نازانی مەعنای گلە و نزا کەی — تا گلەی بەخت و بەشی قەزا کەی

وەرگێڕکەی ماڵی تاوێ ناتاوێ — گلێنەی چاوی، تەقالات ناوێ

تا ئێرە تەنیا تێریی و تەسەلیی — کافییە بۆ تۆ کە بێ ئەمەلی

لەپاش ماوەیەك هەست و تەجرەبە — چاو ئەکەیتەوە، کەمتەرخەم مەبە

هیچ پەلەت نەبێ، بە سەبر و تاقەت — بە پرس و بە رای باوك و براکەت

بە لێکۆڵینەت لەگەڵ دایك و خوشك — ئەوسا دڵی خۆت ئەکەی بە سەرپشك

هەروا پرسێکیش بە خزم و بە خوێش    نەبا بکەویە داوی گورگەمێش(١٠٢)
چونکە مامەڵەی حورمەت و ژینە    شەرەف لە ژینا قەڵا و پەرژینە
لەگەڵ کەسێکی بەئەسڵ و نەسەب    مەبەست دەربڕە بە شەرم و ئەدەب
جا ئەنجا کە تۆ چوویتە ماڵی خۆت    کۆڵەکەی ماڵی بۆ حەلاڵی خۆت
ئەوسا ئەزانی کە من راس ئەکەم    لەمەش باشترت لەگەڵ باس ئەکەم
بۆ کەسێ خاوەن عەقڵ و کەماڵە    ژیانی بەقیمەت ماڵ و مناڵە
لەگەڵ شەریکی چاك و داوێن پاك    بۆ هەموو ماوەی ژینت ئەو بێ تاك
بە دڵێکی رەحەت ژیان ئەبەیتە سەر    لە ماڵی خۆتا بەبێ دەردی سەر
بەبێ ئاژاوە و پرتە و بۆڵەبۆڵ    سووکە بەهانەی بێ مەعنا و شرۆڵ
نەکەی بە کارێ بە قسەی ئەم و ئەو    ئاژاوەچیی بێ بە رۆژ و بە شەو
هەر رۆژە بەزمێ هەر تاوە بارێ    یا لە ئاژاوەت غەزەب نەبارێ
چەند خۆشە کە تۆ کۆڵەکەی ماڵ بێ    دایکی بەرێزی کۆشێ مناڵ بێ
کۆرپە ساواکەت مەم خەیتە دەمی    بە میهرەبانیی و بە خاترجەمیی
تێری کەی لە شیر خەوی لێبکەوێ    لە باوەشتدا کوڵی بسرەوێ
بە لایی لایە و بە لاوانەوە    بیخەیتە لانك بۆ پێچانەوە
جا بە سەرین و بە پەڕۆی تازە    توند کەی لە بالای کێشی دەسرازە
بەلام نەك ئەوەند وەك بیدەی لە دار    یا ئەوەند شل بێ داکەوێتە خوار
سەبر رایژێنی با مەست بێ لە خەو    هەروا بەم حاڵە تا پێ ئەگا ئەو
خۆ ئەگەر جارجار ماچ و بۆنی کەی    تەمی خەمی ژین لە دڵ لا ئەبەی
چونکە بۆنی ئەو بە رەحم و بە دڵ    سەد قاتە لەگەڵ بۆنی عەتر و گوڵ
سەرلانکەی تەنك پێویستە بوونی    بۆ هەوای تازە و نەفەس دەرچوونی
ئاوایە مانای دڵ و دڵداریی    یا مێشی دوژمن نەدەن ئازاری

ئەنجا ئەوانەی تۆزێ هەراشن
خاوەنی هەست و خولق و خووی باشن

هۆشت پێوەبن کوڵان گەڕ نەبن
با فێری جوێن و لاتیی و شەڕ نەبن

تا لە خەم ئەرزن خۆیان پێ ئەگەن
لە ژیانی فەردیی و کۆمەڵ تێ ئەگەن

ئەزانن مەعنای خراپە و چاکە
خۆ ئەپارێزن لەوەی ناپاکە

ئەنجا ماڵ و حاڵ ئەنێن پێکەوە
تۆش دڵت بۆیان ئەحەسێتەوە:

جا لەگەڵ ئەمەش رەفیقی خەمت
شەریکی ژین و ماف و بەرهەمت

کە تۆی ئاوا دی وەك شا بێ خەمە
هەر تاج و تەختی شایەتیی کەمە

خۆی بە خاوەنی دنیا ئەزانێ
هەوڵ ئەدا بۆتان هەتا ئەتوانێ

کە تۆی ئاوا دی دڵ و داوێن پاك
نە ماندوو ئەبێ نە خەستە و هیلاك

تەقالا ئەدا بە گیان و بە دڵ
مەمنوونیش ئەبێ پڕ بە پێستی دڵ

ئەوەی تۆ بڵێی ئەڵێ بەسەرچاو
خزمەتکارێکە لە ژێر ناوی پیاو

زەحمەت ئەکێشێ لێرە یا لەوێ
سەربەرزیی و خۆشیی بەس بۆ تۆ ئەوێ

تا تۆ ئەوت بێ هیچ خەمت نیە
ئیتر تەقالای ژینت بۆچییە

بەسیە بیر کەوە لە شێوەی گشتییت
لە دیمەنی خۆت، مافی سروشتییت

ئەگەر هەستت بێ ئەزانی بە خۆت
ئاوایە مەعنای ژینی سەربەخۆت

ئاوایە مەعنای خزمەتت بە گەل
بە نیشتمانت بە کوێر و بە شەل

کە تۆ نەمامی لاوت پێگەیاند
وابزانە پشتی دوژمنت شکاند

باشترین ئەرکت گرتۆتە ئەستۆ
بۆ بەهێزبوونی ژینی سەربەخۆ

هەرکەس شتێ تر دابنێ لەبۆت
بەناوی ماف و ژینی سەربەخۆت

بێگومان دژە، ئەتبا بە هەڵە
مەبەستی لە ماف ژینی تێکەڵە

بۆ هەوا و هەوەس ئیشی بە تۆیە
مافی گەل ئاوا کەی ئەرکی تۆیە

ئەرك و مافی گەل هەر بۆ کوڕ ئەبێ
بۆ رۆڵەی نەبەز دوژمن دڕ ئەبێ

بۆ کەسێك ئەبێ قەڵا شکێن بێ     لەکاتی پێویست زەربە وەشێن بێ
شەوی بەلاوە کاتی ئەهار بێ     زستانی لەلا فەسڵی بەهار بێ
لە زۆریی سوپای دوژمن نەترسێ     لە خشپەی مار و مێروو نەپرسێ
فەرقی نەبێ بۆی دۆشەك و سەرین     لەگەڵ دار و بەرد بە کۆڵێ برین
سڵ لە لوولەی تۆپ یا تەقەی تفەنگ     نەکا، بەر نەدا ورەی کاتی جەنگ
بە غیرەت قەڵا، بە دیەن بەشەر     کاتێ هوجوومی دژی هاتە سەر
شێرێك بێ لەنێو سەنگەری خەبات     بڵێن راپەڕی، نەك بڵێن هەڵات
پشت نەکا لە دژ، نەڵێ رائەکەم     خۆم بۆ بەکوژ دەم یا بۆ وا ئەکەم
گەورەتر چەکی ئەبێ باوەڕ بێ     با لە هەموو لای ئاگری شەڕ بێ
ئەبێ بە مافی رەوای بزانێ     لە پێناوی گەل سەری خۆی دانێ
خوێنی خۆی بۆ گەل بە ئاو بزانێ     بڕژێ بێ خەم بێ، ئەنجا ئەتوانێ
بڵێ من کوڕم بۆ نیشتمانم     ئەرکی ئەنێمە سەر سەر و شانم
جا نیشتمانی کز و خەمبارم     رووی ئەبێ بڵێ منیش کوڕدارم
ئەرکی نیشتمان وا نەبێ نابێ     ئێمە ببینین لە دژ رەها بێ
کەی ئەمە ئەرکی ئێوەی بەرێزە     سروشتی ئێوە و ئەم جۆرە هێزە
ئاخر چۆن ئەبێ عەتر و خەت و خاڵ     باڵای حەریرپۆش، زولف و قژی کاڵ
بێتە مەیدان و بڵێ منیش هەم     چەك و چەکداری دوژمن ئەکەم جەم
ئەم ئیشە ئیشی کوڕی بەجەرگە     بەبێ ترس و لەرز ئامادەی مەرگە
واتە مەیدانی جەنگ و ئاژاوە     بەپێی سروشتت بە تۆ نەدراوە
کوڕ بەرخی نێرە بۆ سەربڕینە     مان و نەمانی سەربەرزیی ژینە
ئەگەر ما بۆ گەل هەوڵ ئەدا بە گیان     ئەگرێتە ئەستۆ ئەرکی نیشتمان
پێویستی بە تۆ نابێ بۆ خەبات     لەجیاتی ئێوەش خوێن ئەکا خەڵات

